د. عەباسی مەنوچێهری

# ماکس ڤێبەرو پرسیاری مۆدێرنێتە


ماکس ڤێبەر

لە فارسییەوە: پێشڕەو حسێن

ماکسە ڤێبەر، لە سەردەمی ژیانیەوە تا ئێستا، هەمیشە وەکو کەسایەتیەکی کۆمەڵناس ناسراوە. لە مێژووی ئەوروپادا، قۆناغێك بەناوی *Fin de Sicle* یاخود بەناوی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە بەناوبانگە. ئەو قۆناغە، لە مێژووی ئەوروپادا، سەردەمێکی زۆر گرنگ و حەساسەو ئەمەش لەبەر ئەو ڕوداوانەیە کە لەو دەمەدا، ڕویان داوە، بۆ نمونە سەرهەڵدانی زەمینەکانی جەنگی جیهانی یەکەم و شەڕەکانی ناوخۆی ئەوروپاو بارودۆخی ناوخۆی ئەوروپا، پاش شۆڕشی فەرەنسا. ئەو قۆناغە لە ڕوی ڕۆشنبیریشەوە گەلێك تایبەتمەندیەتی هەیە، لەوانەش بیرکردنەوەی مارکسیستیو کاریگەریە سیاسیەکانی، یاخود دەرکەوتنی گەلێك بیرمەندی وەکو؛ نیچەو فرۆیدو ڤێبەر لە ساڵەکانی *1875* تا *1900* لەم میانەیەشدا، بە لەبەرچاوگرتنی


نیچە

ئەو باسانەی کە حاڵی حازر لە پانتایی ئەندێشەدا قسەیان لەسەر دەکرێ، جارێکی تر گرنگی ئەو قۆناغە خۆی دەنوێنێ.

لە میانەی ئەو گوتارانەی لە چوارچێوەی چەمکی پۆست مۆدێرنیزمدا دەخولێنەوە، نیچەو هایدگەرو فرۆیدو زیمبڵ بە رێژەیەك و دورکهایم بە تەنها بە رێژەیەك گرنگیان هەیە. مارکس بە بەراوردکردنی لەگەڵ ڤێبەرو نیچە، لە ئێستادا، لە چوارچێوەی باسە پۆست مۆدێرنیزمیەکاندا، پێگەیەکی ئەوتۆی نیە. کەواتە، ئەم سەردەمە هاوتای سەردەمی رۆشنگەری دەوەستێ کە لەوێدا بنەڕەتەکانی مۆدێرنێتە، وێنەیان کرا. فرۆید تەوەرەیی بوونی ئەقڵی خستە ژێر پرسیارو نیچە گومانی لە سەرجەم باوەڕەکان کرد. کەواتە، ئەم سەردەمە، سەردەمی گومان و ڕەتکردنەوەی تەوەرەیی بوونی ئەقڵ و ڕەنگدانەوە، گەشبینیو بەهیوابوونە بەداهاتوو. ڤێبەر بە هۆی گەلێك بابەتی وەکو کۆمەڵناسی شیکارییو باسی ڕەوشتی پرۆتستان و گیانی سەرمایەدارییو جۆری بێخەوش و وتەی "قەفەسی ئاسنین" و باسی ئەقڵانیەت و باسی کاریزماو لە نێوەندی هزردا دەناسرێنەوە.

لێرەدا دوو بابەتی سەرەکی کە جەختی لەسەر دەکرێتەوە؛ یەکێکیان ڕەخنەی مۆدێرنێتەیەو ئەوی تریان دووبارە تەرحکردنی باسی ئەخلاق لە بابەتە کۆمەڵایەتیەکاندایە بە لایەن ڤێبەرەوە. هەر لەم میانەیەشدا بە هۆی پەرەسەندنی زانستی کۆمەڵایەتیو مرۆیی لە سەردەمی مۆدێرندا، بە تەواوەتی ئەخلاق و بنەڕەتە ئەخلاقیەکان لە مەیدانی باس و گفتوگۆ- چونەدەر. تەنانەت هەندێ جار ئاماژە بە ڤێبەر دەکرێت کە دەڵێت؛ بە هیچ جۆرێك نابێ دادوەریی لە بەهاکاندا بکرێت و نابێ لە لێکۆڵینەوەکان و دەرئەنجامی لێکدانەوەکاندا، دادوەریە ئەخلاقیەکانی خۆمان بسەپێنین، بەڵام پێویستە هاوکاری لە هەڵبژاردنی بابەتەکاندا دەغدەغەی ئەخلاقی و بایەخدارانەمان هەبێ. لە ئێستادا باسە ئەخلاقیەکان جگە ڤێبەر لەگەڵ گادامێرو بە تایبەتی هابرماس هاتۆتە نێو باسە زانستیە کۆمەڵایەتیەکان. لە باسەکانی فۆکۆدا پەیوەندی زانستی کۆمەڵایەتی لەگەڵ هێزو ئاوێتەبوونی ئەو دوو چەمکەو بەتاڵ بوونی پێگەی بەهاکان زۆر جدیتر تەرح دەکرێت.

ڕەخنەی فۆکۆ لەسەر زانستی کۆمەڵایەتی، ئەوەیە کە هەمیشە ئەو چەمکە دابین کەری بەرژەوەندیەکان یاخود لە ڕاستیدا پەروەردەکەری جۆرێك هێز بوەو هەم لە خزمەتی هێزدا بوەو هەم سودی لێ وەرگرتوە. بەهەرحاڵ دووبارە قسەکردن لەسەر


هایدگەر

باسە ئەخلاقیەكان لە چوارچێوەی زانستی كۆمەڵایەتیدا زۆر گرنگەو ڤێبەر لەمەڕ ئەخلاق گەلێك دەغدەغەی جدی هەبووە، بەڵام بە شێوەیەكی گشتی، قسەكردن لەسەر بۆچونەكانی ڤێبەر بەبێ تێگەیشتن لە شێوازی بیریاریی ئەو، قسەكردنێكی جیدی نابێت. بە داخەوە كە لەم بارەیەوە بەدحاڵی بوونێكی لە شێوازی گوزارشت كردن لەو بابەتە لە ئارادایە. شێوازی بیریاریی ڤێبەر لەم سەردەمەدا بەناوی هێرمۆنۆتیكەوە ناسراوە. ئەو یەكێكە لەو كەسانەی باسە هێرمۆنتیكیەكان دەئاخنێتە نێو باسە كۆمەڵایەتیەكان و وەكو دیلتای باسی تێگەیشتن ئاوێتەی باسەكانی زانستی كۆمەڵایەتی دەكات. لە ڕوانگەی ڤێبەرەوە بابەتی سەرەكی لە چوارچێوەی زانستی كۆمەڵایەتیدا، پەیوەندیە كۆمەڵایەتیەكانە. هاوكات لەگەڵ ئەمەشدا خاڵی دەستپێكردن، كرداری تاكە كەسە، هەر لەبەر ئەمەش دەڵێت، ڤێبەر تاكگەرایە، بەڵام بەم مانایە ڤیبەر تاكگەرا نیە بەڵكو تاكگەرایێكی شێوازیە. بەو مانایەی كە دەڵێت؛ خاڵی دەستپێك، تاك و ڕەفتارەكانی تاكە. لەبەرئەوەی ئەگەری تێگەیشتن لەگەلێك دیاردەی وەكو شۆڕش یاخود پێكهێنان یاخود گۆڕینی دەوڵەتەكان، ئابوریو ڕۆشنبیریو هەروەها تێگەیشتن لە شوناس و فۆرمی دیاردە كۆمەڵایەتیەكان و هۆی گۆڕانكارییو بەردەوامی گۆڕانكاریەكان، بە حاڵی بوون لە كرداری تاكەكەس، دەستەبەر دەبێت.

كەواتە، ڤێبەر ڕەسەنیەتی نابەخشێتە تاك، بەڵكو لەگەڵ تاكدا، دەستپێدەكات، دەست پێكردنەكەش هاوتای مانایەكی زەینیە بۆ كەسی بزواو. ڤێبەر لەو باوەڕەدایە، هەر كردارێك كە لە لایەن مرۆڤەكانەوە ئەنجام دەدرێت و ڕەفتارەكە پەیوەندی بە تاكی بەرامبەرەوە هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ مانای زەینی تاكی بزواو. دەتوانین لەم میانەیدا لە باتی مانا– ئامانج یاخود نیەت بەكاربهێنین. خودی ڤێبەر لە باتی وشەی مانا– سود لە وشەی "*Sinn*"ی ئەڵمانی و "*meaning*" و مانا–ی فارسی، وەردەگرێت. ئەو كەسەی كردارێك ئەنجام دەدات، پێشوەخت لە زەیندا مانایەك خوڵقاوە. بەڵام لە ڕوانگەی پۆزەتیڤیستیەوە دەبێ كرداریی دەرەكی– لەبەرچاو بگرێت. یاخود لە ڕوانگەی ماركسیستیەوە هەر بابەتەو (تەنانەت جەنگ و شۆڕش و ئابوریو دەوڵەت) لە كۆتاییدا دەگەڕێتەوە سەر ویستگەی چینایەتی ئەنجامدەرانی. هەر بەو جۆرەی كە لە ڕوانگەی ماركسەوە هەموو بابەتێك دەگەڕێتەوە سەر ویستگەی چینایەتی، لە ڕوانگەی ڤێبەریشەوە دەگەڕێتەوە بۆ مانای زەینی ئەنجامدەران.

مەبەستی ڤێبەر لە "جۆری نایاب" ئەوەیە کە دەتوانین سەرجەم جۆرەکانی بۆرۆکراسی نێو پانتایی مێژوو و نێو کۆمەڵگا جیاوازەکان، لە یەك ساتدا بە یەك جۆر بینین

گەر لە چوارچێوەی ناسینی بابەتە کۆمەڵایەتیەکاندا، سەرنجی سەرەکی لەسەر مانای زەینی کەسی ئەنجامدەرە، کەواتە یەکەم گرفت کە ڕوبەڕومان دەبێتەوە ئەوەیە کە بە چ شێوەیەك لە مانای زەینی تێبگەیت؟ لێرەدایە کە ڤێبەر سود لە وتەی "جۆری نایاب" وەردەگرێ. دەتوانین سەرجەم ڕەفتارەکانی درێژایی مێژوو، هەروەها ڕەفتارەکانی سەرجەم جیهان بەسەر چوار جۆردا دابەش بکەین، بەو مانایەی، دابەش دەکرێت بەسەر چوار جۆر مانای زەینی کە لە هەڵس و کەوتی تاکەکاندا ڕەنگ بداتەوە. مەبەستی ڤێبەر لە "جۆری نایاب" ئەوەیە کە دەتوانین سەرجەم جۆرەکانی بۆرۆکراسی نێو پانتایی مێژوو و نێو کۆمەڵگا جیاوازەکان، لە یەك ساتدا بە یەك جۆر بینین یاخود هەرکام لەو جۆرانەی بۆرۆکراسی لە قۆناغی خۆیدا، تایبەتمەندیەتی خۆی هەیە بەڵام دواجار قسەکردن لەسەر بۆرۆکراسی، تایبەتمەندیەکی هاوبەشەو بە پێی قۆناغەکان ناگۆڕێت؛ ئەمەش هەمان جۆری نایاب-ە. یان بە مانایەکی تر، کەسی لێکۆڵەرەوە جۆری ئینتزاعی بۆرۆکراسی لە زەینی خۆیدا دەخولقێنێ، دواجار ئەو جۆرە دەکاتە بنەڕەتی خوێندنەوەکانی خۆی بۆ ئەوەی درك بە جۆری پێکهاتەی جیاوازی برۆکراتیك بکات. کەواتە، جۆرەکانی بۆرۆکراسیو ڕاستە بینراوەکان، گەلێك ڕەهەندی جۆری نایابی ئەو چەمکەیان لەخۆ گرتوە. بۆ نمونە؛ ڕەفتاری ئەقڵانی کە یەکێکە لەو چوار ڕەفتارەی پێشتر باسمان کرد بۆ خۆی لە چەند بەش و جۆری تر پێکهاتووە، یەکێك لەو جۆرانەش ڕەفتاری ئەقڵانی بایەخدارەو جۆرەکەی تریشی ڕەفتاریی ئەقڵانی مەبەستدارە.

ڤێبەر بۆ درك کردن بە دیاردەکان، لە باسی مانای زەینیەوە دەپەڕێتەوە بۆ سەر باسی جۆری نایاب. کەواتە بنەڕەتی، مانای زەینیو شێوازی کەڵك وەرگرتن لەو جۆرانە، نایابە. لەم میانەیەدا، ڤێبەر لەسەر بنەڕەتی مانای زەینی چوارجۆر ڕەفتار دەست نیشان دەکات و لەو باوەڕەدایە کە تاکەکان دەتوانن لە هەل و مەرجی جیاوازدا یەکێك لەو جۆرانە، بەرجەستە بکەن. کەواتە، جۆرێك ڕەفتار، ئەقڵانی مەبەستدارە، بە واتایەکی تر، ئەو جۆرە ئەقڵانیەتەی کە تاك بە لەبەرچاوگرتنی ئامانجێکی دیاریکراو سود لە هۆکارەکانی گەیشتن بەو ئامانجە وەردەگرێت. لەم میانەیەشدا گوێ بە هیچ شتێکی تر نادات، چاك و خراپ ناکات، خێرو شەڕ لەبەر چاو ناکرێت و بە تەنها ئەوەی لەبەرچاوە، کە مەبەست و ئامانجەکە چیە؟ و باشترین هۆکار بۆ گەیشتن بەو مەبەستە چیە؟ ڤێبەر ئەمە بە ئەقڵانیەتی مەبەستدار ناودەنێت.

یـه‌کێك لــه‌ ڕوخســاره‌ ســه‌ره‌کیه‌کانی جیــاوازی ڤێبــه‌ر لــه‌ زۆربــه‌ی بیرمــه‌ندانی کۆمه‌ڵایـه‌تی، ئه‌وه‌یـه؛ که‌ ڤێبـه‌ر به‌هاو ئه‌خلاقیـه‌تی به‌ هاوتـای یـه‌ك نـازانێت، بـه‌ڵکو ئاماژه‌ به‌ جۆرێك ئه‌قڵانیه‌تی به‌هادار ده‌کات، و زۆربه‌ی ڕه‌فتاره‌کانی مرۆڤ به‌ ڕه‌فتاری به‌هادار له‌ قه‌ڵـه‌م ده‌دات. بۆ نمونـه‌، گیـانی بـه‌خت کردن، لـه‌ خـۆ بردوویـی، عیشـق، خوداپه‌رسـتی، و هه‌ڵبـژاردنـه‌ بـه‌هاداره‌کان. هـه‌ر له‌بـه‌ر ئه‌مـه‌ش، هـه‌ندێ کـه‌س لـه‌و باوه‌ڕه‌دان که‌ ڤێبه‌ر که‌سێکی بوونگه‌رایه‌ (ئه‌گزیز تانسیالیست). بۆ نمونـه‌ بـه‌ باوه‌ڕی ڤێبه‌ر، ڕه‌فتاری مرۆڤ، شۆڕشێکی نائه‌قڵانی نیه‌، به‌ڵکو جۆرێك ئه‌قڵانیـه‌تی بـه‌هاداره‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی هه‌ڵبژاردنه‌و گه‌ر هـه‌ڵبژاردن له‌ ڕووی ئاگاییـه‌وه‌ ئـه‌نجام درابێـت، ئـه‌وکات ئه‌قڵانیـه‌ت نـاتوانێت ئه‌قڵانیـه‌تێکی بـه‌هادار بێـت و ئه‌قڵانیـه‌تێکی ســونه‌تیش نیــه‌. له‌به‌رئه‌وه‌ی به‌ ته‌نها له‌به‌ر داب و نه‌ریته‌کان نیه‌ که‌ تاکێك ده‌بێته‌ تاکێکی شۆڕشگێڕ. جـۆری سـێهه‌می ڕه‌فتـار، ڕه‌فتـاری سـونه‌تیه‌، مانـای، تـاك له‌سـه‌ر بنـه‌ڕه‌تی داب و نه‌ریتـه‌کان، فێرده‌بێت و له‌سـه‌ر هـه‌مان بنـه‌ڕه‌ت کارده‌کـات. ئـه‌و ڕه‌فتارانـه‌ش هـه‌مان عاده‌ته‌ ڕۆژانه‌کانی تاك و ئه‌و کارانه‌یه‌ که‌ لـه‌ کۆمه‌ڵگایـه‌کدا، هـه‌موان، له‌سـه‌ر بنـه‌ڕه‌تی داب و نه‌ریته‌کان، فێری ئه‌نجامدانی ده‌بن و چاوه‌ڕوانی ئه‌وه‌ له‌یه‌کتر ده‌که‌ن که‌ به‌ پێی ئه‌و بنه‌ڕه‌تانه‌ ڕه‌فتار بکه‌ن، به‌ڵام ڕه‌فتاری سۆزدارانه‌، ئه‌و ڕه‌فتاره‌یه‌ که‌ له‌ بنه‌ڕه‌تدا له‌ سۆزداریی مرۆڤه‌وه‌ سه‌رچاوه‌ ده‌گرێت.

له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا، ده‌شتنیشـانکردنی مانـای زه‌ینـی زۆر ئاسـته‌مه‌. بـۆ نمونـه‌؛ بـه‌ باوه‌ڕی ڤێبه‌ر، ئه‌و ڕابه‌ره‌ که‌ له‌ لایه‌ن خه‌ڵکه‌وه‌ قبوڵ ده‌کرێت و په‌یڕه‌وییان لێده‌کرێ، لـه‌ په‌یامبه‌رانـه‌وه‌ تـا ڕابـه‌ره‌ سیاسـیه‌کان، هـه‌موویان ده‌چنـه‌ چوارچێـوه‌ی چـه‌مکی-کاریزما-وه‌، به‌ باوه‌ڕی ئه‌و، په‌یڕه‌وی کردن له‌ ڕابه‌ری کاریزما، ده‌توانێت لـه‌ سنوری نێوان ئه‌قڵانیه‌تی سۆزداریی‌و به‌هادارانه‌دا، خۆی ببینێته‌وه‌ یاخود به‌ ته‌نها سۆزدارانه‌ یا به‌ ته‌نها به‌هادار نه‌بێت.

قسه‌کردن له‌سه‌ر مۆدێرنێتـه‌، به‌ شێوه‌یه‌کی دیـاریکراو، ده‌گه‌ڕێتـه‌وه‌ سـه‌ر پێگـه‌ی ڤێبه‌ر ده‌رباره‌ی مۆدێرنێته‌و درك کردن به‌ پێگه‌ی ڤێبه‌ر له‌مه‌ڕ مۆدێرنێته‌، ده‌گه‌ڕێتـه‌وه‌ ســه‌ر باســی پــه‌یوه‌ندی نێــوان پرۆتســتانتیزم و ســه‌رمایه‌داریی، بــه‌ڵام ڤێبــه‌ر بــه‌ پێچه‌وانه‌ی مارکس؛ که‌ گۆڕانکاریـه‌کانی ئاسـتی هۆکاره‌کانی به‌رهه‌مهێنانی به‌ هـۆی سه‌ره‌کی گۆڕانکاریی پێکهاته‌ی کۆمه‌ڵایه‌تی ده‌زانی، له‌و باوه‌ڕه‌دا بوو که‌ گۆڕانکـاریی له‌ مانای زه‌ینیدا، ده‌بێتـه‌ هـۆی گۆڕانکـاریی. هـه‌ر لـه‌م باره‌یـه‌وه‌ ده‌توانین ئامـاژه‌ بـه‌وه‌ بکه‌ین، ڤێبه‌ر، ڕه‌فتـاری کۆمه‌ڵایـه‌تی‌و ڕه‌فتاری کۆمـه‌ڵ به‌ جیـاواز ده‌زانـێ. بـۆ نمونـه‌؛

به‌ باوه‌ڕی ڤێبه‌ر، ڕه‌فتاری مرۆڤ، شۆڕشێکی نائه‌قڵانی نیه‌، به‌ڵکو جۆرێك ئه‌قڵانیه‌تی به‌هاداره‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی هه‌ڵبژاردنه‌و گه‌ر هه‌ڵبژاردن له‌ ڕووی ئاگاییه‌وه‌ ئه‌نجام درابێت، ئه‌وکات ئه‌قڵانیه‌ت ناتوانێت ئه‌قڵانیه‌تێکی به‌هادار بێت و ئه‌قڵانیه‌تێکی سونه‌تیش نیه‌

بە باوەڕی لۆتەر هەر لە بنەڕەتدا مرۆڤ بونەوەرێکی پاکەو بێگەردەو پێویستی بە ئامرازی پەیوەندی نیەو خۆی بە تەنها دەتوانێت بەبێ واسیتەی کەس، لەگەڵ خودا، پەیوەندی گرێ بدات و پێویستی بە کەنیسەو قەشە نیە

کاتێك باران دەبارێ، هەموان لەسەر شەقامەکان چەترەکانیان دەکەنەوە، ئەمە ڕەفتارێکی بە کۆمەڵە، واتای، تاکەکان بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندیەکیان بە یەکەوە هەبێت، ڕەفتارێکی هاوشێوە ئەنجام دەدەن، بەلاّم تەوەرەی باسەکانی ڤێبەر، ڕەفتاری کۆمەلاّیەتیە. ڕەفتاری کۆمەلاّیەتی، ئەو جۆرە ڕەفتارەیە کە هەر کەسەو لە مانای زەینی خۆیدا، مانایەکی زەینی تریش لەبەرچاو بگرێت، ئەوکات پەیوەندیەکی کۆمەلاّیەتی بنیات نراوە. کەواتە لێرەدا دەتوانین بڵێن؛ ڕەفتارێکی کۆمەلاّیەتی، پاش خۆی، بزاڤێکی کۆمەلاّیەتی دەخولقێنێ. وەکو کێشەی ئەخلاقی پرۆتستان و ڕۆحیەتی سەرمایەداری. کەواتە سەرچاوەی ئەم ڕەفتارە بریتیە لەوەی؛ تاکەکان بە شێوەیەك تێدەگەن و ڕەفتار دەکەن کە هاوکات لەگەڵ تێگەیشتنی ئەوی تردا، مانای زەینی ئەو، لە زەینی خۆیاندا، لەبەرچاو بگرن. کەواتە چیتر گرنگی بە ڕەفتاری تاکەکەس نادرێت؛ هاوکات خاڵی سەرەکی کارکردنی ڤێبەر، پەیوەندیە کۆمەلاّیەتیەکانەو خاڵی دەستپێکردنی ئەو کارەش ڕەفتاری تاکەکەسە. کەواتە لێرەدا، ڤێبەر بە مانا کۆمەڵناسیەکەی، تاك لەبەرچاو ناگرێت و گرنگی پێنادات. یان بە مانایەکی تر، کاتێك تاکەکەس لەگەڵ کەسێکی تردا پەیوەندی دروست دەکات، چیتر ڕەفتارەکەی، ڕەفتاری تاکەکەسی نیە، بۆچی؟ لەبەرئەوەی لەو چوارچێوەیەدا، تەنها نیە. ئەو کاتەی کارێك ئەنجام دەدات، دابڕاوو جیا نیە لە ئەوانی تر، بەڵکو ئەوانی تریشی لەبەرچاو گرتوە. هەر ئەوەندەی مانایەکی جیاوازی زەینی لەبەرچاو بگرێت، لە خۆیدا پەیوەندی دروست دەبێو گەر کۆمەڵە کەسێکی تریش هەمان کارئەنجام بدەن، ڕەفتارێکی کۆمەلاّیەتی دروست دەبێ.

باسی ئەخلاقی پرۆتستان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم مانا زەینیە. ئەوەی لەو میانەیەدا خاڵی سەرەکیە ئەوەیە، لۆتەر بیروبۆچونێکی جیاوازی لەمەڕ بنەڕەتەکانی ئاینی مەسیحی (بە پێی ئەو ئاینە، پەیوەندی مرۆڤ و خوداوەند بە هۆی کەنیسەو قەشەوە دەستەبەر دەکرێت) ڕاگەیاند. بە باوەڕی لۆتەر هەر لە بنەڕەتدا مرۆڤ بونەوەرێکی پاکەو بێگەردەو پێویستی بە ئامرازی پەیوەندی نیەو خۆی بە تەنها دەتوانێت بەبێ واسیتەی کەس، لەگەڵ خودا، پەیوەندی گرێ بدات و پێویستی بە کەنیسەو قەشە نیە، هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو بۆچونە گۆشەگیری کەشیەلەتی و پێکهاتەی کەنیسەی بەجێهێشت. پاش ئەو ڕەفتارە، بزاڤێکی ڕۆشنبیریو هزری کە پەیوەندی بە هەمان باسی مانای زەینیەوە هەیە ڕوی دا. یان بە واتایەکی تر، ژمارەیەك کەس بوونە پەیڕەوی ئەو باوەڕەو لە ئەنجامدا بزاڤێکی پرۆتستانتیزمی پەیدابوو.

كه‌لڤێن، ڕابه‌رێكی پڕۆتستانیه‌، حه‌ره‌كه‌تێكی تازه‌ی ده‌ستپێكرد كه‌ به‌ باوه‌ڕی ڤێبه‌ر ئه‌و جوڵانه‌وه‌یه‌ بنه‌ڕه‌تی‌ترین باسی نێو مێژووی ئه‌وروپاو نێو باسی مۆدێرنێته‌یه‌. له‌ ئاینی كاسۆلیكیدا، تاكه‌ چانسی مرۆڤ بۆ ڕزگاربوون، كرداری چاكه‌ بوو. به‌ڵام كه‌لڤێن له‌و باوه‌ڕه‌دا بوو كه‌ پێشتر چاره‌نوسی سه‌رجه‌م مرۆڤه‌كان ده‌ستنیشان كراوه‌. سه‌رجه‌م ئه‌و كه‌سانه‌ی بڕیاره‌ بكه‌ونه‌ به‌ر به‌زه‌یی خودا، پێشتر ده‌ستنیشان كراون. كه‌واته‌، چیتر، كرداری چاك و خراپ كاریگه‌ریان نیه‌، له‌به‌رئه‌وه‌ی پێش وه‌خت هه‌ڵبژێردراوه‌كانی خودا، ده‌ستنیشان كراون. هه‌ر ئه‌م باوه‌ڕه‌، بوه‌ هۆی نیگه‌رانی له‌نێو زۆربه‌ی پڕۆتستانه‌كان كه‌ ئایا هه‌ڵبژێردراوه‌كانی خودا، چ كه‌سانێكن؟

باسی سه‌ره‌كی ڤێبه‌ر ئه‌مه‌یه‌و له‌ ڕاستیدا سه‌رجه‌م باسه‌كه‌ی له‌سه‌ر مۆدێرنێته‌، لێره‌وه‌ ده‌ستپێده‌كات. كه‌لڤێن باس له‌ چاره‌نووسی خوداوه‌ندی ده‌كات و ئاماژه‌ به‌وه‌ ده‌كات كه‌ سه‌ركه‌وتنی مرۆڤ له‌م جیهانه‌دا په‌یوه‌ندی به‌ هه‌ڵبژاردنی مرۆڤه‌وه‌ هه‌یه‌ له‌ لایه‌ن خوداوه‌. ئه‌م هه‌ڵبژاردنه‌ كه‌م ڕوی ژیان ده‌گرێته‌وه‌؟ ڕوی ئابوری، مانای، هه‌ركه‌س له‌ ژیانی ئابوریدا سه‌ركه‌وتوتر بێ، ئاماژه‌ی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ پێش وه‌خت كه‌وتۆته‌ به‌ر به‌زه‌یی خودا، به‌ڵام كه‌لڤێن ده‌یوت؛ ئه‌مه‌ به‌و مانایه‌ نیه‌ كه‌ هه‌ر كه‌س چۆن بیه‌وێت بۆ تێركردنی ویسته‌ تاكه‌ كه‌سیه‌كانی خۆی سود له‌ ئه‌نجامی چالاكیه‌ ئابوریه‌كانی وه‌ربگرێت، به‌ڵكو ده‌بێ له‌مه‌ڕ پێشكه‌وتنی زیاترو دوباره‌ سودوه‌رگرتن له‌ به‌هره‌ مادیه‌كان، هه‌وڵ بدات. كه‌واته‌، زوهد ئاوێته‌ی به‌رهه‌مهێنانی ئابوری ده‌بێت.

په‌ره‌پێدانی چالاكیه‌ ئابوریه‌كان به‌ هۆی كه‌لڤێنتیه‌كانه‌وه‌، له‌ مێژووی ئه‌وروپادا، باسێكی جیدیه‌. مانای، له‌و شوێنانه‌ی كه‌لڤێنیزم گه‌شه‌ی كرد، به‌ هه‌مان شێوه‌، چالاكیه‌ ئابوریه‌كانیش په‌ره‌ی سه‌ند، كه‌واته‌، به‌ باوه‌ڕی ڤێبه‌ر، له‌ مێژووی ئه‌وروپادا، هێدی هێدی ڕێك و پێكی ئاوێته‌ی زوهدگه‌رایی ده‌بێت و ژیانی ته‌واو كۆنترۆڵ كراویش ئاوێته‌ی به‌رژه‌وه‌ندی و زیان و زوهدیش ئاوێته‌ی چاره‌نوسی خوداوه‌ندی ده‌بێ. ئه‌مه‌ش مانای ئه‌وه‌یه‌، ڕوداوه‌كانی چوارچێوه‌ی كه‌لڤێنیزم، ئه‌قڵانی نه‌بوون. تاكه‌كان به‌ نیگه‌رانیه‌وه‌ له‌ دووی وه‌ڵامی پرسیاره‌كانی بوون ده‌گه‌ڕان و بۆ دۆزینه‌وه‌ی وه‌ڵام (كه‌ ئه‌مه‌ له‌ ڕوانگه‌ی ڤێبه‌ره‌وه‌، خاڵی ده‌ستپێكه‌) ده‌ستیان به‌ چالاكی ئابوری كرد، له‌به‌رئه‌وه‌ی، گه‌ر سه‌ركه‌وتنیان به‌ ده‌ست بهێنایه‌، ئاسوده‌ ده‌بوون. هه‌ر له‌م میانه‌یه‌دا، به‌ باوه‌ڕی ڤێبه‌ر، ئه‌خلاقی پڕۆتستان، بوه‌ سه‌رچاوه‌ی ڕۆحیه‌تی سه‌رمایه‌داریی. یان به‌ واتایه‌كی تر، ڕۆحیه‌تی سه‌رمایه‌داریی له‌ سنورداریه‌تی ژیانی زاهیدانه‌دا خۆی بینیه‌وه‌، ئه‌مه‌ش یه‌كه‌مین پارادۆكسی كه‌ ڤێبه‌ر ئاماژه‌ی پێده‌كات.

به‌ باوه‌ڕی ڤێبه‌ر، ڕه‌فتاری مرۆڤ، شۆڕشێكی نائه‌قڵانی نیه‌، به‌ڵكو جۆرێك ئه‌قڵانیه‌تی به‌هاداره‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی هه‌ڵبژاردنه‌و گه‌ر هه‌ڵبژاردن له‌ ڕووی ئاگاییه‌وه‌ ئه‌نجام درابێت، ئه‌وكات ئه‌قڵانیه‌ت ناتوانێت ئه‌قڵانیه‌تێكی به‌هادار بێت و ئه‌قڵانیه‌تێكی سوننه‌تیش نیه‌

مانای، بە هۆی کردارێکی نائەقڵانیەوە (نیگەرانیەکی لەمەڕ بوون کە هیچ پەیوەندی بە ئەقڵانیەتەوە نیە) سیستمێکی تەواو ئەقڵانی هاتە بوون و بە پێی ئەو سستمە برۆکراسی مۆدێرن و سیستمە ئابوریەکان پەرەی سەند. کەواتە، هەر لە سەرەتاوە، مۆدێرنێتە دوچاری دوفاقیانەیی‌و پارادۆکس بوە. جیاوازی نێوان دژایەتی و پارادۆکس ئەوەیە کە لە چوارچێوەی مانای دژایەتیدا، دوو شت دەکەونە بەرامبەر یەکتر، بەڵام پارادۆکس تاکە مانایەکەو لە یەك کاتدا جگە لە خۆی دەتوانێ شتێکی تریش بێ. کەواتە، سەرچاوەی ئەقڵانیەتی سەرمایەداریی ئەقڵانیەتە، ئەمەش پارادۆکسی ئەو چەمکەیە، بەڵام لە ڕوانگەی ڤێبەرەوە، مۆدێرنێتە دوچاری پارادۆکسێکی تر بوە (هەموو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ مانای زەینی کەسی ئەنجام دەر) ئەو پاڕادۆکسە ئەوەیە کە ئەخلاقی پرۆتستانی لەگەڵ بنەڕەتی زوهدو دنیاگەرایی، دەستی پێکرد، دواتر شوناسێکی تەواو جیاوازتر لە دەست پێکردنەکەی وەرگرت. مانای، ڕوی کردە ڕەفتارێکی پڕ لە بەدڕەوشتی‌و تێرکردنی پێویستیە تاکەکەسیەکانی نێو سەرمایەداریی. ڤێبەر باوەڕی بە پارادۆکسی سێیەمیش هەیە ئەو پارادۆکسەش پەیوەندی باسی ڕۆشنگەریی و مۆدێرنێتەو پەیوەندی ئەو دوو چەمکەیە لەگەڵ ئەو باسانەی کە چەند جارێك لە چوارچێوەی مۆدێرنێتەدا بەرگوێمان دەکەوێت و ئەو باسانەش لە خۆیاندا پەیوەندیان بە ئازادی‌و ئەقڵانیەت و مۆدێرنێتەوە هەیە.

ڤێبەر، سوود لە باسی قەفەسی ئاسنین– و دەسەڵاتداریەتی دامەزراوەکان و بە شێوەیەکی گشتی سود لە هەردوو چەمکی "کەسایەتی‌و سیستەمەکانی ژیان" وەردەگرێت و ئەم چەمکانەش دەخاتە بەرامبەری یەکتر. ئەمانەش، تایبەتمەندیەتی ژیانی مۆدێرن و هەمان پارادۆکسی مۆدێرنێتە دوبارە دەکەنەوە. لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئەقڵانیەت لە لایەك و ئازادی لە لایەکی تر، یاخود لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئەقڵانیەت، وەکو دابینکەری ئازادی لە لایەك و تاکی ڕەسەن لە پێکهاتەی ئابوریدا، لە لایەکی ترەوە، ناتەبایەك دروست دەبێ.

ڤێبەر بە مارکسی بۆرجوازو بە ڕەخنەگری جدی سەرمایەداری ناسراوە. مارکس بە هۆی بنەڕەتە تایبەتیەکانی خۆیەوە ڕەخنە لە سەرمایەداریی دەگرێت و ڤێبەریش بە شێوازێکی جیاواز ڕەخنە لە سەرمایەداری دەگرێت. بە باوەڕی ڤێبەر، تاکەکانی کۆمەڵگا لە نێو پێکهاتەی کۆمەڵگای مۆدێرن، کە ئەو پێکهاتەیە بە پێی جێگیری سەرمایەداریی هاتۆتە بەرهەم، گرفتار دەبێ: ڤێبەر زاڵبونی بۆرۆکراسی بەسەر ژیانی

ڤێبەر، سوود لە باسی قەفەسی ئاسنین– و دەسەڵاتداریەتی دامەزراوەکان و بە شێوەیەکی گشتی سود لە هەردوو چەمکی "کەسایەتی‌و سیستەمەکانی ژیان" وەردەگرێت و ئەم چەمکانەش دەخاتە بەرامبەری یەکتر

ڕۆژانەو کۆمەڵایەتی بوونی پەیوەندیەکان، ناودەنێت؛ گرفتار بوونی نێو قەفەسی ئاسنین، و لەو باوەڕەدایە کە سوپاو دسپلینی سەربازی بەرجەستە بکرێت جۆری دیسپلینی دنیای مۆدێرنە. ڤێبەر بەم شێوەیە پێناسەی دیسپلین دەکات: "خووگرتن بە ڕەفتارێکی دیاریکراو و ملکەچ بوونە عادەتیەکانی تاك لە کۆمەڵگای مۆدێرندا" یان بە واتایەکی تر، تاکەکان هەست دەکەن، کەس بە سەریانەوە نیەو کەس چاودێریان ناکات، بەڵام ئاست و سنورێکی دیاریکراو لە بەردەم ڕەفتاری تاکەکەسدا هەیە، کە کەس ناتوانێت سەرپێچیان لێبکات.

به باوەڕی ڤێبەر، لەنێو پێکهاتەی بازاڕو سەرمایەداریی مۆدێرندا، تاك و ویستە تاکەکەسیەکان، بە هۆی پەرەسەندنی سەرمایەداریو بروکراتیزە بوونی سەرمایەدارییەوە، گرنگی و بایەخی نامێنێ. شایانی باسە، ڕوخسارێکی تری جیاوازیی ڤێبەرو مارکس، جگە لە قسەکردن لەسەر سەرچاوەی مۆدێرنێتە، ڕەوتی مێژویی مۆدێرنێتەش دەگرێتەوە. پێشبینیەکەی ڤێبەر لەمەڕ چارەنووسی مۆدێرنێتە، بە پێچەوانەی پێشبینی مارکسەوە سەبارەت بە سەرمایەداریی و مۆدێرنێتە، پێشبینیەکی ڕاست بوو. مارکس، ئەوەی ڕۆشنگەریەو گەشبینە لەبەرامبەر داهاتوو. هەرچەند مارکس دژی سەرمایەداریە، بەڵام دژی مۆدێرنێتە نیەو قبوڵی دەکات، لەبەرئەوەی گەشبینە بە داهاتووی ئەو چەمکە. مارکس لەو باوەڕەدایە، لە نێو دڵی سەرمایەدارییەوە سۆشیالیزم سەرهەڵدەدات، و مرۆڤەکان ڕزگاردەکات. بەڵام هاوکات، ڤێبەر لەو باوەڕەدا بوو، لەبەرئەوەی سۆشیالیزم جەخت لەسەر پێکهاتەی دەوڵەت و بۆرۆکراسی دەکاتەوە، بە دڵنیایی دوچاری شکست دەبێ، ناتوانێت چارەنووسێکی باشی مۆدێرنێتە دیاریبکات. ڕاستی ئەم پێشبینە لەنێو مێژوودا سەلمێنراوە. لە لایەکی ترەوە خودی ڤێبەر، جەختێکی تایبەتی لەسەر بۆرۆکراتیزەبوونی سەرمایەداریی دەکاتەوە، لەم میانەیەدا دەڵێت:

دامەزراوەکانی ئەم سەردەمە بە هۆی گەلێك ڕێگای جیاوازەوە، تاکەکان پێکەوە، گرێ دەدەن. لەم میانەیدا، هەرکەس بە پێی ویستی خۆی ئامرازەکانی پەیوەندی بەلای خۆیدا ڕادەکێشێ بۆ ئەوەی بتوانێت پێگەی تایبەتی بۆ خۆی مسۆگەر بکات، بەڵام گەر ئەو لایەنە، زۆر بەهێزبێت و بتوانێت گەلێك ئامراز بەلای خۆیدا بەکێش بکات دەبێ لە کۆتاییدا بەرەو پێگەیەك هەنگاوبنێ، کە بۆی دەستنیشان کراوە. مانای، مرۆڤ بە دەستەوسانی، لە تۆڕی پەیوەندیەکانی ئەو پێکهاتەیەی کە سەرمایەداریی مۆدێرن دەستنیشان دەکات، جێگەی خۆی دەدۆزێتەوە.

به باوەڕی ڤێبەر، لەنێو پێکهاتەی بازاڕو سەرمایەداریی مۆدێرندا، تاك و ویستە تاکەکەسیەکان، بە هۆی پەرەسەندنی سەرمایەداریو بروکراتیزە بوونی سەرمایەدارییەوە، گرنگی و بایەخی نامێنێ

# پرسیارو وەڵام

***ئایا ڤێبەر کەسێکی پەی پێبەری تەواو نایابە؟ ئایا لای ئەو، هەڵسەنگاندنی بێ خەوشیەکان، بە چ شێوەیەکە؟ ئایا بە ڕای ڤێبەر، لەنێو زانستە مرۆییەکاندا، زانستێك لە ئارادایە، بتوانێت دەغدەغە بەهاداریەکان وەڵام بداتەوە؟ بە لەبەرچاوگرتنی ئەنگێزە بەهاداریەکان کە پێدەچێت زەمینە خولقێنەری ڕستێك لە زانستەکان بن..***

لەمەڕ شێوازی هێرمۆنتیك، ئەوە پەسەندکراوە، کە شلای ماخەر– دەستپێکەری باسە هێرمۆنۆتیکیەکانی دەقەکان بوە. پاش ئەو، یەکەم کەس کە سودی لە شێوازی شیکردنەوە لەمەڕ تێگەیشتن وەرگرتوەو ئەو شێوازەی ئاخنیوەتە نێو سنوری زانستە کۆمەڵایەتیەکان، دیلتایە. بەڵام دوو کەس زیاتر، تێگەیشتنێکی لە باتی هۆکار دۆزینەوە دادەنێن: زیمبل و ڤێبەر. بەڵام ڤێبەر ئەو کەسەیە، کە بە شێوەیەك دەپەرژێتە سەر باسی پەی پێبردن. هەر لەم میانەیشدا، ئاماژە بەوە کرا، کە ڤێبەر، شێوازی پەی پێبردنی دیلتای ئاخنیە نێو کۆمەڵناسی، بەڵام ئێستا، شیکەرەوە جدیەکانی ڤێبەر، بە شێوەیەکی تایبەتی، قسە لەسەر بونگەرایی بوونی ڤێبەر دەکەن. تەنانەت ماوەی *40* ساڵ پێش ئێستا، سی ڕایت میلز، لەو باوەڕەدا بوو کە ڤێبەر فەیلەسوفی مێژوە. کەواتە ڤێبەر، تێگەیشتن و هێرمۆنۆتیکی، سنوردار نەکردوە بە میکانیزمی کارکردن لەنێو زانستی کۆمەڵایەتیدا، بە تایبەتی لە کۆمەڵناسیدا. بەڵکو لە باسە پەیوەندیدارەکانی ناسینی چارەنووسی مرۆڤدا، کە چارەنووسی لە بەرامبەر شایستەیی دەوەستێ، دەڵێت؛ ئەوە شایستەیی نیە کە چارەنووسسازە، بەڵکو هۆکاری دەستنیشانکەری چارەنووس، دیسپلین و پێکهاتەکان و سستیەکانن. کەواتە، ڤێبەر دیدگایەکی هێرمۆنۆتیکی بوەو دۆخی مرۆڤی لە جیهانی مۆدێرندا شیکردۆتەوە. هاوکات بە هۆی پەیدابوونی هایدگەرەوە ئەو دیدگایە زۆر زیاتر بەرجەستە بوو. کەواتە، بە شێوەیەکی دیاریکراو، ڤێبەر، سودی لە هێرمۆنۆتیکا وەرگرتوە لە زانستی کۆمەڵناسیداو هایدگەر لە سنوری فەلسەفەدا سودی لێوەرگرتوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ڤێبەر وەکو نیو پۆزیتیڤیست، ناسراوە. ڤێبەر قسە لەسەر نمونە بێ خەوشەکان دەکات، بەڵام لەم میانەیەشدا دەڵێت: بۆ دڵنیایی تەواو دەکرێت ئاماژە بە پەیوەندی هۆو هۆکار بکەین.

ماوەی 40 ساڵ پێش ئێستا، سی ڕایت میلز، لەو باوەڕەدا بوو کە ڤێبەر فەیلەسوفی مێژوە. کەواتە ڤێبەر، تێگەیشتن و هێرمۆنۆتیکی، سنوردار نەکردوە بە میکانیزمی کارکردن لەنێو زانستی کۆمەڵایەتیدا



هابرماس

ئەو باسەی لە نێوان ڤێبەرو دیلتایدایە، باسێکی هاوبەشە، قسەکردن لەسەر ئەزمونی ژیان. ئەو دوانە لەو باوەڕەدان، ڕۆڵی ئەزمونی ژیانی لە درکی مرۆیدا، چارەنووسسازە. بەو مانایە کە هەر لێکۆڵینەوەیەك یاخود هەموو مرۆڤێك لە ژیاندا، گەلێك ئەزموونی هەیە، کە دەتوانێت پشتی پێببەستێت و لە ڕێگەیەوە لە ڕەفتارەکانی مرۆڤەکانی تریش تێبگات. ڤێبەر دەڵێت؛ قسەکردن لەسەر پێوەندی هۆو هۆکار تەنانەت قسەکردن لەسەر ئامار یارمەتی درکی مرۆڤ دەدات، بەڵام جەخت دەکاتەوە کە ناکرێت لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری تاکی بەرامبەر، لە ڕێگەی پەیوەندی هۆو هۆکارو بە سەرنج خستنە سەر ئەو ناسینەی کە سەبارەت بە جۆری ڕەفتار لەمەڕ بنەڕەتی مانای زەینی ڤێبەر لە ئارادایە، تێبگەین. لە میانەی ئەم باسانەدا پشت بە چەمکی پۆزیتیڤیزم دەبەسترێ. هەر لەبەر ئەمەش دەڵێن؛ ڤێبەر نیو پۆزتیڤیزمە، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕەسەنیەتی دەبەخشێتە پەی پێبردن، ناتونین ڤێبەر بە کەسێکی نیوپۆزیتیڤیزم ناوببەین.

جیاوازی بنەڕەتی نێوان ڤێبەرو هابرماس لە باسی ئەخلاقدا ئەوەیە کە؛ ڤێبەر لەو باوەڕەدایە کە دنیای مۆدێرن بە تایبەتمەندیە تەوەرییەکانیەوە دووچاری بۆشایی ئەخلاقی کردوە و ئەمەش بە گرفتێکی تری مۆدێرنێتە دەزانێت و ڕەخنە لە مۆدێرنیزمەکان دەگرێت: سەرەتا بە پشت بەستن بە بەها ئەخلاقیەکان دەستیان پێکردو دواجار زانستیان کردە جێنشینی ئەو بەهایانەو ئێستاش زانست دەسەڵاتدارە. ڤێبەر لێرەدا، زانست تەنها بە هۆکارێك دەزانێت، لەبەرئەوەی لە توانایدا نیە مانایەك بۆ ژین بدۆزێتەوە. کەواتە، هێرمۆنۆتیکە بوونگەراکەی ڤێبەر لێرەدا دەردەکەوێت. "مرۆڤی مۆدێرن دوچاری بۆشایی جدی ئەخلاقی بوە"، مەبەستی ڤێبەر سەبارەت بە مرۆڤی مۆدێرن ئەو ڕەوتەیە کە لە ژیانی مۆدێرن و شارنشیندا دروستبوە، پەیوەندیە تاکە کەسیەکان لاواز بوەو فۆرمی خێزان لە ئەوروپا گۆڕانی بەسەردا هاتوە. لێرەدا ڤێبەر ئاماژە بە قسەیەکی تۆلستۆی دەکات کە دەڵێت: "مرۆڤی مۆدێرن لەبەر بۆشاییو نەبوونی مانا لە ژیانی خۆیدا، نازانێت لە دوی چی دەگەڕێ". هەر لەبەر ئەمەیە کە دەوترێت ڤێبەر کەسێکی ڕەشبینە، لەبەرئەوەی ڤێبەر دەڵێت؛ بۆشایی ئەخلاقی، ژیانی بۆ مرۆڤی مۆدێرن کردۆتە ژیانێکی پووچ. بەڵام هابرماس قسەکردن لەسەر دۆزینەوە ئەخلاقیەکان بە تەنها لە چوارچێوەی یەك بنەڕەتدا دەبینێتەوە کە ئەویش بریتیە لەو باوەڕەی کە ڕزگاربوون بە هاوتای نیەتی ژیانی

مرۆیی دەزانێت. لەم میانەیەدا، هابرماس لەو باوەڕەدایە کە لە ڕێگەی گفتوگۆوە یاخود لە ڕێگەی ئەخلاقی وتووێژەوە، بنەڕەتەکان بدۆزینەوە.

یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی تری ڤێبەر، مەزهەبی بوونیەتی. ڤێبەر، بە بەردەوامی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بە تەنها قسە لەسەر ئەوروپاو ئەزمونی ئەوروپا دەکات. کەواتە، بە دڵنیاییەوە، ئەخلاقی ئاینی، سەرچاوەی سەرمایەداریی نیە، بەڵکو ئەمە تایبەمەندیەتی ئەوروپایە؛ بە پێچەوانەی مارکس کە لەو باوەڕەدا بوو بنەڕەتی پێنج لایەنەی مێژوو، جیهان شمولە، ڤێبەر ئاشنای شارستانیەتی سەردەمی خۆی و سەرجەم شارستانیەتەکانی جیهان بوو هەروەها ڕێزی لەو شارستانیەتانە دەگرت. ڤێبەر لە گەورەترین کۆمەڵناسانی ئاین بوو، بە باشی بودیزم و کۆنفسیۆس و ئیسلام و یەهودی دەناسی. بەڵام مارکس بەو شێوەیە نەبوو. ڤێبەر زۆر بە تایبەتی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕۆشنبیری یاخود مانای زەینی یان باوەڕە فەرهەنگیەکان هەمیشەو لە هەموو شوێنێك چارەنووسساز نین، بەڵکو لەمەڕ چەمکی سەرمایەداریی ڕۆژئاوایی، ڕۆشنبیریو ئەخلاقی پرۆتستانی چارەنووسساز بوون و ڕەنگە لە کات و شوێنێکی تردا، لەبەر هۆیەکی تر سەرمایەداریی دروست ببێ.

***سۆسیالیستەکان قایلن بە ڕزگاربوونی مرۆڤ لەسەرمایەداریو مۆدێرنێتە، ئایا ڤێبەر لەم میانەیەدا ئاماژە بە ڕزگاربوونی مرۆڤ دەکات لە داوی مۆدێرنێتەو ئەو بۆشاییەی دروست بووە؟***

بە لەبەرچاوگرتنی ڕەهەندی بونگەراییانەی ڤێبەر، دەتوانین بڵێین، ئەو لەو باوەڕەدایە مرۆڤ لە کۆتاییدا دەکەوێتە گەڕان بە دوای ڕێگەچارەداو زۆر بە توندی گومان لە داهاتووی مرۆڤایەتی دەکات. ڤێبەر داهاتووی مرۆڤ وا دەبینێتەوە کە ڕووبەڕووی گەلێك گرفت دەبێتەوە لەم بارەیەوە دەڵێت:

تا ئێستا هیچ کەس نازانێت، چ کەسێك لە داهاتوودا لەنێو ئەو هەسارانەدا دەژیو کەسیش نازانێت لە کۆتایی ئەم ڕەوتە بەرفراوانەدا، پێغەمبەری نوێ سەرهەڵدەدات، یاخود ئایدیاو ئامانجە بەهێزەکانی ڕابردوو زیندو دەبنەوە، یاخود گەر ئەمانە ڕووی نەدا، ئایا دۆخێکی کۆنەپەرستی میکانیکی ڕازاوە لە تەك جۆرێك خۆ بە زل بینینی نەخۆشانە دەستەڵات دەگرێتە دەست. ئەم گۆڕانکاریە ڕۆشنبیریە، پسپۆڕە بێ ڕۆحەکان لە چێژ گەڕە بێ مەرجەکان و ئەو بونەوەرە بێ بەهایانە، شانازی بە

خۆیانەوە دەکەن لەبەرئەوەی گەیشتونەتە قۆناغێکی مرۆڤایەتی، کە تا ئێستا پێی نەگەیشتبوون.

ئەمە لوتکەی ڕەشبینینی ڤێبەرە، یاخود ڕەتکردنەوەی دۆخێکە کە مرۆڤی مۆدێرن لە ڕووی ڕۆحی و کۆمەڵایەتیەوە ئاوێتەی بووە. ئەمە یەکێکە لە بەرجەستەترین ئەو شتانەی کە ڤێبەر لەمەڕ داهاتوو وتویەتیو لە وتارێکدا لەژێر ناونیشانی (زاناو سیاسەتمەدار) جەخت لەسەر پێویستی هەڵبژاردنی بابەتەکان دەکاتەوە لەسەر بنەڕەتی دڵەڕاوکێی ئەخلاقی لە کاری زانستیو گرنگی قبوڵ کردنی بەرپرسیارێتی لە پیشەی سیاسەتدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سیستەمێکی کۆکراوە، دیاری ناکات.

***لە ئێستادا ئێمە شایەتی ڕاستی پێشبینییەکانی ڤێبەرین لەمەڕ پۆست مۆدێرنیزم، بەڵام پێشبینیەکانی مارکس ڕاست دەرنەچوون، ئایا پێدەچێت ئێمە لە داهاتوودا، بۆ نمونە پاش پۆست مۆدێرنیزم، بگەڕێینەوە سەر سۆسیال دیموکراسی؟***

ڕاستی پێشبینیەکانی ڤێبەر لەسەر بنەڕەتی ئەزمونی مێژوویی ئەم سەد ساڵەی دواییە کە لەوێدا سەرمایەداری قەیرانە زۆر جدیەکانی بەجێهێشتووە.

لە لایەکی ترەوە، خودی ئەزمونی جێگیریی پێکهاتە کۆمۆنیستیو سۆسیالیستیەکان وەکو سەردەمێکی مێژوویی لە لایەن مارکسیو سۆسیالیستییەکانەوە ئاماژەی پێدەکرێ. کاتێك باس لە مارکس و ئەنگلس دەکرێت، هەندێك کەس لەو باوەڕەدان ئەو شتانەی لەمەڕ بارودۆخی پاش شۆڕش نوسراوە پەیوەندی بە ئەنگلسەوە هەیە نەوەکو مارکس بەڵام لە ڕاستیدا، مارکس باوەڕی بە سەرهەڵدانی دنیای مۆدێرن هەبوو، هەر ئەویش یەکەم کەس بوو پێشبینی داهێنانی مرۆڤی ئامێری کرد. بەڵام تا ئێستا زیاتر پێشبینیەکانی ڤێبەر سەلمێنراون تا پێشبینیەکانی مارکس.

## بەشی دووەم

لێرەدا، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باشتر ماکس ڤێبەر بناسین و هەروەها پوختتر لە مۆدێرنێتە بکۆڵینەوە، ماکس ڤێبەرو قسەکردن لەسەر مۆدێرنێتە لەم کتێبەدا ئاوێتەی یەکتردەکەین.

هەندێك کەس لەو باوەڕەدان ئەو شتانەی لەمەڕ بارودۆخی پاش شۆڕش نوسراوە پەیوەندی بە ئەنگلسەوە هەیە نەوەکو مارکس بەڵام لە ڕاستیدا، مارکس باوەڕی بە سەرهەڵدانی دنیای مۆدێرن هەبوو، هەر ئەویش یەکەم کەس بوو پێشبینی داهێنانی مرۆڤی ئامێری کرد. بەڵام تا ئێستا زیاتر پێشبینییەکانی ڤێبەر سەلمێنراون تا پێشبینییەکانی مارکس

کلڤن دەڵێت: لەم دنیایەدا ئەو کەسانەی سەرکەوتن بەدەست بهێنن و پابەندی بنەڕەتە ئەخلاقیەکان بن، ئەوانە هەڵبژاردەکانی خودان

لە بەشی پێشووی ئەم کتێبەدا قسە لەسەر ڕوویەکی مۆدێرنێتە کرا، کە تا ئێستا کەمتر قسەی لەسەر کراوە، ئەویش پارادۆکسەکانی میانەی ڕەوتی پێکهاتنی مۆدێرنێتەیە ڤێبەر لەو چوارچێوەیەدا قسە لەسەر ئەوە دەکات کە خاڵی دەستپێکردنی ڕەوتی عەقلانی بوون لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاواو ژیانی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری سیاسی ئەو کۆمەڵگەیەدا، هۆکارێکی ناعەقلانی بووە. هەروەها لەو باسەی پێشوودا جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە، کە بە باوەڕی ڤێبەر خودی ئەو ڕەوتە جارێکی تر دووچاری جۆرێك لە ناعەقلانیەت بووە. مانای لە ڕوانگەی ڤێبەرەوە دەکرێت بە یەك چاو لە ڕەوتی بە عەقلانی بوون لە ئابوریداو لە کۆتایشدا لە پێکهاتنی سەرمایەداری بڕوانین، ئەویش بە دیدێکی تایبەتی مەزهەبی لە پاش سەرهەڵدانی پرۆتستانت یان لە پاش سەرهەڵدانێکی ڕەوتێکی هزری بە ناوی کالفێنیزم. یان بە واتایەکی تر، جۆرێك لە بەڵێندەرایەتیو دڵەڕاوکێی دەرونی مەزهەبی. پاش تەرحی دیدگای هەڵبژاردەبوونی تاکەکان بە پێی ئیرادەی ئیلاهی، بووە هۆی ئەوەی زۆربەی پڕۆتستانەکان لە دووی ڕێگەیەك بگەڕێن بۆ ئارامیو دڵنیابوون لەوەی دەکەونە بەر بەزەیی خودا. لەم میانەیەدا کلڤن دەڵێت: لەم دنیایەدا ئەو کەسانەی سەرکەوتن بەدەست بهێنن و پابەندی بنەڕەتە ئەخلاقیەکان بن، ئەوانە هەڵبژاردەکانی خودان. ئەمەش بەو مانایەیە کە کەسی هەڵبژێرراو لەو کەسانەیە کە لە ژیانی دنیاییو بە تایبەتی لە ژیانی ئابوری‌دا سەرکەوتووەو لە هەمان کاتدا بە دوای دابینکردنی ویستە تاکە کەسیەکانی خۆیدا ناگەڕێ. مانای کلڤن پاکیزەیی مرۆڤی پەیوەستکرد بە چالاکی ئابوریەوە، ئەمەش لە ڕوانگەی ڤێبەرەوە خاڵی دەستپێکی پێکهاتنی چەمکێکی بەناوبانگە بەناوی ئەخلاقی پڕۆتستانتی و ڕۆحیەتی سەرمایەداری.

بە لەبەرچاوگرتنی شێوازی پەی پێبردن و ماکس ڤێبەر، وشەی ڕۆحیەت، لەمەڕ تێگەیشتن لە مانای لە پێشینەی زەینی کەسی ئەنجامدەر، وشەیەکی ڕاست نیە. لەبەرئەوەی بە باوەڕی ڤێبەر، بە بێ مانایەکی زەینی، تاکەکان ڕەفتارێکی تایبەتی ئەنجام دەدەن، کەواتە خودی ڤێبەر سود لە وشەی (*Geist*) وەردەگرێ کە لە ڕوی زمانەوانیەوە یەکێکە لەو وشە دەوڵەمەندانەی کە لە زمانی باوی فەلسەفیو زانستی ئەڵمانیدا، بەکاردەهێنرێت، هەر بۆیە ڤێبەر ناوی کتێبەکەی دەنێت (*Geist des Capitalismus*) واتە ڕۆحی سەرمایەداری. بەلام لێرەدا ر ۆح نەوەکو بە واتەی چەمکێك لە بەرامبەر جەستە، لەبەرئەوەی ئەو کات ئەو چەمکە پەیوەست دەبێ بە باسی

دەروونناسیەوە، بەڵکو بە مانای دۆخێکی دەرونی. هەر ئەو بەدحاڵی بوونەش لە ڤێبەر بۆتە هۆی ئەوەی، هەندێك کەس بڵێن، ڤێبەر زیاتر لەوەی کەسێکی کۆمەڵناسە، کەسێکی دەروونناسە، بۆ حاڵیبوون لەو بابەتانەی کە ڤێبەر لەمەڕ مۆدێرنێتەو بە تایبەتی سەبارەت بە ڕەوتی گۆڕانکاریەکان لە دنیای مۆدێرندا تەرحیان دەکات، زۆر گرنگە ئەوە بزانین کە ئەو سەرجەم هۆکارو ڕەهەندە دەرونیەکان بە مانا زەینیو بە مانا فەلسەفیەکانیانەوە، ناودەنێت؛ ڕۆح. ئەمەش هەمان ئەو وشەیەیە کە هێگڵ بە درێژایی مێژوو لە باتی مانای ئایدیاو ئەقڵ بەکاریدەهێنێت. مانای *Geist* بریتیە لە ئەقڵ و ڕۆح و ئایدیا، یا سەرجەم ڕۆحی گرێ داوە بە ڕۆحیەتی گەلێکەوە، نەوەکو بە تەنها ڕۆحیەتی تاکەکەسەوە، لە ڕاستیدا، تایبەتمەندیە دەرونیەکان، باوەڕو دۆخە هزرو زەینیەکان، ئاڕاستە زەینیەکان، کە هەموویان بەهایەکی زۆریان هەیە، هەمان مانای ڕۆحی سەرمایەداری ڕاڤە دەکەن. لێرەدا مەبەست لە ڕۆحی سەرمایەداری ئەوەیە کە ئەو چەمکە لە چی پێکهاتووە چ جۆرە تایبەتمەندیەتیەکی لەخۆ گرتوە. کەواتە ئەقڵانیەت و نائەقڵانیەت لە چوارچێوەی سەرمایەداریدان کە هەمان ڕووی ئابوری مۆدێرنێتەیەو دوچاری بەدڕەوشتیو لادان بوە، لەلای ڤێبەر جێگەی باس و گرنگیە. لایەنێکی ئەم باسە، قسەکردنە لەسەر خەرجکردنی بێسنووری زۆرینە لەمەڕ دابینکردنی بەرژەوەندی گروپێکی تایبەتی لەنێو کۆمەڵگای مۆدێرندا کە ئەمەش بە باوەڕی ڤێبەر چارەنووسی سەرمایەداریە.

ڤێبەر لە دوو ڕووەوە ڕووبەڕوی ئەقڵانیەت دەبێتەوە، لایەنێك وەکو بابەتێك لە چوارچێوەی کۆمەڵناسیدا، ڤیبەر لەم میانەیەدا هەوڵ دەدات، شێوازی کارکردنی مرۆڤەکان و پێکهاتنی پەیوەندیەکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان، شیبکاتەوە، بەم پێیە، ڤێبەر، ئەقڵانیەت بەسەر دوو جۆردا دابەشدەکات: 1–ئەقڵانیەتی مەبەستدار. 2–ئەقڵانیەتی بەهادار. ئەقڵانیەتی مەبەستدار، سەرجەم هۆکارە باش و کاریگەرەکان هەڵدەبژێرێ، بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی دیاریکراو. ڤێبەر لەو باوەڕەدایە کە ئەم جۆرەی ئەقڵانیەت، دەسەڵاتداری سەردەمی مۆدێرنێتەیە. کەواتە ڤێبەر لە شیکردنەوەی کۆمەڵناسیدا بەبێ ئەوەی ئاماژە بە چاکی و خراپیان بکات، سودی لێوەردەگرێ. کەواتە ناتوانین ڤێبەر بە بیرمەندی لایەنگری بانگەشەکەری ئەقڵانیەت بزانین.

لایەنی دوهەمی ئەقڵانیەت لە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی ڤێبەردایە. بەو مانایەی کە ڤێبەر هەوڵدەدات بە هۆی دیدگایەکی مێژووییەوە، شوناسی ژیانی کۆمەڵایەتی

ڤێبەر، ئەقڵانیەت بەسەر دوو جۆردا دابەشدەکات: 1–ئەقڵانیەتی مەبەستدار. 2–ئەقڵانیەتی بەهادار

مۆدێرن، شیبکاتەوە. لەم چوارچێوەیەدا، ڤێبەر لەوە بە ئاگا دەبێ کە ئەقلانیەتی مەبەستدار، بە درێژایی مێژوو بە تایبەتی لە سەردەمی مۆدێرندا، کاریگەریی لەسەر ئاراستەی بزاڤی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەجێهێشتوە. بە تایبەتی لە کۆمەڵگای ڕۆژئاواییدا، ئەقلانیەتی مەبەستدارە توانیویەتی لە قاڵبی گەلێك دامەزراوی وەکو دەوڵەتی مۆدێرن لە ئابوری سەرمایەداریدا، دەسەلاتی مافە تازەکانی هاولاتیان و دەسەلاتی ئاینی بگرێتە دەست. لە ڕاستیدا، ئەو دۆخانەی پانتایی ئاین دەسڕێتەوە، کە مرۆڤ ناتوانێت لێیان تێبگات، و لە بەرامبەر ئەمەشدا قسە لەسەر بە ئەقلانیکردنی ئاین دەکات، بەلام ڤێبەر ئەم گۆڕانکاریە، بە شێوەی گۆڕانکاریەك لە ڕەوتی گۆڕانکاریی مێژووییدا، لێکدەداتەوە. لێرەدا، ڤێبەر دەڵێت: ڕەوتی بە ئەقلانی بوون، چارەنووسێکی باشتر بۆ مرۆڤ مسۆگەر ناکات.

پاش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم، ئەڵمانیەکان لەبەر شکستی ڕەسمی لەو جەنگەداو لەبەر هەندێ هۆکاری فەرهەنگیو کۆمەلایەتی، کەوتنە لێکۆڵینەوەی گۆڕانکاریەکانی دنیای مۆدێرن و زانست. هەر لەم بارەیەوە ڤێبەر لە وتارێکدا سەبارەت بە ئەقلانی بوون، ڕستەیەکی بەناوبانگی هەیە: *"زەینگەرایی بەرفراوان بە مانای بە ئاگابوونێکی بەرفراوانی گشتی نیە لە هەلومەرجەکانی ژیان، بەڵکو بەو مانایەیە، کە ئێمە دەتوانین بە هۆی ئەگەرو پێشبینیەکانەوە، دەسەلاتی خۆمان بەسەر هەموو شتێکدا، بسەپێنین"*.

لەم میانەیەدا، بایەتێکی گرنگی تر، بۆچونی ڤێبەرە لەمەڕ جۆرەکانی پێکهاتەی سیاسی. لە زمانی ئەڵمانیدا وشەیەك هەیە بەناوی (*Herrschaft*) کە ماناکەی بریتیە لە: ئاغایی کردن و لە ڕاستیدا مەبەست لەو وشەیە، سەروەریو گەورەییە. قسەکردنی ڤێبەریش لەسەر پێکهاتەکانی حکومەت و گەورەیی و سەروەریەکانە، هەر بۆیە، بە لەبەرچاوگرتنی شێوازی لێکۆڵینەوەکەی خۆی سود لە وشەی *Herrschaft*– وەردەگرێت سەرجەم هەوڵەکانی ڤێبەر بۆ ئەوەیە، ڕونیبکاتەوە کە جۆرەکانی حکومەت، سونەتیو پاتۆیمۆنیلْ یا باوك سالاریو بۆرۆکراتیك و کاریزمایی، بەچ شێوەیەکی دەرونی، لە لایەن ئەندامانی کۆمەڵگاوە، پەسەند دەکرێن و پەیڕەویان لێدەکرێت. لێرەدا هەرگیز مەبەست قسەکردن نیە لەسەر دەسەلات، هەر ئەمەش وردبینی تیۆریی شەرعیەتە سیاسیەکەی ڤێبەرە. لە گەلێك بواری تایبەتیدا، هاولاتیان بە پێی سەردەمەکەی خۆیان، پەیڕەوی لە حکومەت ناکەن، وەکو دابونەریت کە

زەینگەرایی بەرفراوان بە مانای بە ئاگابوونێکی بەرفراوانی گشتی نیە لە هەلومەرجەکانی ژیان، بەڵکو بەو مانایەیە، کە ئێمە دەتوانین بە هۆی ئەگەرو پێشبینیەکانەوە، دەسەلاتی خۆمان بەسەر هەموو شتێکدا، بسەپێنین

دەوڵـەت ناتوانـێ بیگۆڕێـت. کەواتـە لـە سـەردەمێکی تایبـەتی مێـژوودا، حکومەتـە سونەتیەکانی وەکو باوکسالاریی‌و شێخ سالاریی، دەسەڵاتیان هەبوە. پاتریمونیـاڵ، جۆرێك دەسەڵاتی سونەتیە کە لە میانەیدا زیاتر گرنگی بە تاك دەدرێت و ئەوەندە دابونەریتـەکان لەبـەرچاو نـاگرێت. ڤێبـەر ئـەو دەسـەڵاتە بـە نـاوی سـوڵتانیزم-ەوە پێناسە دەکات و بە جۆرێك حکومەتی دەزانێ کـە سوڵتان- تێیدا، خاڵی تـەوەرەیی دەسـەڵاتە. بە باوەڕی ڤێبـەر لـەو جۆرە حکومەتـەدا شـەرعیەتی سـونەت زۆر کـەمترە، لەبەرئەوەی سوڵتان پابەندی دابونەریتە قبوڵ کراوەکانی کۆمەڵگا نیە.

شایانی باسە، هـەوڵی ڤێبـەر لـە میانـەی سـەرجەم ئـەو چەمکانـەی قسـەی لەسـەر دەکـات، بـۆ دۆزینـەوەی نهێنیـەکانی پشـت مانـا ئاشـکراکانەو دەیـەوێت سـەرجەم شتەکانی نێـو دڵ و زەینـی ئەکتـەرە کۆمەڵایەتیـەکان بدۆزێیتـەوە و پـاش دۆزینـەوەی پەیوەندی نێوان دڵ و زەین، پەی بە ڕاستیەکان و تایبەتمەندیەکانی دیاردەکان ببات. کەواتـە، دیـدو بۆچونـی ڤێبـەر سـەبارەت بـە ئەقلانیـەت کـە یەکێکـە لـە هۆکـارە سەرەکیەکانی چوارچێوەی باسی مۆدێرنێتە، پەیوەندی بە سێ هۆکاری بنەڕەتیەوە هەیە لە ئایدیای مۆدێرنێتەو ڕۆشنگەریدا، کە ئەو سێ هۆکارە بریتین لە؛ مەڵبەندی، گەشەسەندن، سروشت. هۆشمەندی هۆکارێکی تەوەرەییـە، بـەڵام مەبەسـتی ڤێبـەر، جەختکردنەوە نیە لەسەر ئەقلانیەت، هەروەها مەبەستی دژایەتی کردنی زانایی نیە. بەڵکو ئەو دەخوازێ لە سەرو ئەقڵەوە پێگەیەك بۆ پەی پێبردن بدۆزێتەوە.

پاش ئەقلانیەت، ڤێبەر قسە لەسەر سروشت و لەسـەر هـەوڵی مرۆڤی مۆدێـرن بـۆ سـەرکەوتن بەسـەر سروشتدا، دەکات. لە میانـەی قۆناغی ڕۆشنگەریدا، قسە لەسـەر پەیوەندی هۆشمەندی سروشت دەکرێت، لەوێدا، سروشت بۆ ئەو مرۆڤە ئاقڵـەی کە سود لە توانای ئەقڵی دەبینی، هەم بە واتای ناسینەو هەم بە واتای سەرچاوەی بوونە، هـەر لـەم چوارچێوەیەشـدا مـرۆڤ پێویسـتە بەسـەر سروشـتدا سـەربکەوێت. کەواتـە لـێرەدا، قسـەکردن لەسـەر زانسـت و لەسـەر زانسـتی مۆدێـرن، دێتـەپێش. یـان بـە واتایـەکی تـر، قسـە لەسـەر زانسـتی سروشـتی دێتـەپێش. بـە بـاوەڕی ڤێبـەر، تایبەتمەندیـەکی دیاری زانستی سروشتی ئەوەیە، کە ڕێگەکانی سـەرکەوتن بەسـەر سروشت و هەروەها ڕێگەکانی ناسینی سروشت، لەبەرچاو دەگرێت.

ڤێبەر لە وتارێکدا بە ناونیشانی: زانست وەکو پێشەیەك، سەبارەت بە زانستی مۆدێرن (*Science*) ئاماژە بە گەلێك خاڵی زۆر ورد دەکات، لەوانەش ئاماژە بەوە دەکات کە زانست جگە لەوەی پەیوەندی نێوان هۆشمەندی و سروشت لە سەردەمی مۆدێرندا

دیدو بۆچونی ڤێبەر سەبارەت بە ئەقلانیەت کە یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکانی چوارچێوەی باسی مۆدێرنێتە، پەیوەندی بە سێ هۆکاری بنەڕەتیەوە هەیە لە ئایدیای مۆدێرنێتەو ڕۆشنگەریدا، کە ئەو سێ هۆکارە بریتین لە؛ مەڵبەندی، گەشەسەندن، سروشت

ڕاڤە دەکات، تەنها وەڵامی شێوازی زاڵبوونی تاك دەداتەوە بەسەر ژیاندا، لە ڕووی تەکنیکیەوەو ناتوانێت وەڵامی چۆنیەتی پەرەپێدانی ژیان بدەنەوە. کەواتە ڤێبەر بە شێوەیەکی بنەڕەتی هەوڵدەدات وەڵامی ئەو گرفتانە بداتەوە.

ئەوەی لە چوارچێوەی تایبەتمەندیەکانی سەردەمی مۆدێرنێتەدا گرنگە، قسەکردن لەسەر سیاسەت. ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە کە ڤێبەر چ کەسێك نیە. ئەو هەرگیز تیۆریستێکی بۆرۆکراسی نیە، بە پێچەوانەوە، ڕەخنەگرێکی جیدی پێکهاتەی بۆرۆکراتیە لە سەردەمی مۆدێرنێتەدا. ڤێبەر نەهامەتی مرۆڤی مۆدێرن ناودەنێت؛ بۆرۆکراتیو لەم بارەیەوە زاراوەی– قەفەسە ئاسنینەکەی– زۆر بەناوبانگە لە باسەکانی ڤێبەردا، گرنگی بۆرۆکراسی بە دوو جۆر گوزارشتی لێدەکرێ. یەکێکیان، ئەو پێکهاتەیەیە کە بە درێژایی مێژوو بە گەلێك فۆرمی جیاوازو لە شارستانیەتە جیاوازەکاندا، سەریهەڵداوە، وەکو شارستانیەتی میسری کۆن و فیرعەونەکان کە لەوێدا، پێکهاتەی بۆرۆکراسی گەیشتبوە لوتکە، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا، بە باوەڕی ڤێبەر بە درێژایی مێژوو، هیچ کاتێك پەرلەمانسالاریی نەیتوانیوە بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەکاندا زاڵ ببێت. ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی چاخی مۆدێرنێتەو لەوێدا بۆرۆکراسی وەکو پێکهاتەیەکی چارەنووس سازو ئاڕاستەکەر، دەست دەخاتە نێو بڕیارەکانی ئێمە لە چوارچێوەی زانست و تەکنیکدا. بە باوەڕی ڤێبەر، بە شێوەیەکی گشتی، تایبەتمەندیەتی دەوڵەتی مۆدێرن، بۆرۆکراتی بوونیەتی. ڤێبەر لەم بارەیەوە ئاماژە بە دوو جۆر دامەزراویی ئیداری دەکات: پێکهاتەی فیوداڵ و پێکهاتەی دەوڵەتی مۆدێرن. بە باوەڕی ڤێبەر، ئەو خاڵەی لەمەڕ پەی بردن بە سیاسەت گرنگ و جێگەی بایەخە، هەمان بۆرۆکراتیزەبوونی دەوڵەتە. تایبەتمەندیەتی سەرەکی ئەو دەوڵەتەش "لەبەرچاو نەگرتن و فەرامۆش کردنی عیشق و ڕقە" و دورکەوتنەوەی زیاترە لە هەست و سۆزە مرۆییەکان. خاڵێکی گرنگی تر، قسەکردن لەسەر ڕێکوپێکی سودوەرگرتن لە تەکنیکەکان، بەڵام ڤێبەر پێکهاتەی دامەزراوەکان بە چارەنووسساز دەزانێت و لەو باوەڕەدایە کە مرۆڤەکان مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان نیە، هەر لەم بارەیەوە دەڵێت ***"هیچ کەس ناتوانێت لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، هۆکاری دەستنیشانکەر بێت، بەڵکو گرفتاری کۆمەڵێك هۆکارە کە لە ژێر دەسەڵاتی پێکهاتەی بۆرۆکراتیدایە"***.

ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە کە ڤێبەر چ کەسێك نیە. ئەو هەرگیز تیۆریستێکی بۆرۆکراسی نیە، بە پێچەوانەوە، ڕەخنەگرێکی جیدی پێکهاتەی بۆرۆکراتیە لە سەردەمی مۆدێرنێتەدا

یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی دەوڵەتی مۆدێرن، پەیوەندی پەرلەمانسالاریی یان بە واتایەکی تر بۆرۆکراتی بوونی پێکهاتەی سیاسی کە ئاوێتەی ئەقڵانیەتی مەبەستدار بوەو ئەو پێکهاتە بۆرۆکراتیەش بەسەر رەوتی بریاردانی سیاسیدا زاڵ بوە. ڤێبەر لەو باوەڕەدایە، ئامانجەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتی مۆدێرندا، هیچ پێگەیەکی دیاریکراویان نیەو بە واتایەکی تر، هاوکات لەگەڵ بۆرۆکراتیزە بوون، بەهاکانیش لەناودەچن. بە باوەڕی ڤیبەر، دامەزراوە حیزبیەکان، بە تەنها پێگەیی بەدەستهێنانی دەسەڵاتی ئەکتەرە سیاسیەکانە. گەرنا، نە مەبەست و ئامانجێك لە ئارادایە، بۆ دواکەوتنی و نە لە ڕێگەی حیزبایەتیشەوە هۆکارە دەستنیشانکەرەکان، دیاریدەکرێن. مانای پارتەکان زۆر بە خەستی بۆرۆکراتیزە بوون و ئەقڵانیەتی مەبەستدار بە سەر پارتەکاندا زاڵ بوە. ڤێبەر بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجە سیاسیەکانی ئەڵمانیاو ئەمریکاو بەریتانیایی ئەو سەردەمە دەڵێت؛ ئەکتەرو ڕابەرەکانی پارتە گەورەکان، فریوکارە گەورەکانن.

ڤێبەر لەو باوەڕەدایە، لە پێکهاتەی سیاسی مۆدێرندا کە بە تەواوەتی ئامانجگەرایی فەرامۆشکردوە و سود لە ئەقڵانیەتی مەبەستدار وەردەگرێ، بە تەنها دەسەڵاتگەرایی زاڵ دەبێت. هەر لەم میانەیشدا، چەمکی کاریزما لە کۆمەڵە وتارەکانی ڤێبەردا، پێگەی خۆی دەدۆزێتەوە. ڤێبەر، چەمکی کاریزما بۆ ڕابەرە شازەکان یاخود بۆ ڕابەرە خاوەن هێزەکان (هێز نەوەکو بە مانای زۆر) بەکاردەهێنێ.

بە باوەڕی ڤیبەر، وشەی کاریزما، پانتایەکی زۆر بەرفراوانی لەخۆگرتوە. یەکێك لە جۆرەکانی کاریزما، کاریزمای شۆڕشگێڕانەیە. شۆڕشگێڕانە بوونی کاریزما هەم دەتوانێ دژی سیستمی سونەتی بێت هەم زیندوکەرەوەی سونەتە فەرامۆشکراوەکان. بە هەمان شێوە، ئەو چەمکە دەتوانێت دژی ئەقڵانیەتی مەبەستدار، ڕابوەستێ. بە باوەڕی ڤێبەر، لەبەرچاوگرتنی چوار جۆرەکەی ڕەفتاری مرۆیی، کاریزما سێ دۆخی ڕەفتاریی لەخۆدەگرێت. بە واتایەکی تر، سەرچاوەی ڕابەرایەتی کاریزما، ڕەنگە بە تەواوەتی بەهادار نەبێت. مانای، تاکەکانی کۆمەڵگایەك بە پێی باوەڕە بەهادارەکانی خۆیان، تاکێك بە ڕابەریی کاریزمایی قبوڵ دەکەن. یاخود ئەم هەڵبژاردنە، بە تەنها هەڵبژاردنێکی سۆزدارانەیە. مانای، بە تەنها سۆزو هەست بە بنەڕەت دادەنرێ‌و بەهاکان لەبەرچاو ناگیرێن. بەڵام بە باوەڕی ڤێبەر، دۆخێکی سێیەمیش لە ئارادایە کە لە ڕووی بەهادارانەوە زۆر ئاستەمە، کەواتە، دۆخی سێیەم لە نێوان بەهاو سۆزدایە. کەواتە دەتوانین ئەو ڕابەرە کاریزماییانە بدۆزینەوە کە هەم بە هۆی هۆکارە بەهادارانەکان و هەم بە هۆی هۆکارە سۆزداریەکانەوە، پەیڕەوییان لێدەکرێ.

بە باوەڕی ڤیبەر، وشەی کاریزما، پانتایەکی زۆر بەرفراوانی لەخۆگرتوە

ڤێبەر دەڵێت؛ ڕەنگە ڕابەرە کاریزماییەکان، لە چاخی مۆدێرندا دژی پێکهاتەی بۆرۆکراتیك، شۆڕش بکەن، ڕابەرە شۆڕشگێڕەکان، لە جۆری ڕابەرە کاریزماییەکانن. هەر لەم میانەیەشدا، ئەو تایبەتمەندیە گشتیەی لە نێوان مەزهەبیو کاریزمادا تەرح دەکرێت، بە بەرکەوتنی لەگەڵ مۆدێرنێتەدا، ئاشکرا دەبێت. بەڵام لە سەردەمی ڤێبەردا ئەو جۆرە مۆدێلانە زۆر بەرفراوان بوون وەکو نمونەی لۆتەرو کەلڤێن.

به بۆچوونی ڤێبەر، ڕوویەکی زۆر گرنگی تری سیاسەتی مۆدێرن، هاوتاییو تەواوکەریی نێوان دەوڵەتی مۆدێرن و سەرمایەدارییە. مانای، ڤێبەر لەو باوەڕەدایە، کە دەوڵەتی مۆدێرن و سەرمایەداری پێکەوە، بۆرۆکراتیزە دەبن. سەرمایەداری بە پێچەوانەی ئەو شتەی لە تیۆریی ئابوری ئازادو لە پێکهاتنی فۆرمی سەرمایەداریدا، تەرح کراوە، هێدی هێدی مانا ڕاستەقینەکەی خۆی دەدۆڕێنێو فۆرمی دامەزراوە زۆر گەورەکان بە خۆوە دەگرێت و دوچاری هەمان ئەو گرفتانە دەبێ کە سەرجەم پێکهاتەکانی بۆرۆکراتی دوچاری بوون. ئەمەش لە کاتێکدایە کە سەرمایەداریی ناتوانێت، بەهاکان لەخۆ بگرێت. مانای، لەبەر هەندێ هۆکار سەرمایەداری، ئامانجەکان ڕەت دەکاتەوەو دەوڵەتی مۆدێرنیش لەبەر هەندێ هۆکاری تر. کەواتە بە باوەڕی ڤێبەر، مرۆڤی مۆدێرن لە ئابورییو سیاسەت و فەرهەنگدا بە شێوەیەکی تایبەتی لە داوی قەفەسێکی ئاسنین-دا گرفتار دەبێ.

یەکێکی تر لە باسە گرنگەکانی ڤێبەر، پەیوەندی نێوان ئەخلاق و سیاسەتە. ڤێبەر ئاماژە بە دوو جۆر لە ئەخلاق دەکات، یەکێکیان ئەخلاقی باوەڕدارانەو ئەوی تریان ئەخلاقی بەرپرسانە. ئەم ڕیزبەندیە لە تیۆرییەکانی ڤێبەرەوە لەمەڕ سیاسەت و ئەخلاق، سەرچاوە دەگرێت. مەبەستی ڤێبەر لە ئەخلاقی باوەڕدارانە؛ باوەڕە ئاینیو ئیمانیەکانە بە مانا گشتیەکەیان و عەشق و چاکەکاریی لە تایبەتمەندیە بەرجەستەکانی ئەو چەمکەیە. لە لایەکی ترەوە، ئەخلاقی بەرپرسانە بەم شێوەیە پێناسە دەکات: هەستی بەرپرسیاریەتی لە بەرامبەر ئەنجامی کارەکان. ڕەنگە لێرەدا پرسیارێك قوت بێتەوە کە بۆچی ڤێبەر لە چوارچێوەی ئەخلاقدا، ئەو وشەیە بەو مانایە بەکاردەهێنێ. لەم میانەیەدا قسەکردن لەسەر بەرپرسیاریەتیو ئەخلاق دێتەپێش. بەوەی بۆچی ڤێبەر، گرفتی بنەڕەتی لە چوارچێوەی ئەو جۆرە لە ئەخلاقەدا ئەوەیە کە دەوڵەتەکان بە شێوەیەکی هەڵە سود لە هێز وەردەگرن. کەواتە بە باوەڕی ڤێبەر، ناتەبایی نێوان ئەخلاق و سیاسەت ئەوە نیە کە لە ناوەرۆکدا گشتگیر

به بۆچوونی ڤێبەر، ڕوویەکی زۆر گرنگی تری سیاسەتی مۆدێرن، هاوتاییو تەواوکەریی نێوان دەوڵەتی مۆدێرن و سەرمایەدارییە

نین. ئەو لەو باوەڕەدایە کە ئامادەبوونی ئەخلاق لەسەر بنەڕەتی ئیمان وەکو پێویست دەکات بە مانای ئامادەنەبوونی ئەخلاقی بەرپرسیارانە نیە. لە لایەکی تریشەوە، ئەخلاقی بەرپرسیارانە بە مانای ئامادە نەبوونی ئیمان بەکارناهێنرێت. لە ڕاستیدا، یەکێك لە گەورەترین نیگەرانیەکانی ڤێبەر بنیاتنانی ئاشتیە لە نێوان نیگەرانی ئەخلاقیو سیاسی لە چاخی مۆدێرندا. ڤێبەر سەبارەت بە چارەنووسی ئەم سەردەمە دەڵێت: *" چارەنووسی ئەم سەردەمە کە بە هۆی ئەقڵ گەرایی‌و بە تایبەتی بە هۆی ڕەتکردنەوەو داماڵینی ئەفسونەکانەوە خۆی دیاریدەکات، مرۆڤەکان بەرەو ڕەتکردنەوەی ناسکترین بەها مەزنەکان، ڕادەکێشێ"*. هەر بۆیە ئەم بەهایانە دەچنە خانەی میتافیزیکی تەسەوف یاخود لە داوێنی پەیوەندیە برادەرانە دوو لایەنەکاندا، سوچێك بۆ خەڵوەت هەڵدەبژێرن.

ڤێبەر بۆ وەڵامدانەوەی ئەم قەیرانە دەڵێت؛ تا ئێستا هیچ شتێك بە هۆی هەڵچوون و ئاستی چاوەڕوانی کۆمەڵگاوە نەهاتۆتەدی. دەبێ بە شێوەیەکی تر خۆمان ئامادە بکەین و بە شێوەیەکی تر وەڵامی پێویستیەکانی ڕۆژو پێویستیەکانی ژیانی تایبەتی خۆمان بدەینەوە. کاتێکیش ئەم کارە دەستەبەر دەبێت کە هەر کەسە ئەو دێوەی نێو ناخی بناسێت کە دیلی کردوەو ناچاری کردوە بە ملکەچ کردن و جێبەجێ کردنی فرمانەکان.

ڤێبەر، لە بەرامبەر سەرجەم ئەو هۆکارانەی کە بواری ناسین و لە هەمان کاتدا مافی دەستنیشانکردنی چارەنووسی تاکەکەسی لە مرۆڤەکان ڕەتکردوە؛ ڕەش نیە وەکو دیسپلین لە کۆمەڵگەی مۆدێرن و ئەقلانیەتی مەبەستدارو پێکهاتەی سەرمایەداری و چۆنیەتی دەرونی بوونی ئەو چەمکانە. ئەڵبەتە، ڤێبەر لە وتارەکانیدا، زیاتر قسە بۆ لاوان دەکات و زۆر بە ڕوونی ئاماژە بە هۆکاری ئازادیخوازی دەکات و دەڵێت: تا لاوەکان سەرجەم هۆکارە دەسەڵاتدارەکان بە باشی نەناسن، بواری ڕزگاربوون لەو دۆخە ناهەموارە دەستەبەر نابێت. هەر بۆیە ڤێبەر ڕای دەگەیەنێت کە سەرەتای سەدەی بیستەم، ئاوەڵابوونی جیهانێکی پڕ لە ئاشوب و پەرێشانیەو لەو باوەڕەدایە کە لەو جیهانەدا، لاوەکان، ناتوانن بگەڕێنەوە سەر مانای پێشوو، لەبەرئەوەی شەرعیەتی سەرجەم شتەکان سڕاوەتەوەو هیچ مانایەکیش جێگەی نەگرتوونەتەوە. لەو سەردەمەدا، بۆشایی بەهاکان و بێ وەڵام بوونی پرسیارە دەرونیەکانی مرۆڤ، گرفتێکی سەرەکی لاوەکانی ئەڵمانیاو سەرجەم ئەوروپا بوە.

تا لاوەکان سەرجەم هۆکارە دەسەڵاتدارەکان بە باشی نەناسن، بواری ڕزگاربوون لەو دۆخە ناهەموارە دەستەبەر نابێت

ستراممبێرگی شیکەرەوەی ئەندێشەی کۆمەلایەتی ڕۆژئاوا، سەبارەت بە ڤێبەر دەلێت؛ ڤێبەر بە شێوەیەکی بنەڕەتی دەیویست وەکو کۆمەلناسێکی مێژوویی درك بە چۆنیەتی پێکهاتنی کۆمەلگای ڕۆژئاوا بکات بە سیستمە سەرمایەداریی‌و ئابوریە ئەقلانی‌و بە دەولەتە بەهێزەکەیەوە. لێرەدا جیاوازیەك هەیە لە نێوان ڤێبەرو پەیوەندی بە بیرکردنەوەی هاوچەرخ و مارکس و پەیوەندی بە بیرکردنەوەی هاوچەرخەوە. مارکس، بیرمەندێکی گەشبینە، بە واتایەکی تر، سونەتی ڕۆشنگەری، پەسەند دەکات و لەلای بیرمەندانی ڕۆشنگەری داهاتوو وەکو بەهەشتە لەلای ئیمانداران. مارکس لە چوارچێوەی فیکری خۆیدا، زۆر بە جوانی وێنەی داهاتوو دەکێشێ، بەلام ڤێبەر بە پێچەوانەوە، داهاتوو چ لە ڕووی شێوازو چ لە ڕووی پێشبینیەکانەوە، بە دنیایەك ناودەبات کە ئەگەری دەربازبوون لەو جیهانەدا ئاستەمە. ئەم دوو بیرمەندە، بە هیچ شێوەیەك لە یەك ناچن. بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ڤێبەر بە پێچەوانەی مارکسەوە، سەرمایەداری قبولْ دەکات. هاوکات ڤێبەرو ڕەوتە پێنج قۆناغەکیەکەی مارکس، پەسەند ناکات. بیرمەندانی پۆست مۆدێرنیش بەو ڕەوتە وەکو ڕاستیەکی حاشاهەلنەگر، قایل نین و ڕەخنەی لێدەگرن. یان لە مانایەکی تر لە چوارچێوەی پۆست مۆدێرنیزمدا لە میانەی باسە ئابوریەکانی‌و زیاتر قسە لەسەر تەوەرە پەراوێزو قسە لەسەر دەسەلاتی ناوەندە بەسەر پەڕاوێزدا دەکرێت. تەنانەت لە باسە فەلسەفیەکاندا، بۆ نمونە دیریدا لە باسەکانی هەلوەشاندنەوەی پێکهاتەکاندا دەلێت؛ ئەو چەمکەی لە واقیعدا پەراوێز دەکەوێ، هەرگیز ناکەوێتە بەر سەرنج و قسە لەسەرکردن. هەروەها، فۆکۆ لە چوارچێوەی ئەو باسانەی سەبارەت بە ڕەوتی ئەندێشە پێشکەشی دەکات، دەلێت؛ هەندێ جار گرنگی بەو بیروبۆچوونانە دەدرێت کە لە تەوەرەو ناوەندی باسەکاندان یاخود هۆکارێکی هێزیان لەخۆگرتوە، بەلام لەبەر ئەم بیروڕایە، زۆربەی تەوژم و بیروباوەڕەکان دامرکانەوەو کەوتنە پەراوێزەوەو هیچ کاتێك نەیانتوانی لە ڕەوتی مێژودا پێگەیەك بۆ خۆیان بنیات بنێن. هەر لەم میانەیەدا، بیرمەندانی پۆست مۆدێرن، پەیوەندی ناوەند یاخود پەیوەندی چەمکی سەرمایەداری ڕۆژئاوایی لە تەك ولاتە پەڕاوێزو جیهانی سێیەمیەکاندا، بە پەیوەندیەکی دەسەلاتگەرایانە ناودەبن و لەو باوەڕەدان کە پێویست ناکات سەرجەم ولاتانی جیهان، ئەزمونەکەی ڕۆژئاوا تاقی بکەنەوە. هەر بەم پێیە، ڤێبەر تێڕوانینی ڕۆشنگەریانەی مارکس، بە ڕاست نازانێت. لە لایەکی ترەوە، ڤێبەر ئەم ڕەوتە مێژووییە وەکو

ڕەوتێکی ڕوو لە داهاتویەکی گەش، نابینێتەوە. یاخود بە واتایەکی تر، ڤێبەر لەو باوەڕەدایە قسەکردن لەسەر پێشکەوتن، قسەکردنێکە بە ناچاریی. ڤێبەر پێشبینی بۆرۆکراتیزە بوون و سەرهەڵدانی قەفەسی ئاسنینی کرد، کە مرۆڤەکان لە دنیای مۆدێرندا دوچارو گرفتاری دەبن. بە باوەڕی ڤێبەر، ڕیزبەندی کارو پیشەو ڕیزبەندی بۆرۆکراسی ئەقڵانی بوون کارایی، پەیوەندی بە ڕەهەندەکانی ئۆرگانیزەکردنی کۆمەڵایەتیەوە هەیەو هیچ پەیوەندیەکی بە خاوەنداریەتیو دەسەڵاتی دەوڵەت یا کۆمپانیا گەروەکانەوە نیە. یان بە مانایەکی تر، ڤێبەر هەر لە سەرەتاوە ئەو سیستمەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ئابوری سەرمایەدارییو بەرژەوەندی تاکەکەسیو لەژێر دەسەڵاتی کۆمپانیا گەورەکاندایەو هەروەها ئەو سیستمە سیاسیەی کە تێیدا، هێند لەژێر دەستی دەوڵەتدایە، وەکو یەك دەبێت و ئەو دوو سیستمە بە دوو جۆری کۆمەڵگەی مۆدێرن دەزانێت.

تەورێکی باسەکانی ڤێبەر، قسەکردنە لەسەر دیسپلین و بە باوەڕی ڤێبەر ئەم باسە زۆر گرنگ و حەساسە. ئەو لەو باوەڕەدایە، کە هیچ کام لە سەردەمەکانی مێژوی مرۆڤایەتی، نەیتوانیوە هێندەی سەردەمی مۆدێرن وا بە ئاسانی تاکەکان ناچار بە ملکەچی بکات. یان بە واتایەکی تر، لە سەردەمی مۆدێرنێتەدا، ملکەچیو جێبەجێکردنی فرمانەکان دەبێتە چەمکێکی دەرونیو تاکەکان ئەوە قبوڵ دەکەن کە ناچارن ملکەچ بن و فرمانەکان جێبەجێ بکەن یاخود بەبێ ئاگاییەوە ملکەچ دەبن. کەواتە مەبەستی ڤێبەر سەبارەت بە دیسپلین، عادەتی تاکەکانە بە ملکەچ کردن و جێبەجێکردنی فرمانەکان. جۆرەکانی ئەم ملکەچیە لە سوپاو ئابوریو ڕۆشنبیریداو بە شێوەیەکی گشتی لە پانتایی ژیانی ڕۆژانەدا، بوونی هەیە. دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە لە سەردەمی پێش مۆدێرنێتەدا، ژیانی کۆمەڵایەتی لە ئاستە جیاوازەکاندا گەلێك ڕەنگینتر و ئاڵو واڵاتر بووە. تەنانەت لە کۆمەڵگایەکی هاوبەشدا، شێوازی ژیانی جۆراوجۆر بووە، بەڵام لە سەردەمی مۆدێرنێتەدا، هاوکات لەگەڵ تێپەڕینی مێژوو، سەرجەم تاکەکان بە یەك شێوە ڕەفتار دەکەن. کەواتە دەستەمۆکردنی تاکەکان، یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی سەردەمی مۆدێرنێتە. بە وتەی ڤێبەر؛ ئابوریەکی ئەقڵانی، ئۆرگانێکی کرداریەو بە پێی نرخی دراوەکان بە پێی چوارچێوەی، دژایەتی بەرژەوەندی مرۆڤەکان لە بازاڕدا خۆی دەستنیشان دەکات.

بە باوەڕی ڤێبەر، دراو، دابڕاوترین و نا تاکەکەسی ترین هۆکاری ژیانی مرۆڤایەتیە. بەو مانایەی، کە پەیوەندی مرۆڤەکان دیاریدەکات و هاوکات هیچ جۆرە

ڕوخسارێکی مرۆیی لەخۆ نەگرتوە. هەندێ کەس لەو باوەڕەدان کە دراو، تەنها وەسیلەیە، بەڵام ڤێبەر لە سەرو ئەم باوەڕوە قسەدەکات و دەڵێت؛ کاتێك بە شتێك دەوترێت وەسیلە کە لەژێر دەستی مرۆڤدا بێت، بەڵام ئەودەمەی مرۆڤ دەچێتە ژێردەستی ئەو شتەوە، چیتر وەسیلە نیە. نیگەرانی ڤێبەرو زیمبلْ لەوەدا بوو، کە لە چوارچێوەی ئابوری سەرمایەداریدا، دراو، پەیوەندی مرۆڤەکان دەستنیشان دەکات. کەواتە هۆکارێکی نامرۆیی، جۆری پەیوەندی مرۆڤەکان، دیاریدەکات.

## ئەنجام

به کورتی، مەبەستی ڤێبەر ئەوەیە کە سەردەمی مۆدێرن و ئابوری سەرمایەداری، لە توانایدا نیە مرۆڤەکان ڕزگاربکات و دەبێ بە دوای چارەسەرێکی تردا بگەڕێین. ڤێبەر باس لە گەڕانەوە ناکات بۆ ڕابردوو، یان گەڕانەوە بۆ پێکهاتەی کەنیسەیی، بەڵکو باس لە ئەخلاق و ئاین دەکات. ڤێبەر، ئەو بیرمەندەیە کە بە نیگەرانیەکانی سەردەمی خۆیەوە لە دوی ڕێگەچارەیەکی نوێ دەگەڕێ، ڤێبەر لەو باوەڕەدایە، گەر بەهاکان زیندووبکرێنەوە، دەکرێت ژیانی مرۆڤایەتی لەو دۆخەی تێی کەوتووە، ڕزگاربێت. لێرەدا، مەبەستی ڤێبەر لە بەهاکان، هەمان نیگەرانیەکانی هابرماسە. هابرماس دەڵێت؛ گەر بمانەوێت یاساو ئەخلاق و میکانیزمی ژیانی خۆمان دەستنیشان بکەین و لەدەست دەسەڵاتداریەتی سەرمایەداریی‌و ئەقڵانیەتی مەبەستدار، ڕزگارمان بێت، پێویستە پەنا بۆ وتووێژی ئەخلاقەکان ببەین. بەو مانایەی کە مرۆڤەکان، گەلێك بونەوەری ئاقڵن، بەڵام گەر ملکەچی بەرژەوەندیە تاکە کەسی و ئەقڵانیەتی تاکەکەسی بن، ئەوکات ئازادی مانای نامێنێت و لەناو دەچێ. کەواتە، هەرچەندە مرۆڤەکان لە خۆیاندا گەلێك بونەوەری ئاقڵن، بەڵام دەبێ ڕوبەڕوی یەکتر بکرێنەوە تا پەیوەندیەك لە نێوانیاندا بنیات بنرێ‌و بتوانن بنەڕەتە بەهادارەکان بدۆزنەوە. یان بە واتایەکی تر، گەر شتێك لە ڕێگەی وتووێژی بە کۆمەڵەوە، پەسەندکرا، دەکرێت بنەڕەتی میکانیزمی ژیانی بە کۆمەڵ بێت. بەڵام ڤێبەر لەو باوەڕەدایە کە دراوو هێز ئەو ڕێگرە سەرەکیانەن، کە ناهێڵن مرۆڤەکان بەبێ هەر جۆرە دەسەڵاتگەرییەك، لە نێوان خۆماندا پەیوەندی دروست بکەن و پێکەوە ڕێگەیەکی ڕاست بدۆزنەوە.

به کورتی، مەبەستی ڤێبەر ئەوەیە کە سەردەمی مۆدێرن و ئابوری سەرمایەداری، لە توانایدا نیە مرۆڤەکان ڕزگاربکات و دەبێ بە دوای چارەسەرێکی تردا بگەڕێین

لە كۆتاییدا لەمەڕ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی كە؛ ڤێبەر كێ نیە، دەتوانین بڵێین: ڤێبەر كەسێك نیە كە رۆژئاوا بە تەوەرەو ناوەند بزانێت، تاكگەرا نیە، بە تەنها رەسەنیەت نابەخشێتە فەرهەنگ، لیبراڵ و بۆرژوا نیەو هەرگیز ئەقڵانیەتی مەبەستدار پەسەند ناكات و هاوكات دژی ئەقڵانیەت نیە.

## پرسیارو وەڵام

***ڤێبەر ئامۆژگاریمان دەكات، بۆ رووبەڕووبونەوەی پیلانەكانی مۆدێرنێتە سود لە هەستی ئازادیخوازی وەربگرین، ئەمەش رستەیەكی پێغەمبەرانەیەو هاوكات ڤێبەر كۆمەڵناسیشەو بە دوای رێگەچارەدا دەگەڕێ. لەم میانەیەدا، چۆن دەتوانین لە مۆدێرنێتە رزگارمان بێت؟ لە ئەنجامدا، گەلێك بڕیاری سەپێنراو هەیەو تاكە مەرجیش بۆ راكراتیزەبوونە.***

+ڤێبەر گرفتی لەگەڵ خودی ئەو ئەگەرانەدا هەیە. یان بە واتایەكی تر سەرچاوەی ئەو ئەگەرە لە كوێوە هەڵدەقوڵێ. ئەوكاتەی ڤێبەر ئاماژە بەوە دەكات كە زانستی مۆدێرن گەلێك ئەگەری لەخۆگرتوە دەڵێت؛ هەر ئەوەندەی باوەڕ بەوە بكەین كە زانست دەتوانێ وەڵامی گرفتەكانی مرۆڤ بداتەوە، ئەمە ئەگەرێكی بەهادارانەیە، بەڵا م ئایا چ كەسێك بانگەشەی ئەمە دەكات؟ ئەمە بۆ خۆی بابەتێكی بەهادارانەیە گرفتی ڤێبەر ئەوەیە؛ پاش پێكهاتنی پارتەكان لە دوای كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەو سەرەتاكانی سەدەی بیست، لە جیهانی مۆدێرن و لە وڵاتە ئەوروپیەكاندا، درزو مەودایەكی زۆر كەوتۆتە نێوان رابەرو ئەندامان و پارتەكان. ڤێبەر لەو باوەڕەدایە كە بە شێوەیەكی گشتی رابەرە حیزبیەكان درۆزن و فریوكارە دەچوون. یان بە واتایەكی تر، رابەری پارتەكان، ماناكان و خەڵكی پێكەوە گرێ دەدەن، بەڵام ئەمە بۆ دابینكردنی ویستی خەڵكی نیەو تەنها بۆ بە دەستهێنانی هێزو داگیركردنی پێگەی حیزبەكانی ترە. ئەوكات، بۆرۆكراتیزە بوونی حیزبی بریتیە لە؛ دەسەڵاتداریەتی دامەزراوێكی پەرلەمانسالاریی كە لەو چوارچێوەیەدا، دەسەڵات و میكانیزمی دەسەڵات لە پێگەكانی سەرەوە بەرەو خوارەوە پیادە دەكرێت. هەر لەم میانەیەدا، ڤێبەر لەو باوەڕەدایە كە نابێ حیزب وەكو دەستگایەكی ئیداری رەفتاربكات، بەڵكو دەبێ حیزب ئاراستەكەرو دابینكەری ویستی بەشێك لە كۆمەڵ بێ. بەڵام ڤێبەر سەرباری قسەكردن لەسەر گرفتەكانی حیزب، بۆ خۆی كەسایەتیەكی چالاكی سیاسیە. ڤێبەر، یەكێكە لە دانسقەترین ئەو بیرمەندە رۆژئاواییانەی كە تا كۆتایی ژیانی، لە پێناوی بیروباوەڕە

بۆرۆكراتیزە بوونی حیزبی بریتیە لە؛ دەسەڵاتداریەتی دامەزراوێكی پەرلەمانسالاریی كە لەو چوارچێوەیەدا، دەسەڵات و میكانیزمی دەسەڵات لە پێگەكانی سەرەوە بەرەو خوارەوە پیادە دەكرێت

سیاسیەکانی خۆیدا، خەباتی کردوە. بۆ نمونە؛ پاڵپشتی زیمبلی جولەکە دەکات، لەوپەڕی سەردەمی دژایەتی کردنی جولەکەدا.

***ئەگەر ڤێبەر، چارەسەرێکی دەستنیشان کردوە، ئایا دەبێ وەکو بیرمەندێك ئـەو چارەسـەرەی قبوڵ بکەین یاخود تەنها وەکو نیگەرانیەکی دەرونی، ئەو ڕێگا چارەیە دەستنیشان بکەین؟***

لە چوارچێوەی ئەو زانستەدا کە مرۆڤ هەیەتی، بە مانا گشتیەکەی، دوا قسە، سەرەتا نەوتراوە. یەکێك لە هۆکارەکانی بەرفراوانی و ڕەسەنیەتی هزرمەندی لە ڕۆژئاوادا، ئەوەیە کە هەر بیرمەندەو سود لەو ناکۆکیو دژایەتیانە وەردەگرێت کە ڕوبەڕوی دەکرێتەوەو لە ڕێگەی ئەو ناکۆکیانەوە خۆی پەروەردە دەکات. کەواتە، ڤێبەریش سودی لە گشت چەمکەکانی سەردەمی خۆیو سودی لە پێشینە هزریەکان وەرگرتوەو هەنگاوێکی زیاتری ناوە. هەر بەو پێیە، ئێستاکە، ئەندێشەی هابرماسی کە زیندو کەرەوەی جۆرێکی تایبەتی ئەندێشەی مۆدێرنە (لە میانەی قسەکردنی لەسەر هزرمەندی، ئەقڵی بە کۆمەڵ لە باتی ئەقڵی تاکەکەسی، دادەنێ) و هەم ئەندێشەمەندانی پۆست مۆدێرن کە دژی مۆدێرنێتە ڕاوەستاون، هەر لایەنەیان ڕوویەکی ئەندێشەی ڤێبەریان هەڵبژاردوەو ڕێگەچارە دەست نیشان دەکەن.

***ئایا مرۆڤی ئەم سەردەمەو بە تایبەتی مرۆڤەکانی وڵاتە خۆرهەڵاتیەکان، چۆن دەتوانن ڕێگەی دروست هەڵبژێرن؟ و ئەرکی ئێمە لە چوارچێوەی ئەو ژیانەی کە بۆ ئازادی مۆدێرنێتە، بنیاتمان ناوە، چیە؟***

لە چوارچێوەی ئەو بابەتانەی لە کۆمەڵگەی خۆماندا پەیڕەو دەکرێن، گرنگی بەهەر دوو جۆرەکەی ئەقڵانیەت نەدراوەو ئەمەش لە ڕوانگەی ڤێبەرەوە، جێگەی نیگەرانیە، یان بە واتایەکی تر، ئێمە باس لە جێبەجێکردنی ئەقڵانیەت دەکەین، لە کاتێکدا کە ئەقڵانیەت بۆ خۆی لەلای ئێمە ساغ نەبۆتەوە. سەرباری ئەمە، ڤێبەر لەم شیکردنەوانەدا تەنها نیە، بەڵکو لە ڕۆژئاوادا، گەلێك ئەزموون ئەنجامدراوە کە زانست گەراییان بە بنەڕەت داناوە، هەر لەو میانەیەدا هەم وەڵامی گرفتەکان دراوەتەوە هەم گرفتی نوێ هاتۆتە ئاراوە، دەبێ بۆ دۆزینەوەی چارەسەرو ڕێگەچارە، هەڵسەنگاندنێکی واقیعبینانە لەمەڕ پەیوەندی هزرمەندی و بارودۆخی مرۆییو

ئەندێشەی هابرماسی کە زیندو کەرەوەی جۆرێکی تایبەتی ئەندێشەی مۆدێرنە (لە میانەی قسەکردنی لەسەر هزرمەندی، ئەقڵی بە کۆمەڵ لە باتی ئەقڵی تاکەکەسی، دادەنێ) و هەم ئەندێشەمەندانی پۆست مۆدێرن کە دژی مۆدێرنێتە ڕاوەستاون، هەر لایەنەیان ڕوویەکی ئەندێشەی ڤێبەریان هەڵبژاردووە ڕێگەچارە دەست نیشان دەکەن

هابرماس لەو باوەڕەدایە ئەو شتەی لەم سەردەمەدا بەناوی مۆدێرنێتەوە ناسراوە لەتەك ئەو شتەی بڕیار بوو مۆدێرنێتە بێت، یەك ناگرێتەوە

کۆمەلایەتی، ئەنجام بدەین. ڤێبەر یارمەتیمان دەدات، زۆر باشتر، ڕووی ڕۆژئاواو ئەو باسانە ببینین کە پەیوەندی ئەقڵ گەرایی و مۆدێرنێتە، ئاشکرا دەکەن.

*بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێناسە جیاوازانەی مۆدێرنێتە، لەوانەش ئەو پێناسەیەی کە مۆدێرنێتە سیستمێکی دەسەلات نیە بەڵکو ئەندێشەیەکە لەسەر بنەڕەتی بیروباوەڕەکان، مۆدێرنێتە دەتوانێت هەم ڕەخنە لە سونەت بگرێ هەم لە خۆی، کەواتە مۆدێرنێتە تەوژم و ڕەوتە. لێرەدا مەبەست لە مۆدێرنێتە چیە؟ گەر مۆدێرنێتە لە سەردەمی خۆیدا، ڕەخنەی لە سونەت گرتووە، ڕەنگە لە سەردەمێکدا ئەنجامی ئەو مۆدێرنیزەیە بە مانای دەسەلاتداریی سەرمایەداری گوزارشتی لێبکرێ. بەلام گەر مۆدێرنێتە ڕەخنە لە خۆی بگرێ، ئەوکات پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا دەتوانێت پێناسەیەکی دیاریکراو لەمەڕ ئەو چەمکانەی کە پێشکەشیان دەکات، بدات بە دەستەوە؟*

زۆر قورسە پێشوەخت پێناسەیەك لەمەڕ مۆدێرنێتە لە ئارادا بووبێ. خودی وشەی مۆدێرنێتە ڕوبەڕوی وشەی کۆن دەبێتەوەو سەرەتا وەکو سەبکێکی ئەدەبی دەرکەوتوە. هەر لە بنەڕەتدا، سەرچاوەی ئەو وشەیە ئەوەیە کە شێوازو سەبکێکی ئەدەبی نوێ ڕوبەڕوی شێوازە ئەدەبیە کۆنەکان دەبێتەوە، بەلام بەو پێیە، دەستنیشانکردنی خالی دەستپێکردنی سەبارەت بەو بابەتانەی پەیوەندی بە مێژووەوە هەیە، کارێکی ئاسان نیە. بۆ نمونە؛ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، دەکرێت گەلێك بیرمەندو باسە جیاوازەکانی ئەو سەردەمە بە خالی دەستپێکردنی ئەو چەمکە بزانین بەلام ئەمە لەمەڕ سەردەمی ڕێنیسانسیش ڕاست دەنوێنێ. لە لایەکی تریشەوە هەندێك کەس خالی دەستپێکی ئەو چەمکە دەبەستنەوە بە سەرهەڵدانی (پرۆتستانتیزم)ەوە. هاوکات لە بنەڕەتدا سەردەمی ڕۆشنگەریی‌و هەرسێ چەمکی هزرمەندی و گەشەسەندن و سروشت بە خالی دەستپێك و تایبەتمەندێکی مۆدێرنێتە دەزانرێت. گەر لەو باوەڕەدا بین مۆدێرنێتە بواری ڕەخنە لەخۆگرتن دەستەبەر دەکات کەواتە باوەڕمان بە هابرماس هەیە، لەبەرئەوەی هابرماس لەو باوەڕەدایە کە بڕیار وابوو، مۆدێرنێتە مرۆڤ لە ژێر هەموو دەستەلاتەکان ڕزگار بکات. یان دەڵێت؛ مۆدێرنێتە پرۆژەیەکی ناتەواوەو لەو باوەڕەدایە ئەو چەمکە دژی خۆی کاردەکات. بە واتایەکی تر، هابرماس لەو باوەڕەدایە ئەو شتەی لەم سەردەمەدا بەناوی مۆدێرنێتەوە ناسراوە لەتەك ئەو شتەی بڕیار بوو مۆدێرنێتە بێت، یەك ناگرێتەوە هەر لەبەرئەمەش لەو باوەڕەدایە، گەر مۆدێرنیتە بە ئاراستەی ڕاستەقینەی خۆیدا بڕۆشتایە، ڕزگاری مرۆڤی دەستەبەر دەکرد.

هەندێك كەس لەو باوەڕەدان كە مۆدێرنێتە مۆدێلی جیاوازی نیە، بەو مانایەی ڕەنگە لە هەندێك دۆخی تایبەتیدا مۆدێرنێتە بە شێوەیەكی جیاواز كاربكات، بەڵام تاكە جیاوازی لەو چوارچێوەیەدا ئەوەیە كە بڕیارە ئەقڵ لە خزمەتی ڕزگاربووندا بێت، بەڵام بە باوەڕی ڕەخنەگرەكان مۆدێرنێتە لە خزمەتی دیلیو ژێردەستەیی مرۆڤدایە.

مۆدێرنێتە ئەزمونێكی ئاشكرایە لە چوارچێوەی ئابوریو سیاسیدا. پەیوەندی مۆدێرنێتەو سونەت گەلێك باس هەڵدەگرێت. بۆ نمونە: ئەندێشەی مۆدێرن بە مانا هابرماسییەكەی یاخود بەو مانایەی كە تالكۆت و پارسڤێنس و داینل لێرنێرن لە چوارچێوەی جیهانی سێیەم و لە زەمینەی ئابوریو فەرهەنگ و پەروەردەو فێركردندا، پێشكەشی دەكەن، ڕووبەڕووی گەلێك ڕەخنەی جیدی كرایەوە. زۆر كەس لەو باوەڕەدان كە بڕیار بوو لە دنیای مۆدێرندا، خزمایەتی یاخود حكومەتە خێزانیەكان دەسەڵات نەگرنە دەست. هەروەها ئەو باوەڕە ئاینیانەی كە هەمیشە دەسەڵاتیان هەبوە یاخود ئەو كەسانەی كە وەكو هێمایەكی كۆمەڵایەتی لە ئارادا بوون نەبنە خاوەن دەسەڵات. بەڵام گەلێك ئامار لەبەردەستدایە كە پێچەوانەی ئەو باوەڕانەیە. لە لایەكی ترەوە لە دنیای مۆدێرندا، ژمارەیەك لە باوەڕەكان دەبنە سونەت و دەبێ پەیڕەویان لێبكرێ. یان دەتوانین ئاماژە بەوە بكەین كە لە دنیای مۆدێرندا جەخت لەسەر سونەتەكان دەكرێتەوە. بۆ نمونە، تا ئێستاش لە بەرتیانیا، هاوڵاتیان دژی هەڵكەندنی پێكهاتەی پاشایەتین. هەرچەندە بیانووی ئەمە لەوەی كە لەبەر هەندێك هۆكاری ئابوری ئەو بنەڕەتانە وەكو خۆیان ماونەتەوە. لەبەرئەوەی، مانەوەی پێكهاتەی پاشایەتی، بۆ خۆی هۆكاری پەرەسەندنی گەشت و گوزارە، یان بە واتایەكی تر لە ئابوری سەرمایەداریدا، سود لە هۆكارێكی سونەتی وەردەگیرێت. كە ئەمە كردارێكی ئەقڵانی نیە. هەروەها لە ئەمەریكا، هەستە مەزهەبیو باوەڕە ئاینیەكان هۆكارێكی دەستنیشانكەرە لە ژیانی سیاسیو كۆمەڵایەتی ئەو وڵاتەدا هەشت ساڵ سەرۆك كۆماری ڕێگن- و خۆشەویستی گەلی ئەمریكا بۆ ئەو سەرۆك كۆمارە، ڕیشەی سونەتی هەیە.

***ماكس ڤێبەر، تیۆری بۆرۆكراسی دانەڕشتوە، یاخود بە واتایەكی تر، چوارچێوەی ئەو تیۆریەی دانەڕشتوە، ئەمەش لە كاتێكدایە كە لە میانەی Public administvation دا ڤێبەر بە بنیاتنەرو داڕێژەری ئەو چەمكە دەناسن؟***

ماکس ڤێبەر، شێوەی پێکهاتەی بۆرۆکراسی شیکردەوە. بەڵام زۆرکەس ئەوە لەبەرچاو ناگرن کە لە ڕوانگەی ڤێبەرەوە ئەوە چ مانایەك دەگەیێنێ. سەرەتا زۆر بە باشی، بۆرۆکراتی لێکداوەتەوە، دواتر ماناو زیادەڕۆییەکانی ئەو چەمکەی ئاشکرا کردوەو پاشانیش سەرجەم ئەو بابەتانەی شیکردۆتەوە کە لە دوای ئەو چەمکەوە هاتونەتە بوون. بەوپێیە، نیوەی ئەندێشەی ڤێبەر، پێناسەدەکرێت، ئەمەش وەکو ڕستە بەناوبانگەکەی مارکسە کە نیوەی ئەندێشەکەی دەکات، مارکس دەڵێت: مەزهەب ئەفیونی خەڵکیو داهێنانی ستەملێکراوانە، هەر بۆیە پاش مارکس هەرکەس تێریەکانی مارکسی نووسیبێ سودی لە بەشی یەکەم وەرگرتوە. سەبارەت بە ڤێبەریش بەم شێوەیە، ڤێبەر وتویەتی؛ ئەمە برۆکراسیەو دواتریش وتویەتی؛ مرۆڤ تووشی کێشە بوە، بەڵام دەڵێن؛ ڤێبەر تیۆریستی بۆرۆکراسیە.

***وشەی ئیدیال یاخود کەماڵی خوازراو، کە ڤێبەر بە هۆیەوە بۆرۆکراسی پێناسە دەکات، چ مانایەك لەخۆ دەگرێ؟***

بنەڕەتی ئەڵمانی ئەو وشەیە بریتیە لە: ڕانین تیپۆس، ڕانین لە زمانی ئەڵمانیدا بریتیە لە: بێخەوش و خاڵس و تیپۆس بریتیە لە: شێوەو نمونە. بەڵام لە زمانی ژێرمەنیو ئینگلیزیدا بە دوو جۆرو دوو مانا سودی لێوەردەگیرێ، یەکێك لەو مانایانە، مانا ئامانجخوازیەکەیەتی. ماناکەی تریشی، ئایدیایەکی زەینیە، ئەو کاتەی چاوگی *al* ئینگلیزی (زەینی بوون) لەخۆدەگرێ. هەر لەبەر ئەمەیە کە ناتوانین وەکو چەمکێکی جێگیر لە مانای بۆرۆکراسیو سەرمایەدارییو دەوڵەت، بڕوانین. کەواتە کەسی لێکۆڵەرەوە، بە لەبەرچاوگرتنی سەرجەم تایبەمەندیەکانی وتەیەك، مانایەکی گشتی دروستدەکات (ئەو مانایە، مانایەکی زەینیە) کە دەبێتە بنەڕەتێك بۆ خوێندنەوە. بۆ نمونە؛ بە درێژایی مێژوو، بۆرۆکراسی گەلێك شێوەی جیاواز لەخۆدەگرێ، بەڵام ئێمە دەمانەوێت پێناسەیەکی گشتی پێشکەش بکەین، هەمان تیۆری بۆرۆکراسی دەبێتە جۆری زەینی بێخەوشی بۆرۆکراسی کە لە واتایەکی تر بریتیە لە: جۆری دابڕاو زەینی بۆرۆکراسی.

ن: دیدیار ئیریبۆن

# کەرنەڤاڵی پیاوە شێتەکان




لە ئینگلیزیەوە: ئاوات ئەحمەد

کە فۆکۆ بۆ یەکەمجار گەیشتە شەقامی ئۆلْم، جۆرج گوسدۆرف ئوستادی فەلسەفە بوو. گەرچی ئەمڕۆ گۆسدۆرف بە هۆی کارەکانیەوە دەربارەی مێژووی بیری خۆراوا، شۆرەتی هەیە، بەڵام ئەو کاتە هیچ شتێکی وای بڵاو نەکردبۆوە کە قسەی لەسەر بکرێت. گۆرسدرۆف ئالودەی لە سایکۆلۆجیا بوو، بۆیە لە ساڵی *1946– 1947*دا لەگەڵ جۆرج داومیزۆنی برادەریدا، وانەی پێشەکیەکیان ئامادەکرد دەربارەی سایکۆپاتۆلۆجیا[1]. ئەمان بۆیان هەبوو سەردانی نەخۆشەکانی خەستەخانەی سانت ئان بکەن، هەروەها لە پەیمانگای مامۆستایانیشدا، زنجیرەیەك وانە دەوترایەوە، کە نەك تەنیا داومیزۆن، بەڵکو دەروونناسی لە وێنەی لاکان[2] و ئاگوریا گۆراش وانەیان تێدا

دەوتەوە. گۆسدۆرف بۆ سودگەیاندن بە خوێندکاران، لەوەش زیاتر ڕۆیشت. هەموو ساڵێك گروپێکی دەبرد بۆ سەردانی خەستەخانەی سانت ئان لە ناوچەی فلۆری ئۆبریاس، نزیکی ئۆرلیانز، کە دومۆزین بەڕێوەی دەبرد. لەوێ هەفتەیەکیان بەسەر دەبرد بەگوێ گرتن، بۆ ئەو شیکارانەی لە لایەنی دکتۆرەکان و یاریدەدەرەکانیانەوە، دەکران. هەروەها بەناو نەخۆشخانەکەشدا پیاسەیان دەکرد. فلۆری ئۆبریاس، بە خۆی و هەموو بەشەکانیەوە، خزابوونە ناوچەیەکی دارستان و چڕستانەوەو هەموویان بە سەریەکەوە لە زیندان نەدەچون.

کاتێك فۆکۆ، گۆسدرۆفی جێهێشت، ئینجا ئاڵتۆسێر[3]، خوێندکارەکانی دەبرد بۆ سان ئان، لەوێش لە لایەنی دەروونناسێکی دیکەی ناسراوەوە وانەیان پێ وترایەوە، کە هینری ئی بوو. فۆکۆ لە لای داومیزۆن و ئی، هەر زوو پەیوەندی کرد بە شەپۆلی ڕیفۆرمە تازەکانی پزیشکیی ئەقڵیەوە[4]. لەگەڵ خەڵکدا بەشداری کرد لەو گروپ و چاوپێکەوتنانەدا کە ناویان لێنرابوو هەڵسەنگاندنی پزیشکیی دەرونی، کە هەوڵی دەدا سەرلەنوێ بایەخ بداتەوە بە زانین و مەشق و دیسپلینەکانی ئەو زانستە بە سیمایەکی زۆر لیبراڵانەوە. ئەوەی ئەوکاتە دەربارەی پزیشکیی دەرونی بەرچاوی کەوت، هیچ کاریگەریەکی سەرکوتکەرانە یان ئازاردەرانەی نەبوو.

میشیل فۆکۆ، لە یەکەمین ساڵیەوە لە پەیمانگای مامۆستایان، زۆر بە پەرۆشەوە ئارەزووی سایکۆلۆجیای دەکرد، دوای ئەوەی لە زانکۆی سۆربۆن[5] بڕوانامەکەی خۆی لە فەلسەفەدا وەرگرت *1948*، دەستی کرد بە کۆشش بۆ وەرگرتنی بڕوانامەیەکیش لە سایکۆلۆجیادا. بۆیە ئامادەی چەند کۆرسێکی دانیاڵ لاگاش بوو، کە لە کۆلێجی ئاداب، سایکۆلۆجیای گشتی و سایکۆلۆجیای کۆمەڵایەتی دەوتەوە. هەروەها دەبوو چەند کۆرسێکیش وەر بگرێت، کە بۆ وەرگرتنی بڕوانامە لە سایکۆسۆسیۆلۆجیادا، لە کۆلێجی زانستەکان دەوترانەوە. بە هەرحاڵ، لەوێ کەم تێدەکۆشاو لەگەڵ ئاندرێ ڤێرگازو لویس مازاوریکدا تیمێکیان دروست کردبوو، هەرجارەی یەکێکیان دەچوە ناو موحازەرەکەوەو تێبینیەکانی خۆی تۆماردەکرد. لە ساڵی *1949*دا، فۆکۆ لیسانسیش و دیپلۆمێکی تریشی وەرگرت لە پەیمانگای دەرونزانیی پاریس، کە لەو پێناوەدا دیسان لای لاگاش خوێندبووی.

دانیال لاگاش یەکێکە لە ناوە درەوشاوەکانی سایکۆلۆجیا، لە ماوەی دوای جەنگدا. ئەو لە ساڵی *1924*دا لەگەڵ ئارۆن[6]، کانگیلم[7]، نیزان، سارتەردا لە شەقامی ئوڵم خوێندویەتی. ئەگریگاسیۆنی فەلسەفەی وەرگرتوە، بەڵام ڕووی کردۆتە

**سایکۆلۆجیای کلینیکی. ماوەیەکی درێژ لە ستراسبۆرگ دەرسی وتۆتەوە، پێشئەوەی لە ساڵی *1947*دا لە سۆربۆن دابمەزرێت. لەوێ وانەی دەسپێکردنەکەی بە ناوی یەکێتی سایکۆلۆجیاوە بوو، تێیدا هەوڵی دا باس لەوە بکات کە ئاوێتەکردنی دەرونشیکاری لەگەڵ زانستە کلینیکیەکاندا، زیاتر چالاکیان دەکات. وانەکە لەساڵی *1949*دا چاپکرا. هەرلەو ماوەیەشدا کەوتە دەرس وتنەوە لە پەیمانگای دەرونزانی.**

**فۆکۆ بە پەرۆشەوە چوە ناو وانەکانی لاگاشەوە، چونکە سایکۆلۆجیا، ڕێچکەی هەڵبژاردەی خۆی بوو، هەروەها بە تەماش بوو لەسەر خوێندنی پزیشکی بەردەوام بێت. پرسیاری لە لاگاش کرد ئایا بۆئەوەی مرۆ لە سایکۆلۆجیادا درەوشاوە بێت، پێویست دەکات دکتۆرێکی پزیشکیش بێت. پرسیارەکە بە لای لاگاشەوە سەیر نەبوو. دیدیار ئانزیۆ کە ئاڕاستەی خۆی بەرەو دەرونشیکاری بوو، روونی دەکاتەوە: *"لەو کاتەدا زۆرێك لە فەیلەسوفان، کە بەرەو ئاڕاستەی دەرونزانیو پزیشکیی ئەقڵی، یان دەرونشیکاری بایان دەدایەوە، توشی ئەم گرفتە ببوون"* ئانزیۆ لەسەر پزیشکی بەردەوام نەبوو. وا دیارە جان لابلانش یەکێکە لەو خەڵکە کەمانەی کە بەردەوام بوو. فۆکۆش هەر لەو سەرەتایەدا مایەوە، لاگاش ئامۆژگاری کرد پزیشکی نەخوێنێت، وەك چۆن ئامۆژگاری هەر کەسێکی تری دەکرد کە پرسیاری لێ بکردایە. لاگاش بە فۆکۆی وت *"ئەگەر ئێمە لە ئەمریکا بووینایە، دەبوایە بە دڵنیایی پزیشکیشت بخوێندایە، بەڵام لە فەرەنسا وا نیە"* فۆکۆ ویستی سود لەم چاوپێکەوتنە لەگەڵ ئەو گەورە دەرونزانەدا وەربگرێتو دەربارەی گرفتە دەرونیەکانی خۆی پرسیاری لێ بکات، بەڵام لاگاش نەیدەویست لەیەك کاتدا هەم پرۆفیسۆری خوێندکارەکەی بێتو هەم دەرونسازیشی بکات، ئەدرێسی دەرونشیکارێکی تری پێداو ئامۆژگاری کرد سەردانی بکات. دواتر فۆکۆ ماوەیەکی کورت خوو دەداتە مەسەلەکانی ئەقڵ، کە ئەوپەڕەکەی سێ هەفتە دەخایەنێت. ئەمە ئەو پرسیارە بوو کە چەند ساڵێکی داهاتوو لە مێشکی خۆیدا لێکی دەدایەوە: خوو بداتە دەرونشیکاری یان نا؟**

**دوای بەدەستهێنانی ئەگریگاسیۆنیش، فۆکۆ مەشقە زانستیەکانی خۆی ڕانەوەستاند. لە ماوەی ئەو ساڵەدا کە لە دەزگای سایرس بوو، دەستی کرد بە کۆشش بۆ بەدەستهێنانی دیپلۆمێك لە سایکۆپاتۆلۆجیدا، لە پەیمانگای سایکۆلۆجیا، لە ساڵی *1952*دا دیپلۆمەکەی بەدەست هێنا. لە پرۆگرامی خوێندنەکەیدا، چەند کۆرسێك هەبوو لەگەڵ پرۆفیسۆر پۆیەرو دیلایدا، هەروەها لە نێوانی شتەکانی**

تریشدا چەند *زانیاریەك دەربارەی عەیادە* لەگەڵ نیشاندانی چەند نەخۆشێك لە حەوشە گەورەكەی سانت ئاندا. هەروەها كۆرسێكیش هەبوو دەربارەی دەرونشیكاری تیوری، كە پرۆفیسۆر بێناسی دەی وتەوە، ئەمیش هەر لە سانت ئان، لەبەرئەوەی پەیمانگای سایكۆلۆجیا بینای تایبەتی خۆی نەبوو. پییر پیچۆت، كە سەرپەرشتی مەشقەكانی دەكرد، یادی فۆكۆ دەكاتەوە، گەرچی زۆریش خۆشی نەدەویست. پیچۆت دەیویست خوێندكارەكانی ئاشنا بكات لەگەڵ تەكنیكەكانی تاقیكردنەوەدا، پێی وابوو زۆر نائاساییە، زۆر تیوریەو بەتەواوی دوورە لە سایكۆلۆجیای ئەزمونیەوە.

لە یەكێك لە وتارە زۆر زوەكانیدا، كە لە ساڵی *1953*دا نوسراوە، فۆكۆ تا ڕادەیەك وەهمی كوشندەی تێكەڵاوی گرفتەكانی خۆی كرد، دەربارەی لكان بە سایكۆلۆجیای تیوریەوە. دێتەوە بیری كاتێك گەیشتە ئەم خەڵوەتگەیەی سایكۆلۆجیای ئەزمونی، لێیان پرسی: *"ئایا دەتەوێت سایكۆلۆجیای زانستی بخوێنیت، سایكۆلۆجیاكەی مێرلۆپۆنتی؟"* فۆكۆ بە شێوەیەكی مەتەڵاوی وتی: *"ئەوەی شایستەی بایەخدانی ئێمەیە، ئەوەیە زۆر دۆگماییانە نەبێت لەچاو ئەوەی كە سایكۆلۆجیای ڕاستەقینە پێناسەی دەكات، وەك پشێوی و گومانباریەكی بنەڕەتی، كە بە پرسیارەكە گریمانە كراوە. ئەمە وا لە بایۆلۆجیستێكی حەپەساو دەكات بپرسێت ئایا دەتەوێت ئەو لێكۆڵینەوە بایۆلۆجیانە بكەیت كە زانستین یان ئەو لێكۆڵینەوە بایۆلۆجیانە كە زانستی نین"* لەسەری ڕۆیشت *"پێویستە لێكۆڵینەوە حیسابێك بۆ فرسەتەكانی واقیعی بوونی خۆی بكات، پێویستە بنەماكانی بخرێنە بەر پرسیار. وەك دەزانین بریتی نین لە بابەتێتی دامەزراوی زانست."* [(1)]

بۆ ماوەیەكی زۆر درێژ، فۆكۆ هەرچەندە سەرسام ببوو بە تەكنیك و ئەزمونەكانی سایكۆلۆجیا، زۆرجار مادەی پێویستی دەهێنا بۆئەوەی تاقیان بكاتەوە، ئەو لە قوتابخانەیەكی باشدا بوو، لاگاش یەكێك بو لە كارتێكەرە زوەكانی و یاریدەی ناساندنی میتۆدەكەی دا لە فەرەنسادا. كاتێك دەزگای لێكۆڵینەوەی فەرەنسی دامەزرێنرا، ئەم بوو بە سەرۆكی شەرەف. كاتێك فۆكۆ لە پەیمانگای مامۆستایان بوو، چێژی لەوە دەبینی هاوڕێیانی قوتابخانەی بخاتە ژێر ئەم تاقیكردنەوەیەوەو كاردانەوە عەفەویەكانیان لەسەر چەندان پارچە كارتی ڕەنگاوڕەنگ تۆمار بكات. لەسەر بنەمای وەڵامدانەوەكانی ئەوان ، فۆكۆ لێكدانەوەیەكی ساز كرد بۆ هەموو ئەو كەسایەتیە دیاریكراوانەی كە لەسەر یاریەكە بەردەوام بوون. مۆریس پینگوێت توانیبووی خۆی لە تاقیكردنەوەكە بدزێتەوە، فۆكۆ پێی وت: *"لەبەرئەمەیە من دەزانم*

*مێشکیان چی تێدایە"* . فۆکۆ بەم ڕێگایە، ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکارانی پەیمانگای مامۆستایانی تاقیکردەوەو ساڵانێکی زۆریش بەو تاقیکردنەوانە سەرسام ببوو. چ ئەگەر لە کلیرمۆنت فیران[8] یان لە تونس، چەندان سەعاتی لە پۆلدا تەرخان کرد بۆ شتێك کە هاوڕێکانی زۆر بە سەرسامیەوە بایەخیان پیٚ دەدا.

تاقیکردنەوەکانی جاکلین ڤێردۆکسیشی سەرسام کرد. ئەم ئافرەتە، لە ساڵانی مەشقکردنی میشیل فۆکۆدا ڕۆڵێکی سەرەکی دەبێت، کە هەر لە کۆنەوە خێزانەکەی فۆکۆی ناسیوە، دایكو باوکیشی ماوەیەکی درێژ هاوڕێی خێزانەکەی فۆکۆ بوون. لە کاتی جەنگدا، باوکیان جاکلینو براکەی ناردبوو بۆ پەناگەی سەلامەتی پۆیاتیٚ[9] . لەویٚ ڤێردیۆکس بە ڕێکەوت بوو بە یاریدەدەری کاروباری بێهۆشکردنی پزیشکی لە لای دکتۆر فۆکۆی باوك، کە پزیشکی جەراحی شارەکە بوو، هەروەها سەرپەرشتی خەستەخانە کاتیەکەشی دەکرد، کە لەناو یەکێك لە قوتابخانەکانی جێسیەکاندا[10] دامەزرێنرابوو، بۆئەوەی تیماری ئەو بریندارانەی لیٚ بکرێت کە لە شەڕی ئەڵمانیەکاندا، بریندار دەبوون، چونکە ئەوکاتە ئەڵمانیا فەرەنسای داگیر کردبوو. کاتێك هێزەکانی ئەڵمان گەیشتە پۆیاتیٚ، ئەم کچە لاوە شارەکەی جێهێشت. چەند ساڵێکی کەم، دوای ئەوە، کاتێك ئاسایش گەڕایەوە، دایکی فۆکۆ پرسیاری لێکرد ئەگەر فۆکۆ بنێرن بۆ پاریس، ئایا ئەو دەتوانێت ئاگاداری بکات؟. بەمجۆرە فۆکۆ بە شێوەیەکی ڕێكوپێك لەگەڵ جۆرجو جاکلین ڤێردێکسدا، لە شەقامی ژمارە شەشی گەڕەکی ڤیلێر سێکسێڵ، شێویان دەکرد، شەقامێکی بچووك بوو لەولای بۆلیڤار سان جێرمانەوەو زۆریش دوور نەبوو لە ئەنجومەنی نەتەوەییەوە.

جاکلین لەگەڵ مێردەکەیدا کاری دەکرد، کە زۆر نەبوو، لە بەردەمی جاك لاکاندا[11] داکۆکی لە ئەتروحەکەی کردبوو. خۆیو ژنەکەی لە سانت ئان، تاقیگەی ئەشیعەی ئەلەکترۆنی مێشکیان دامەزراندبوو[12] جان دیلای لە نهۆمی سەرەوەی سانت ئان، چەند ژورێکی بۆ پەیدا کردبوون، لەویٚ لەگەڵ ئەندریٚ ئۆمبریداندا گوزەرانیان دەکرد، کە قوتابیەکی پێشوتری جۆرج دوماس بوو، لەو ماوەیەدا کتێبێکی دەربارەی نۆسۆلۆجیا[13] وەرگێڕابوو، لەو کاتەدا جاکلین خەریکی خوێندنی زمانی ئەڵمانی بوو، ئەویش تکای لێکرد تا کتێبەکە بدات بە ڕۆلان کۆهین کە پزیشکێکی ناسراوی سویسری بوو لە بواری نەخۆشیە ئەقڵیەکاندا. هەروەها جارێکیش کتێبی فینۆمینۆلۆجیای[14] دەمامك ی دایە بۆ خوێندنەوە، ڤێردۆکس کتێبەکەی خوێندەوەو

بەرەو تۆرگۆڤی ڕۆیشت لە مۆنستەر لینگین، لەسەر کەناری دەریاچەی کۆنستانس[15]. لەوێ وەرگێڕانەکەی ئۆمبێردانسی پیشانی کۆهین داو داوایەکی تایبەتیشی لێ کرد کە دەیەوێت کتێبی فینۆمینۆلۆجیای ماسکەکان بکات بە فەرەنسی، کە بە لایەوە کتێبێکی زۆر سەرنجڕاکێش بوو. کۆهین ڕازی بوو، داواشی لێکرد کە کتێبی پزیشکێکی تریش وەربگێڕێت، کە نوسیبووی.

لۆدڤیگ بێنسوانگەر سێ کیلۆمەتر دوورتر لە شوێنی نیشتەجێی ئەمەوە دەژیاو بەڕێوەبەری عەیادەی بێلیڤو بوو لە کرێز لینگین. ئەم پیاوە خوشکەزای ئۆتۆ بێنسوانگەر بوو، لە جێنا عەیادەی هەبوو، هەر لەو عەیادەیەدا چارەسەری نیچە[16] کرابوو. ڤێردێکس سەردانی پێنسوانگەری کردو سەری لەو پەناگەیە سوڕما، بیناو ئاپارتمانی زەوەند بە ناوچەیەکی بەریندا بڵاو ببوونەوەو بۆن و بەرامەی گوڵ و گوڵزار ناوچەکەی داگیر کردبوو. بێنسوانگەر، پێشئەوەی بڕیاری خۆی بدات گەلێك پرسیاری لە ڤێردێکس کرد، دواجار چوو بۆئەوەی لەسەر ڕەفەی کتێبەکانی بگەڕێت بۆ ئەو تێکستەی کە یەکەمینجار بە زمانی فەرەنسی بڵاو دەبێتەوە: *خەون و بوون*.

بێنسوانگەر ماوەیەکی زۆر خەریك بوو پێشئەوەی ئەو بیرۆکەیە بڕسکێنێت، کە ناوی نا *((شیکاری بونگەرایانە))*. ئەم هاوڕێیەتی لەگەڵ فرۆید[17]، یۆنگ[18]، یاسپەرس[19]، هەروەها هایدگەریشدا هەبوو، ئەمەی دواییان کاریگەریەکی زۆر تایبەتی لەسەر بێنسوانگەر هەبوو. سەرەنجام کاتێك ڤێردێکس گەڕایەوە بۆ پاریس و داوای لە فۆکۆ کرد یاریدەی بدات لە وەرگێڕانیدا لەبەرئەوەی تێکستەکە پڕ بوو لە زاراوەی فەلسەفی. فۆکۆ پێی خۆش بوو. پێکەوە کەوتنە کارکردن بۆ وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فەرەنسی. هەموو ڕۆژێك لە پەیمانگای مامۆستایان یەکتریان دەبینی، کە لەوێ لە ساڵی *1952*دا، ئۆفیسێکی خۆی هەبوو، چونکە بە تکای ئالتۆسێر، لەوێ دەستی بە وانە وتنەوە کردبوو. دەمەتەقێیان دەکرد لەسەر باشترین ڕێگا بۆ گواستنەوەی باشترین بیرۆکە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر. ئێوارەیەکیان دوای ڕۆژێك کارکردن، ڤێردیکس هاوکارە لاوەکەی برد بۆ سەردانی گاستۆن باشلار[20] کە خوێنەرێکی بە هەڵپەی کارەکانی بێنسوانگەر بوو. فۆکۆ، دواتر پەیوەندی لەگەڵ ئەمدا هێشتەوە.

لە ساڵی *1952*و *1953*دا ڤێردیۆکس و فۆکۆ چەند جارێك سەفەری سویسرەیان کرد بۆ بینینی کۆهن و بێنسوانگەرو چەند بەشێکی وەرگێڕانەکەیان پیشان بدەن. ماوەیەکی زۆریان سەرف کرد بۆ گفتوگۆکردن لەسەر زاراوە هایدگەریەکان، دواجار بڕیاریان دا وشەی *(Desian)* نەکەن بەو وشە باوەی بەکار دەهێنرا (بوون–

لەوێ) بەڵکو کردیان بە هەبوون *presence*. کاتێك وەرگێڕانەکە تەواو کرا، ڤێردێکس بە هاوکارەکەی وت: *"ئەگەر کتێبەکەت بە دڵە، پێشەکیەکی بۆ بنوسە"* . فۆکۆ خۆی لە قورسیی مەسەلەکە نەدزیەوەو دەستی کرد بە نوسین.

زۆری پێ نەچوو، لە کاتێکدا ڤێردیکس، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، پشووی دووشەممەی پیرۆزیان[21] لە لادێ بەسەر دەبرد، زەرفێکی گەورەی بەدەست گەیشت، لێی نوسرابوو *"ئەمە مێلکەی جەژنەکەتە"* . یەکەمجار جاکلین ڤێردێکس درێژی نوسینەکەی بە لاوە باش نەبوو: پێشەکیەکە لە خودی کارەکە درێژتر بوو، بەڵام لە خوێندنەوەیدا، زیاترو زیاتر دڵخۆش دەبوو، دواجار بڕیاری دا کە زۆر دڵگیرە.

پێکەوە چوونەوە بۆ بینینی بێنسوانگەر، بۆئەوەی هەریەکە لە وەرگێڕانەکەو پێشەکیەکەشی پیشان بدەن. دکتۆرەکە بە هەردوکیان زۆر خۆشحاڵ بوو. ئینجا دەبوو بڵاوکەرەوە قایل بکەن، کە زۆر لە چاپکردنی ئەم نوسراوە ئاڵۆزو نامۆیە دەسڵەمیەوە: ئەم پێشەکیە درێژە لە لایەنی کەسێکی نەناسراوو ئەم کتێبە کورتە لە لایەنی کەسێکی ترەوە کە هەر هیچ نەبێ لە فەرەنسادا نەناسراوە، بەڵام ڤێردێکس شەڕێکی قورسی کردو سەرنجامیش بردیەوە. کتێبەکە لە ساڵی *1954*دا لە لایەنی دیسلی دیبرۆوسەرەوە، لە زنجیرەی لێکۆڵینەوە ئەنترۆپۆلۆجیەکاندا، چاپ کرا.

لە سەرەتای تێکستەکەدا، فۆکۆ دێڕێکی لە بەخت و ناوچاوەکەی رینێ شار[22] خواستبۆوە: *کاتێك گەورە بووم. بینیم ئەو دیوارە گەورەیەی لە نێوانی ژین و مەرگدا قوت بۆتەوە، بەردەوام پلە پەیژەیەك درێژترەو لێکۆڵینەوە لەگەڵ هێزە ناوازەکەی پەرەسەندندا دەکات*: ئەمە خەونەکە بوو ئێستا تاریکی ببینە دوور دەکەوێتەوە، ژیانیش بوە بە فۆرمی گۆشەگیریەکی خواستراوی ڕەق وتەق، ملکەچکردنی ئەو هێزە نائاساییانەی بە هۆیانەوە بە شیوەیەکی بێزارکەرانە نەفرەتمان لێکراوە، بەڵام ئەوەی کە بە ناتەواوی گوزارشتی لێدەکەین، کەمیمانە لە سەروەری، دەرك پێکردنێکی هەستیانەی کێوی، لەگەڵ تێکۆشانی بێ پسانەوەدا؟(2) . هەروەها لە کۆتاییشدا پارچەیەکی گەورەی لە شار خواستبۆوە، کە بە بۆچوونی فۆکۆ باشترین کلیل بوو بۆ تێگەیشتنی خەونەکان.

شێوازی فۆکۆ لە پێشەکیەکەدا پرشنگدارو بەهێز بوو. ئەوەی لە کارەکەی بێنسوینگەردا کاری تێ کردبوو، بریتی بوو لەو ڕێگایەی لێوەی خۆی گەیاندبوە پشتی بەشداریکردنەکانی فرۆیدو هۆسرلەوە[23] . لەسەرووی هەمووشیەوە، بە

شێوەیەك لە شێوەکان، فۆکۆ خەریکی ئامادەکردنی تێڕوانینی تایبەتی خۆی بوو دەربارەی خەونەکان، نوسی: *"لە هەموو حاڵەتێکدا، مەرگ بریتیە لە مانای ڕەهای خەون"*، هەروەها خەونی مردن *"دەردەکەوێت وەك ئەوەی کام بوونە دەتوانێت فێر ببێت کە ئەوە بنەڕەتیترین شتە دەربارەی خودی خۆی"* هەر کاتێك ئایدیاکە بریتی بوو لە *"خەون پێشەکیەکی ڕەهای هەیە بۆ تێگەیشتنێکی ئەنترۆپۆلۆجیانەی مرۆڤی کامڵ"* بەڵام فۆکۆ پێویستی *"ئەرکی ئاکاریانەو پێویستیی مێژوویی"* شی بینی، بۆ تێپەڕین بۆ پشتەوەی ئەم پێشەکیەو بەمەش تێکستەکەی خۆی تەواوکرد(3) فۆکۆ کارەکانی ئۆجینی مینکۆڤسکی، دەرکەوتنی خەونەکانی باشلار، میلانی کلاین[24]، هەروەها لاکانی بە نمونە هێنایەوە، کە تازە دەستی کردبوو بە خوێندنەوەیان. بۆ نمونە زۆر بە تۆکمەیی وەسفی جین کلۆد پاسیرۆنی دەکرد، کە تازە دەستی کردبوو بە کارکردن لەسەر چەمکی تێڕامان، بۆ دیپلۆمەکەی، لەبەرئەوەی خوی دابوە تێکستەکەی لاکان دەربارەی قۆناغی ئاوێنە، کە لە ئینسایکلۆپیدیای فەرەنسیدا چاپکرابوو.

فۆکۆو ڤێردێکس لە یەکەمین سەفەریاندا بۆ سویسرە لە ساڵی *1952*دا، یەك ڕۆژ پێش سێشەممەی سەفا[25] سەردانی کۆهینیان، لە خەستەخانەی مۆنستەرلینگین، کرد. وا باوە لەم بۆنەیەدا نەخۆشەکان دەمامکی جیاجیا دەپۆشن و لەگەڵ دکتۆرو سستەرەکاندا ڕوو دەکەنە هۆڵی گوندەکە. لە کۆتایی ئاهەنگەکەدا دەمامکەکانیان فڕێ دەدەنە ناو ئاگرێکی گەورەوەو بەوەش کەرنەفاڵەکەیان پیرۆز دەکەن. فۆکۆ زۆر بەم مەراسیمە نامۆیە سەرسام بوو، بە هاوڕێکەی وت: *"ئەمە کەرنەفاڵی پیاوە شێتەکان نیە، بەڵکو کەرنەفاڵی پیاوە مردوەکانە"*.

فۆکۆو ڤێردێکس، کە هەمیشە پێی دەوت هاوسەرەکەم، سەردانی بێنسوانگەریشیان کرد کە بۆ پشوو چووبوو بۆ تیسینۆ[26] لە باشوری ئەڵپ[27] بۆ سەر ڕۆخی دەریاچەی ماگۆری. دوو هاوڕێکە لە فلۆرەنسە پێك گەیشتن و دوای بەسەربردنی چەند ڕۆژێك لە ڤینیسیا، گەیشتنە شوێنی هاوینەی دکتۆرەکەیان و بەدەم ڕێگاوە سەردانی کەنیسەو مۆزەخانەکانیان دەکرد. ڤێردێکس یادی فۆکۆ دەکاتەوەو دەڵێت: *"حەزی لە هونەری وێنەکێشان بوو، ئەو وای لێکردم لە کارەکانی مازاچیۆ[28] بگەم کە بە بۆیەی ئاوی کردبوونی و پێش وشك- بوونەوەیان دەسکاری کردبوون"*. لە لایەکی تریشەوە ڤێردێکس بە باشی سروشتی ناچیزەی فۆکۆی لە یادە، هەرکاتێك دیمەنێکی جوانی سەر زەمینی پیشان بدایە، بۆ نمونە دەریاچەیەك

**فۆکۆ خەریکی ئامادەکردنی تێڕوانینی تایبەتی خۆی بوو دەربارەی خەونەکان، نوسی: *"لە هەموو حاڵەتێکدا، مەرگ بریتیە لە مانای ڕەهای خەون"***

ئەو کاتەی لەگەڵ بێنسوانگەردا بەسەریان برد، لەگەڵ پیاوەکەو کارەکانیدا، کاریگەریەکی زۆری لەسەر فۆکۆ دەبێت

لەبەر تیشکی خۆرەتاوا، ئەو بەرەو ڕێگا وەر دەچەرخایەوەو دەی وت بە قونمەوە. چەند ڕۆژێك لای بێنسوانگەر مانەوە، ئەویش شەش حەوت جارێك بردنی بۆ چاخواردنەوە لای هاوڕێیەکی بە ناوی سزیلازی، کە فەیلەسوفێکی هایدگەری بوو، فۆکۆ لە پێشەکیەکەیدا باسی ئەمیش دەکات. دەربارەی هایدگەرو فینۆمینۆلۆجیاو دەرونشیکاری[29] دوان. پرسیارە گەورەکە ئەمەبوو: *ئایا دەرونشیکاری زانستە؟* بێنسوانگەر ژیانی خۆی سەرف کرد بۆ تێکۆشان تا بیسەلمێنێت بەڵێ زانستە.

ئەو کاتەی لەگەڵ بێنسوانگەردا بەسەریان برد، لەگەڵ پیاوەکەو کارەکانیدا، کاریگەریەکی زۆری لەسەر فۆکۆ دەبێت. بێشك فۆکۆ خۆی لەم زاراوەیە دەدزێتەوە: فینۆمینۆلۆجیای نەخۆشیی ئەقڵی، بەڵام شیکارەکانی بێنسوانگەر بە لایەوە هەر کارێکی سەرنجڕاکێش بوون بۆ تێگەیشتنی شێتی. دواتر وتی: *"خوێندنەوەی ئەوەی پێی دەوترێت شیکردنەوەی بوونگەرایی، یان فینۆمینۆلۆجیای نەخۆشی ئەقڵی، بایەخێکی نکوڵی لێنەکراوی بە نیسبەتی منەوە هەبوە"*.

ئەمە ئەو ماوەیە بوو کە من لە خەستەخانە ئەقڵیەکاندا کارم دەکردو بە دوای شتێکی جیاوازدا دەگەڕام، کە لە شیشەکانی بەندکردن نەچێت. شتێك کە پارسەنگی بداتەوە. بە دڵنیاییەکی زیاترەوە، پێناسە کردنێکی دڵگیرتری شێتی، کە بنەڕەتیو ناوازە بێتو ئەزمونێکی بەراوردکراو بێت، بە نیسبەتی منەوە شتێکی بڕیاردەر بوو. لەوەش زیاتر باوەڕم وایە کە *R.D.*[(1)] لە ژێر کاریگەری ئەمانەدا شیکارەکانی خۆی پێشکەش دەکات. بۆ ماوەیەکی زۆر نمونەی بوونگەرایانە لە یەك سەرچاوەوە وەردەگرێت. *ئەو زیاتر سارتەری بوو، بەڵام من زیاتر هایدگەری بووم* لەو باوەڕەدام کە شیکردنەوەی بوونگەراییانە یاریدەی دام ئەوەی کە دەربارەی زانینی ئەکادیمیانەی نەخۆشیە ئەقڵیەکانە، کە زۆر ناڕەحەتو قورسن، سنوریان بکەمو باشتریش پێناسەیان بکەم.[4]

پێشەکیەکەی فۆکۆ بۆ تێکستەکەی بێنسوانگەر، لەو ماوەیەدا، سەدایەکی باشی هەبوو بۆ سازبوونی ڕۆشنبیریەکەی. وەڵێ زیاد لەمەش، بریتیە لە بەرهەمی ماندووبوونە پێشوەختەکەی، ئەو گرفتەی کە دیاری کردوەو دواتر خۆی پێوەی خەریك دەبێتو هەر لە سەرەتاوە دەبێت بە بناغەی کارەکانی. لەساڵی *1983*دا، لە پێشەکی چاپێکی زووی کتێبی بەکارهێنانی چێژەکان، بەرگی دوەمی کتێبی مێژووی

سێکسایەتی، لە ئەمریکا چاپکرا، فۆکۆ هەموو ئەو شتانە دێنێتەوە یاد کە تێیاندا قەرزاری بێنسوانگەرە، لەگەڵ باسکردنی ئەوەی چۆن لەم ئایدیایانەوە کەوتۆتە گەڕ:

بـۆ لێکۆڵینـەوەی فۆرمـەکانی ئـەزمون لـەم ڕێگایـەوە . لـە مێـژووی خۆیـاندا . ئایدیایەکـە لەگـەڵ پڕۆژەیـەکی تـردا ریشـەی هاوبەشـیان هەیـە، تێیـدا مـن میتـۆدی شیکردنەوەی بوونگەرایم لە بواری سایکاتریو کایەی نەخۆشیە ئەقڵیەکاندا، بەکار هێناوە. لەبەر دوو هۆ کە پەیوەندیان بە یەکەوە هەیە، ئەم پڕۆژەیە بە نائارامی جێی هێشتم: لاوازیـە تیوریەکـەی لـە چڕکردنـەوەی بیرۆکـەی ئـەزموندا، لەگـەڵ پێوەسـتە تەژماویەکەشی بە کاری سایکاتریەوە، کە بە ئیسراحەت پشتگوێ خراوەو بە گەرەنتی وەرگیراوە. دەتوانین لەگەڵ گرفتی یەکەمدا، بگەڕێینەوە بۆ تیوریەکی گشتی دەربارەی مرۆڤ، هەروەها مامەڵەش لەگەڵ دوەمیاندا بە جیا بکەینو بگەڕێینەوە بۆ سەر ئەوەی کە بۆ {ناوەڕۆکی ئابوریو کۆمەڵایەتی} ئـەنجام دراوە. ئەگـەر وا بکـەیت، دەتوانیـت ئەنجامە مەتەڵاویەکانی ئەنترۆپۆلۆجیای فەلسەفیو مێژووی کۆمەڵایەتی قبوڵ بکەیت. بەڵام من سەرم سوڕمابوو لـەوەی، کە ئایا لـەبری نەخشەکێشـان بۆ ئـەم ئەڵتەرناتیڤە، شتێکی شیاو نابێت بایەخ بدەین بە مێژووی فۆرمەکانی تاقیکردنەوە.

هـەروەها دوای پێشکەوتنێکی دوورودرێـژ لـە دەرەوەی ئـەم ڕێـڕەوەدا، لـە تویـێی ئەوەوە کە وای لێ بکات بیر لە زاراوەکانی "مێژووی فۆرمەکانی تاقیکردنەوە" بکاتەوە، وتی: *"ئەوە ئاسانە ببینیت کە چۆن خوێندنەوەی نیچە لە سەرەتای پەنجاکاندا، ڕێی بۆ ئەم چەشنە پرسیارانە خۆشکردوە، بە تێکشکاندنی دابو دەستورێکی دووسەرە، واتە فینۆمینۆلۆجیاو مارکسیزم"* [5]

فۆکـۆ لەگـەڵ جـاکلین ڤێردێکسیشـدا، لـە خەسـتەخانەی سـانت ئـان، وەکـو سایکۆلۆجیستێکیش کاری کرد، کە لەوێ کارەکانی ڕوون نەبوو. لەوێ لەژێر مەشقدا بوو، کە ئەمە تۆزێك لەو زیاترە کە هیچ ئەرکێکی ڕەسمی نـەبێت، هـەروەها مووچەش بێ نەدرێت. بەڵام لەم ماوەیەدا، ئەو سەرەتا لە دەزگای سریسدا ژیاو، پاشان بوو بە موحـازیر لـە زانکۆی لایل ، بۆیـە ئـەوە بـۆ پـەیداکردنی بژێوی بوو کـە ئـەو مەشـقەی تاقیگـەی ئەلـەکترۆنیك فالۆگرافی قبوڵ کـرد. یـاریدەی ڤێردێکسـی دا بـۆ وەرگرتنـی ئـەزمونو شـارەزایی. ئـەوە هـەمووی گرنگ بـوو. شـەپۆلەکانی مێشکیان پێوانـە کـرد، بەرگری پێست لەناو لەپی دەستدا، هەروەها هەناسەدانیش. ئەو کەسـەی پشکنینیان بۆ دەکرد، دەبوو لەسەر کورسیەکی دەسکدار دابنیشێت، چەند ئەلەکترۆدێك بەسەری،

دەستی، لەگەڵ پێیەکانیەوە، بلکێنرێت. ئەمە بواری بۆ لێکۆڵەرەوە دەڕەخساند تا هەموو کاردانەوەکانی ناو دەمارە سیستمی جەستە تۆمار بکات. هەندێکجار فۆکۆ خۆی وەکو بابەتی تاقیکردنەوە لەسەر کورسیەکە دادەنیشت، زۆرجاریش سەرقاڵی ئامادەکردن و خوێندنەوەی تاقیکردنەوەکان دەبوو. رۆبێرت فرانسیس کە دەروونناسێک و مۆسیقازانێکیش بوو، هات بۆ تاقیگاکە بۆ ئەنجامدانی چەند تاقیکردنەوەیەک دەربارەی بیستنی مۆسیقا. ئەوەش بۆ جان دۆرفان چەند سەرسوڕهێنەر بوو، فرانسیس داوای لێکردبوو ببێت بە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی، ئەویش لەناو تاقیکردنەوەو ئایدیا تەکنیکیەکاندا، فۆکۆی دۆزیەوە!

بێشک تاقیگاکە تەرخان نەبوو بۆ لێکۆڵینەوە پوختەکان، یاخود بۆ ئەزمونە سەرسوڕهێنەرەکان. تاقیگاکە لەژێر دەسەڵاتی جان دیلایدا بوو، هەروەها بەشێکی گرنگی نەخۆشخانەکەش بوو. لە سەروی هەمو ئەمانەشەوە، جۆرج و جاکلین ڤێردیکس لێپرسراو بوون لە دیاریکردن و شوێنکەوتنی حاڵەتی ئەو نەخۆشانەی لە سانت ئاندا دەسبەسەر کرابوون.

لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی *1982*دا، فۆکۆ بەم شێوەیەی خوارەوە باسی ئەو کارە دەکات:

*لەناو نەخۆشخانەیەکی ئەقڵیدا، وێنەیەکی روون بۆ سایکۆلۆجیست لە ئارادا نەبوو. بۆیە من وەکو خوێندکارێکی سایکۆلۆجیا لەوێ وێنەیەکی زۆر نامۆم هەبوو، سەرۆکی لێکۆڵینەوەکان لەگەڵ مندا زۆر میهرەبان بوو، بواری پێدام هەرچیەکم دەوێت بیکەم لە راستیدا من لە پلەیەکدا بووم لە نێوانی ستافەکەو نەخۆشەکاندا، ئەمەش شایستەی من نەبوو، وا نەبوو چونکە من هەڵوێستێکی تایبەتیم هەبوو، ئەوە بەرەنجامی ئەو تەژمیە بوو کە لە وێنەکەی مندا هەبوو، کە ناچاری کردم بۆشاییەک بهێڵمەوە لە نێوانی خۆم و ستافەکەدا. من دڵنیام ئەمە خواستی تایبەتی خۆم نەبوو، چونکە هەستم دەکرد کە هەموو ئەو کاتە چەشنێکە لە چەشنەکانی نیگەرانی. تەنیا چەند ساڵێکی کەم دواتر، کە دەستم کرد بە نوسینی کتێبێک دەربارەی مێژووی سایکاتری، ئەو نیگەرانیە، ئەو ئەزمونە تایبەتیە، شێوەی رەخنەیەکی مێژوویی، یاخود شیکردنەوەیەکی بونیادیی، وەرگرت.*

کاتێک لێیان پرسی ئایا نەخۆشخانەی سانت ئان، هیچ هەستێکی نەرێیانەی بەخشیوە بە فەرمانبەرەکانی، میشیل فۆکۆ وەڵامی دایەوە:

*ئۆی، نەخێر ئەوە نەخۆشخانەیەکی لەوە گەورەتر بوو ئەندێشەی بکەیت، پێویستە بڵێم لە زۆرینەی خەستەخانەکانی ناوچەکە باشتر بوو، ئەوانەی دواتر سەردانم کردوون. یەکێکە لە باشترین نەخۆشخانەکانی پاریس، نەخێر خراپ نەبوو. بێشك ئەمەش شتێکی گرنگ بوو. رەنگە ئەگەر من ئەم چەشنە کارەم لە خەستەخانەیەکی ناوچەیی بچوکدا، بکردایە، بڕوام دەکرد نوشوستی- هێنانەکەی، خەتای شوێنەکە بوە یاخود ئەنجامی نەگونجاوی‌و ناسازیەکەی بوە، لەوێدا.*[6]

فۆکۆ تەنیا لە خەستەخانەی سایکاتری وەکو سایکۆلۆجیستێك کاری نەکردوە، بەڵکو لە بەندیخانەیەکیشدا ئەوکارەی کردوە. لە ساڵی *1950*دا، وەزارەتی تەندروستی داوای لە جۆرج‌و جاکلین ڤێردیکس کرد تاقیگەیەکی ئەلەکترۆنیك فالۆگرافی لە بەندیخانەی فرێسنسدا بکەنەوە، وەکو لقێك لە نەخۆشخانەی گشتی سەر بە سیستمی بەندیخانەکانی فەرەنسا. تاقیگاکە دوو وەزیفەی هەبوو: پشکنینی بەندیە نەخۆشەکان لەسەر داوای دکتۆر، هەروەها سەرپەرشتیکردنی برینەکانی مێشك، پەرکەمی شاراوە، گیروگرفتەکانی دەمار، هەروەها ئامادەکردنی پیلانێکی پشکنین، بەندیەکان ئامادە بکات بۆ چوونە قوتابخانەکانی ناو بەندیخانەوە، لە وێنەی چاپخانەکەی میلۆن. جاکلین ڤێردیکس هەموو هەفتەیەك سەری ئەوێی دەداو فۆکۆی هاوڕێشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. بۆ ماوەی دوو ساڵ فۆکۆی فێری ئەوە دەکرد کە پشکنینی داخڵکردن ئەنجام بدات‌و بەرەنجامیشی لێوە هەڵبهێنجێت، ئەمە لە کاتێکدا کە فۆکۆ وەکو یاریدەدەری ئەو کاری دەکرد. پێکەوە دەمەتەقێیان دەربارەی حاڵەتەکان دەکرد، هەر کەسێکیان فەحس بکردایە، سەرنج‌و تێبینی خۆیان دەربارەی تۆمار دەکرد.

بۆیە فۆکۆ ئەو ماوەیەی بەسەر بردو لەناو ئەو ئەتمۆسفیرەی سایکۆلۆجیای ئەزمونیدا، بەرەو پسپۆڕی دەڕۆیشت. ئێستا دەرکەوتنەکەی ئەو، شەقڵی چوارچێوەیەکی تەواو ئەکادیمی جێهێشتوەو وەکو ئەتنۆلۆجیەکان دەڵێن، فۆکۆ خۆی لە بوارەکەدا دۆزیەوە. ڕوبەڕوی واقیعی نەخۆشی بۆوە، لەگەڵ ئامادەیی ئەو خەڵکانەدا کە ناساغن. ئەو لەناو دوو فۆرمی دەسبەسەر کردندا نغرۆ ببوو: ئەوەی پیاوە شێتەکان‌و ئەو پیاوانەی کە تن یان تاوانێکیان کردوە. خۆشی لەناو ئەوانەدا کە "پشکنرابوون"، بڕیاری پێ نەدەدرا ئایا پێکهاتە نائارام‌و ناڕەحەتەکەی، بۆشاییەکیان دروست کردوە لە نێوانی ئەم‌و ئەو شارەزابوونە سایکۆلۆجیەدا، کە فێری دەبوو.

**فۆکۆ تەنیا لە خەستەخانەی سایکاتری وەکو سایکۆلۆجیستێك کاری نەکردوە، بەڵکو لە بەندیخانەیەکیشدا ئەوکارەی کردوە**

## پەراویزەکان

(1) سایکۆپاتۆلۆجی *Psychopathology* برتیە لە لێکۆڵینەوەی سروشتی پەشێویە ئەقڵی و ئیدراکی و رەفتاریەکان، بۆ گەڕان بە دوای نیشانەکان و هۆکارەکان و شوێنەوارو بارودۆخە دەرونیەکان، ئەوانەی بەشداری دەکەن لە خولْقاندنی نەخۆشیەکەدا. هەروەها ئەم چەمکە گوزارشتیش دەکات لەو سیفەتە شەخسی و ڕەفتاریانەی کە هەندێك گیروگرفت بۆ ئەوکەسانە دەخولْقێنن و دەنێنەوە کە لە نەخۆشەکەوە نزیکن. لە ڕاستیدا، هەر پەشێوییەکی رەفتاری یان ئەقڵی یان هەر پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی لە توانای تاك کەم بکاتەوە بۆ بەدیهێنانی قەوارەی خۆی، دەتوانرێت بە حاڵەتی نەخۆشی لە قەڵەم بدرێن *Pathological*.

(2) لاکان، جاك *Jacques Lacan 1901 . 1981* دیارترین ناوی فەڕەنسیە لە بواری دەرونشیکاریدا لە ماوەی دوای جەنگی جیهانی دوەم بە دواوە . لاکان فرۆیدی بە فیکری فەڕەنسی ناساندو دیارترین نوسراوەکانیشی بریتین لە {پاش پرەنسیپی واقیع ، قۆناعی ئاوێنە ، بابەتی نەست، من لە تیۆرەی فرۆیدی و تەکنیکەکانی شیکردنەوەی دەروونیدا}.

(3) ئالْتۆسێر ، لویس *Althusser, Louis 1918-1990* فەیلەسوفێکی فەرەنسیە، لە ماوەی سالانی *1960− 1970*دا، گفتوگۆیەکی زۆر لەسەر کارەکانی بەرپا بوە، شۆرەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەشداریە دیارەی کە لە گفتوگۆکردنی کارەکانی مارکسدا هەیبوە. دیارترین کتێبی بریتیە لە پێناوی مارکسدا− *1965* ، خوێندنەوەی سەرمایە− *1965*.

(4) پزیشکیی ئەقڵی *Psychiatry,* بریتیە لە لقێکی زانستی پزیشکی کە تەرخانە بە نەخۆشیە ئەقڵیەکان. پزیشکیی ئەقڵی تەنیا بایەخ نادات بە مرۆڤە نائاساییەکان، بەڵکو لێکۆڵینەوەش دەکات لەسەر چۆنێتی تێگەیشتن و نەهێشتنیشیان.

(5) سۆربۆن *Sorbonne,* ناوی یەکێکە لە بیناکانی زانکۆی پاریس، بە شێوەیەکی میللی بەکارهێنراوە، بۆئەوەی گوزارشت لە تەواوی زانکۆکە بکات. ناوەکە لە ناوی کۆلێجێکی ئاینیەوە خواستراوەتەوە کە لە دەوروبەری ساڵی *1257*دا، لە لایەنی رۆبەرت سۆربۆنەوە، دامەزرێنراوە.

(6) ئارۆن، ریمۆن *Raymond Aron 1905 . 1983* کۆمەڵناس و سیاسیەکی فەرەنسیە، تێزەکانی خۆی لەگەڵ فەلسەفەی مێژوودا یەکخستوە، ناودارترین کتێبی بریتیە لە ئەفیونی رۆشنبیران، کۆمەڵگای پیشەسازی.

(7) کانگیلم، جۆرج *G eorges Canguilhem* (*1904−* ) پزیشك و ئەپستمۆلۆجیی نێوداری فەڕەنسی، یەکەمین کەسە کە پایەیەکی بڵندی بەخشی بە مێژووی زانستەکان و ئەپستمۆلۆژیا لەناو لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکاندا، پرسیارگەلێکی زۆری لەمەڕ تاکساری دیاردەی زیندوو بوون پێشکەشکردوە.

(8) کلێرمۆنت فیران *Clermont-Ferrand* شارێکە لە ناوەڕاستی فەرەنسادا، سەنتەری ناوچەی پۆی دی . دۆمە ، دەکەوێتە سەر روباری تریشیان و دەشتی لیمان. ئەم شارە پێی دەوترێت

ئاكرۆنی فەرەنسا، شارێكی پیشەسازیە، بەرهەمهێنەری مەتات، ئامێری ئەلەكترۆنی، پاسكیل، ئامێرە وردەكان، مادەی كیمیاوی، كەلوپەل‌و جلوبەرگ، كەتان، هەروەها خۆراكیش بەرهەم دەهێنێت.

[9]پۆیاتێ Poitiers (شاری دێرینی لیمۆنۆم) شارێكە لە خۆراوای ناوەڕاستی فەرەنسە، سەنتەری ناوچەی ڤیینە. پۆیاتێ ناوچەیەكی ئالوگۆڕی بازرگانیەو سەنتەرێكی پیشەسازیشە، كە ئامێری میكانیكی‌و یەدەكی مێتاڵی‌و كیمیاویات‌و ئامێری كارەبایی بەرهەم دەهێنێت. زانكۆیەكی تێدایە هەر بە ناوی شارەكەوە ناونراوەو لە ساڵی 1432دا لە لایەنی چارلسی حەوتەمەوە دروست كراوە. لە سەدەی شازدەیەمداو لە كاتی جەنگە ئاینیەكاندا، ئەم شارە لە لایەنی كاسۆلیكەكانەوە، بە تەواوی وێرانكراوە، چونكە سەنتەرێكی پرۆتستانتی بوە. لە ساڵی 1999دا ژمارەی دانیشتوانەكەی 83448 كەس بوە.

[10]جێسیەكان Jesuits or Society of Jesus (Jesuits), بریتیە لە پێڕەوێكی ئاینی پیاوانە كە سەر بە كەنیسەی ڕۆمان كاسۆلیكە، لە لایەنی قەشە ئیگناتیۆسی لۆیۆلاوە، لە ساڵی 1534دا، دامەزرێنراوە، هەروەها پاپاپۆڵی سێیەم لە ساڵی 1540دا شەرعیەتی پێداوە. ناوی ئەم دامەزراوە لە ناوی مەسیحەوە وەرگیراوە كە لە زمانە ئەوروپییەكاندا پێی دەڵێن جێسی. دروشمی ئەم كۆمەڵەیە بریتیە لەوپەڕی سەروەری‌و شكۆداری بۆ یەزدان. مەبەستی ئەم كەنیسەیە بریتیە لە بڵاوكردنەوەو فێركردنی دادپەروەری‌و سەروەری‌و پێداویستیە زەرورەكانی كەنیسە لە كاتێكی دیاریكراودا. ڕۆشنبیركردن بریتیە لە چالاكی هەرە سەرەكی ئەم كەنیسەیە.

[11]لاكان، جاك Jacques Lacan ( 1901 . 1981 ) دیارترین ناوی فەرەنسیە لە بواری دەرونشیكاریدا لە ماوەی دوای جەنگی جیهانی دوەم بە دواوە . لاكان فرۆیدی بە فیكری فەرەنسی ناساندو دیارترین نوسراوەكانیشی بریتین لە پاش پرەنسیپی واقیع ، قۆناعی ئاوێنە ، بابەتی نەست ، من لە تیۆرەی فرۆیدی‌و تەكنیكەكانی شیكردنەوەی دەروونیدا.

[12]ئەشیعەی ئەلەكترۆنی مێشك Electroencephalography, ئامێرێكە بۆ چاودێریكردنی چالاكیە كارەباییەكان لەناو مێشكدا، بە هۆی تێپەڕاندنی شەپۆلی كارەبایی بە روكاری دەرەوەی كەللەسەردا. ئەم ئامێرە بە زۆری بەكاردێت بۆ دۆزینەوەی هۆیەكانی پەركەم epilepsyو چارەسەركردنیشی. هەروەها كەشفكردنی ئەوناوچانەی مێشك كە لە كار كەوتوون یان تووشی فشار هاتوون.

[13]نۆسۆلۆجی Nosology بریتیە لە پۆلاندنی نەخۆشیە ئەقڵیەكان، لەگەڵ پۆلاندنی ئەو لقانەی زانستدا كە بایەخدەدەن بە نەخۆشیە ئەقڵیەكان.

[14]فینۆمینۆلۆجیا Phenomenology جولانەوەیەكی فەلسەفیە لە سەدەی بیستەمدا، كە بایەخی داوە بە وەسفكردنی ئەزمونەكان وەك چۆن خۆیان لە هۆشماندا دەخەنە روو، بێ پەنابردنە بەر تیوریەك یان بەرنجامێك یاخود هەڵگرتنەوەی هیچ دیسپلینێك، وەك ئەوانەی لە زانستە سروشتیەكاندا هەیە. لە زمانی كوردیدا وشەی دیاردەگەرایش بۆ ئەم زاراوەیە بەكارهاتوە، كە زیاتر لە وشە عەرەبییەكەوە، خواستراوەتەوە (الظاهراتیة) كە زۆرێك لە عەرەبەكانیش بەكاری ناهێنن لەبەر بێكەڵكی.

[15]دەریاچەی كۆنستانس Bodensee (also Lake of Constance), پێشی دەوترێت بۆدێنسی، دەریاچەیەكە لە سەنتەری ئەوروپادا، لە نزیك شاخەكانی ئەڵپ، دراوسێكانی سویسرەو ئەڵمانیاو

نەمسان. ئەم دەریاچەیە 396م لە روی دەریاوە بەرزە. دوەمین دەریاچەی گەورەیە لە ناوچەكەدا لە دوای دەریاچەی جەنەواوەGenev . لە درێژترین شوێنیدا 74كیلۆمەتر دەبێتو پانترین شوێنیشی 16 كیلۆمەترە، روبەرەكەی 540 كم$^2$ دەبێت، قوولترین خالی 252مەترە. ئەم دەریاچەیە یەكێكە لە سەرچاوەكانی روباری راین.

[16] **نیچە، فریدریك** ***Friedrich Nietsche*** ( *1844 . 1900* ) فەیلەسوفێكی ئەلمانیە، دوژمنێكی سەرسەختی هیگلو هیگلیەكان بوە، هەروەها دژایەتی ئاین بە گشتیو مەسیحیەتی كردوە بە تایبەتی. فەلسەفەكەی بریتیە لە چاو پێدا خشاندنەوەیەكی رەخنەگرانەی بێرەحمانە بە كەلتوری مرۆڤایەتیدا گەیشتن بەوەی مرۆڤ لەم فۆرمەی ئێستایدا مەحكومە بە فەوتانو پێویستە دان بە بەزینیدا بنێتو چاوەروانی ئەو مرۆڤە بالایە بێت كە جێی دەگرێتەوەو بە پێی پرەنسیپی ئیرادەی هێزو نەهلیزمیەتی پشتەوەی خۆی كاردەكات.

[17] **فرۆید، سیگمۆند** ***Sigmond Freud*** (*1856 . 1939*) دەرونزانو پسپۆری نەخۆشیە دەماریەكانە، لە ناوچەی مۆرافیای چیكۆسلۆفاكیا لەدایك بوەو تەمەنی خۆی لە ڤیەننا بەسەر بردوە، هەتا لە دەستی نازیەكان رادەكاتو روو دەكاتە لەندەنو لەوێ دەمرێت. دامەزرێنەری پێرەوی دەرونشیكاریو تیورەی نەستەو دیارترین كتێبی لێكدانەوەی خەونەكانە (*1900*).

[18] **یۆنگ**، كارل گۆستاف ***Jung, Carl Gustav (1875-1961),*** دەروونناسێكی سویسریە، لێكۆلینەوە دەرونشیكاریەكانی فرۆیدی بەرین كردەوە، نارەحەتیە ئەقلیو سۆزیەكانی شیدەكردەوە، وەكو هەولێك بۆ دۆزینەوەی تەواوی پێكهاتەی كەسێتی. دواجار لە سالی *1913*دا ئەمیش لە فرۆید جیا دەبێتەوە.

[19] **یاسپەرس**، كارل ***Jaspers, Karl (1883-1969),*** فەیلەسوفێكی ئەلمانیە، یەكێكە لە رابەرانی فەلسەفەی بوونگەرایی، كارەكانی كاریگەریان لەسەر تیۆلۆجیای مۆدرێن هەبوو، هەروەها كاریگەیشیان لەسەر فەلسەفە هەبوو. یاسپەرس لە *23*ی شوباتدا لەدایك بوە، یاساو پزیشكیشی لە زانكۆی هایدلبێرگ خوێندوەو هەر لەو زانكۆیەشدا لە سالی*1916* بەدواوە، وانەی نەخۆشیە ئەقلیەكانی وتۆتەوە. پاشان رووی كردۆتە فەلسەفەو تا سالی *1937* كورسی فەلسەفەی هەبوە. ژنەكەی یاسپەرس جولەكە بوو، كە نازیەكان هاتن لەسەر كار لایان برد، ئەویش لە سالی *1948*دا لە سویسرە دەبێت بە ئوستادی فەلسەفە. یەكەمین كتێبی بریتیە لە سایكۆپاتۆلۆجیای گشتی– *1913*، پاشان كتێبی سایكۆلۆجیای تێروانینەكانی جیهان– *1919*، ئەم كتێبە زۆر گرنگەو چەندان هەلوێستی جۆراو جۆری تێدایە بەرامبەری ژیان. كتێبی سەرەكی یاسپەرس بریتیە لە سێ بەرگەكەی فەلسەفە *1932– 1969*.

[20] **باشلار ، گاستۆن** ***Bachelard, Gaston*** ( *1884 . 1962*) فەیلەسوفێكی فەرەنسیە، رێگەیەكی نوێی گرتە بەر لە شیكردنەوەی تێكستە ئەدەبیەكاندا، واتە شیكردنەوەی فەلسەفیانەی ئەدەب، ئەم رێبازەشی لە كتێبەكەیدا، زەینی سات *1932*دا بەكار هێنا. دیارترین كتێبی بریتیە لە پێكهاتەی ئەقلی زانستی– *1934*. باشلار داهێنەری چەمكی دابرانە لە قۆناغە جیاجیاكانی فیكرو زانستی ئێمەدا.

[21] **دووشەممەی پیرۆز** ***The Easter Monday***، بریتیە لە یەكەمین دووشەمەی دوای فێستیڤالی هەستانەوەی مەسیح، دەكەوێتە یەكەمین یەكشەممەی دوای یەكەمین روودانی مانگی چواردە لە دوای بیستویەكی مارتی هەموو سالێكەوە.

[22]شار، رینێ *(1907-1988),* شاعیرێکی فەرەنسیەو ئەندامی هێزی بەرگری بوو لە ماوەی شەڕی جیهانی دووەمدا، بەشداریەکی دیاریشی هەبوە لە جولآنەوەی سوریالیەکاندا. شار بڕوای وا بوە کە شیعر دەتوانێت لێکدانەوەیەکی نائەقلآنی بێت بۆ جیهانی تەژمو نامۆو ئەفسوناوی. دیارترین دیوانە شیعریەکانی بریتین لە چەکوش بەبێ ئاغا- *1934*، لە بەرگری نیشتمانیدا دژی ئەڵمانەکان چەندان کاری مەترسیداری ئەنجامداوەو چەندان جار بە پەرەشووت دابەزیوەتە پشتی سوپای ئەڵمانیەوە، لە ساڵی *1944*دا پەیوەندی کردوە بە ژەنراڵ دیگۆڵەوە *Charles de Gaulle* بەشداری کردوە لە رزگارکردنی پاریس لە دەستی ئەڵمانیەکان. دوای جەنگ خۆی تەرخان دەکات بۆ شیعر. ئەلبێر کامۆو مارتن هایدگەر هاوڕێی نزیکی بوونو سەردانیان دەکرد. دیوانێکی تری بە ناوی *بە تەنیا- مانەوە 1946* چاپکردو لە ساڵی *1973*شدا جێهێشتنی هیپنۆسی چاپکرد

[23]هۆسرل، ئەدمۆند *Husserl, Edmund (1859-1938),* فەیلەسوفێکی ئەڵمانیە، دامەزرێنەری پێڕەوی فینۆمینۆلۆجیایە. یەکێکە لە کاریگەرترینی فەیلەسوفەکانی سەدەی بیستەم.. ئوستادی زانکۆی فرایبورگ بوە، دوای خۆی کورسیەکەی بۆ هایدگەر جێهێشتوە، بەلآم کە هایدگەر دەبێت بە سەرۆکی زانکۆی فرایبورگ، ناوی هۆسرل لە لیستەی ئوستادانی ئەو زانکۆیەدا دەسڕێتەوە . لە ژێر فشاری نازیەکاندا . دیارترین کتێبی بریتیە لە *تێڕامانە دیکارتیەکان 1931*.

[24]کلاین میلانی *Klein, Melanie (1882-1960)* دەرونشیکارێکی نەمساویە، شێوازێکی چارەسەری دەرونی داهێناوە بۆ منداڵآن کە دواتر دەرکەوت زۆر کاریگەرە. کەوتبوە ژێر کاریگەری فرۆیدەوە. ئەبراهام سەرنجی داوە کە منداڵآن لە کاتی یاریکردنیاندا لەگەڵ لەیستۆکەکانیاندا، گەلێك لە فەنتازیاکانی سەردەمی ساوایەتیان دەردەبڕن.

[25]سێشەممەی سەفا، *Mardi Gras* هەروەها سێشەممەی کفنو دفن کردنیشی پێدەوترێت. فێستیڤاڵێکی ساڵآنەیە، یەك ڕۆژ پێش فێستیڤاڵی بەخشین دەست پێدەکات، کە ئەم فێستیڤاڵە چل ڕۆژ دەخایەنێتو لەو ماوەیەدا دەست لە خواردنو خواردنەوەو بەزمو رابواردن دەگیرێتەوەو زەماوەند ناکرێتو پشت دەکرێتە کەیفو سەفا. جا سێشەممەی سەفا دواین فرسەتە بۆ رابواردنو بەزمو هەرا پێش داخڵبوونی ئەو چل ڕۆژە. زاراوەی *Mardi Gras* زاراوەیەکی فەرەنسیە مانای سێشەمەی چەور یان قەڵەو دەگەیەنێت

[26]تیسینۆ, *Ticino (ancient Ticinus),* ( کۆن پێیان دەووت تیسینۆس) روبارێکە لە خۆراوای ئەوروپا، یەکێکە لە لقەکانی روباری پۆ *Po* لە باشوری سویسرەو باکوری ئیتالیاوە دەڕژێتە ناوی. سەرچاوەکەی لە ناوچەی سانت کۆسێرد دایە لە شاخەکانی ئەلپ.

[27]ئەلپ *Alps,* ناوچەیەکی شاخاویە دەکەوێتە ناوەڕاستی باشوری ئەوروپاوە، کەوانەیەکی *1200*کیلۆمەتریی دروست دەکات کە لە کەنداوی جیۆناوە درێژدەبێتەوە بۆ روباری دانوب لە ڤیەننا. شاخەکانی ئەلپ بەرزترینو قەرەباڵەغترین ناوچەی شاخاوین لە ئەوروپا، کە روبەرێکی نزیکەی *200000* کم2 یان داگیرکردوەو نزیکەی بیست ملیۆن کەسی لێ دەژی.

[28]مازاچیۆ *Masaccio (1401-1428?),* یەکەمین هونەرمەندی نیگارکێشی ئیتالیایە لە سەردەمی رێنیسانسدا، کە کارە زانستیەکانی لە بواری روناکی سروشتیدا، هەنگاوێکی گەورەبوو لە پەرەپێدانی

**نیگارکێشانی هاوچەرخدا. ناوی ئەسڵی مازاچیۆ بریتیە لە *تۆماسیۆ دی سێر جیۆڤانی دی مۆنی کاسای*. یەکێکە لە رابەرانی رێنیسانس، لە کارەکانی *سەرەتای مادۆناو منداڵەکە لەگەڵ قەشەدا*– *1422*.**

(29) **دەرونشیکاری *Psychoanalysis,* بریتیە لە میتۆدێکی تایبەتی هێنانە قسەو لێکۆڵینەوەی نەستو پرۆسێسە نەستیەکان، بۆئەوەی پرەنسیپەکانی چارەسەرکردنی دەرونیان بەسەردا پیادە بکرێت. هەروەها ئەم زاراوەیە دەشگەڕێتەوە بۆ بونیادێکی سیستماتیکی تیوری دەرونشیکاری، کە لەسەر پەیوەندی نێوان هەستو نەست، لەگەڵ پرۆسێسە ساکۆلۆجیەکاندا، دامەزراوە.**

((1)) ***R.D.*** کورتکراوەی زاراوەی ***disgorged recently*** کەلێرەدا مانای ئەوکەسەیە کەتازە خۆی لەتاقیکردنەوەو خوێندن رزگار کردوەو دێتە ئەم شوێنە بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکانی.



robert gober,1998-99

د. جورج باوری

# فەلسەفەی ئەریك فرۆم

## 1980-1900


ئەریك فرۆم

لە ئینگلیزییەوە: عەبدوڵڵا سیوەیلی

### ژیاننامە

ئەریك فرۆم ساڵی *1900* لە شاری فرانكفۆرت لە ئەڵمانیا لە دایك بوە. باوكی سەرمایەدار بوەو بە قسەی فرۆم كابرایەكی مەزاجی بوە. دایكی زۆربەی كات لە خەمۆكیدا ژیاوە. بە دەربڕینێكی تر، وەكو زۆربەی ئەو بڕە خەڵكەی ئێمە لێمان كۆڵیونەتەوە، سەردەمی منالی ئەریك فرۆم زۆر دڵخۆش نەبوە.

بە هەمان شێوەی یۆنگ، فرۆم لە خێزانێكی زۆر ئاینپەروەردا گەورە بوە. جوولەكەیەكی پابەند بوو، بەلام دواتر هەروەك خۆی دەڵێت، بوە بە عارفێكی بێبڕوا.

لە ئۆتۆبایۆگرافی (ژیاننامەی خۆیی)یەکەیدا، واتە لە کتێبی (لەودیو زنجیرەکانی وەهمەوە)، فرۆم باس لە دوو ڕووداوی سەردەمی سەرەتای هەرزەکاری خۆی دەکات کە وایان لێکردوە بچێتە سەر ڕێچکەکەی خۆی. یەکەم ڕووداو بریتی بوو لە تێوەگلانی لەگەڵ هاوڕێیەکی خێزانەکەیاندا.

تەمەنی هەر *25* ساڵێك دەبوو. ئەو کچێکی زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بوو، سەرەڕای ئەمانە شێوەکاریش بوو. یەکەم شێوەکار بوو من ناسیبێتم. بیستبووم کە گوایە مارە کراوە، بەڵام پاش ماوەیەك مارەبڕینەکەی هەڵوەشاندبۆوە. لە بیرمە ئەو بە نەگۆڕی لە کۆمپانیای باوکە بێوەپیاوەکەیدا کاری دەکرد. ئەوەی دەربارەی باوکی لەبیرم بێت ئەوەیە، کابرایەکی پیری ڕەزا گران بوو (ڕەنگە من وا بیرم کردبێتەوەو ئەم هەڵسەنگاندنەم لە ئێرەییەوە سەرچاوەی گرتبێت). *{دواتر، ڕۆژێك هەواڵی پرتاوی مردنی باوکیم بیست، دواتر دەستبەجێ ئەو دەیەوێت لەگەڵ باوکیدا بە خاك بسپێردرێت}*.

هەروەك ئەوەی هەموان پێشبینی دەکەین، ئەم هەواڵە کاری باشی لە فرۆمی *(12)* ساڵانە کرد، ئەو خۆی ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە کردەوە کە ڕەنگە زۆربەمان ڕووبەڕووی ببینەوەو بپرسین: بۆچی؟ دواتر ئەو هەندێ وەڵامی دەسکەوت کە وەڵامی تەواو نەبوون، ڕاشکاوانە لە فرۆیدا ئەم وەڵامانەی چنگ کەوت*}*.

ڕووداوی دوەم گەورەتر بوو: جەنگی جیهانی یەکەم. لە تەمەنی لاوی *14* ساڵیدا، فرۆم ئەو سنوورانەی بە چاوی خۆی بینی کە ناسیونالیزم توانی بیانگاتێ. بە چواردەوری خۆیدا، ئەو ئەم پەیامەی دەبیست: ئێمە (ئەڵمانیەکان، یان وردتر، ئەڵمانیە مەسیحییەکان) مەزنین؛ ئەوان (ئینگلیزو هاوپەیمانەکانیان) بە کرێگیراوی بێنرخن. ڕق و کینە، "هستریای جەنگ"، بە باشترین شێوە فرۆمی تۆقاند.

جارێکی تر ئەو ویستی لە شتە ناعەقڵانیەکان ناعەقڵانیەتی ڕەفتاری گشتی- تێبگات. ئەم جارەیان ئەو هەندێ وەڵامی لە نووسینەکانی کارل مارکسەوە دەستکەوت.

با چیرۆکی ژیانی تەواوبکەین: فرۆم ساڵی *1922* لە هیدڵبێرگ بڕوانامەی وەرگرت. سەرەتای کارکردنی وەك چارەسەرکەری دەروونی بوو. ساڵی *1943* کۆچی کرد بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو لە شاری نیویۆرك نیشتەجێ بوو. لەوێدا لەگەڵ زۆر

بیریاری پەناهەندەی مەزنی تر یەکی گرتەوە کە لەوێ کۆببوونەوە، لەوانە کارین هۆرنی کە پێکەوە کاروبارێکیان ئەنجام دا.

لە سەروبەندی کۆتایی هاتنی ئەرکەکەیدا، فرۆم چوو بۆ شاری مەکسیکۆ بۆ وانەوتنەوە. لەوێ چەند لێکۆڵینەوەیەکی بەرچاوی کرد دەربارەی پەیوەندی نێوان چینی ئابووریو جۆرەکانی کەسێتی ئەوێ. فرۆم ساڵی *1980* لە سویسرا کۆچی دوایی کرد.

## تیۆر

هەروەك لە ژیاننامەکەدا ئاماژەیەکی پێدراوە، تیۆرەکەی فرۆم زیاتر بریتییە لە تێکەڵەیەك لە مارکس و فرۆید. بێگومان فرۆید جەخت لەسەر نەهەست (لاشعور)، پاڵنەرە بایۆلۆژییەکان، چەپاندن و هتد دەکات. بە دەربڕینێکی تر فرۆم ئەو حاڵەتە بە هەند وەردەگرێت کە کاراکتەرەکانی ئێمە لە لایەنی بایۆلۆژییەوە دیاریدەکرێت، بەڵام لە لایەکی ترەوە مارکس وا خەڵکی دەبینێ کە لە لایەن کۆمەڵگاکانیانەوە دیاریکراون، بە تایبەتیش لە لایەن سیستمی ئابووری کۆمەڵگاکانیانەوە.

فرۆم شتێکی تەواو نامۆی بۆ ئەم تێکەڵە دوو سیستمیە چارەنووسسازە زیاد کرد کە بریتیە لە ئایدیای (ئازادی). فرۆم ڕێگە بە خەڵك دەدات ئەو حەتمیەتەی مارکس و فرۆید ئەیگەڕێننەوە بۆیان فرازمەند (*franscend*) بکەن. لە ڕاستیدا ئەو ئازادی دەکاتە خەسڵەتی سەرەکی سروشتی مرۆڤ!

فرۆم ئاماژە بەوە دەدات چەندین نمونە هەیە ئەوە پیشان دەدەن کە حەتمیەت *determinsm* بە تەنها کاردەکات. نمونەیەکی باشی حەتمیەتی بایۆلۆژی پەتی، لای فرۆید، بریتیە لە گیانداران (لانی کەم هەرە سادەکانیان). گیانداران دەربارەی ئازادی دوودڵ نین.. غەریزەکانیان گرنگی بە هەموو شتێك دەدات. بۆ نمونە، مشکە کوێرە پێویستی بە ئەرکێکی ڕاوێژکارانە نیە هەتا بڕیار بدات کە چیمان لێ دەردەچێت، کاتێك گەورە دەبن: ئەوان هەر دەبنە مشکە کوێرە!

نمونەیەکی باشیش دەربارەی حەتمیەتی ئابوری– کۆمەڵایەتی لای مارکس، بریتیە لە کۆمەڵگای تەقلیدی چاخەکانی ناوەڕاست. ڕێك وەك مشکە کوێرەکان، خەڵکانێکی کەم لە سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاستدا پێویستیان بە کاری ڕاوێژکاری هەبوو: ئەوان قەدەریان هەبوو (*The Great Chain of Being*– زنجیری گەورەی بوون) هەتا پێیان بڵێت چی بکەن. بە شێوەیەکی بنەڕەتی، ئەگەر باوکت جوتیارێك بوو، ئەوا

هەروەك لە ژیاننامەکەدا ئاماژەیەکی پێدراوە، تیۆرەکەی فرۆم زیاتر بریتییە لە تێکەڵەیەك لە مارکس و فرۆید

تۆش دەبیتە جوتیار. ئەگەر باوکت پادشایەك بوو، ئەوا تۆش بە هەمان شێوەت لێدێت. ئەگەر تۆ ژنێك بوویت، ئەوا تەنها یەك ڕۆڵ هەبوە بۆ ئافرەت.

ئەمڕۆ، ڕەنگە ئێمە وەك گیاندارێك یان سڵەمینەوەیەك بڕوانینە ژیانی سەدەکانی ناوەڕاست، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە نەبوونی ئازادی کە لە لایەن حەتمیەتی بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتیەوە دەنوێنرێن ئاسانە. بێگومان ژیانی تۆ بنەماو مانای هەیە هۆکاری گەڕان بە دوای دەروون (نفس)دا نیە، تۆ لە ناویدا گونجاوی و هەرگیز کارەساتی کیان (قەوارە)ت نەچەشتوە.

گەر لە ڕووی مێژووییەوە قسە بکەین، ئەم ژیانە سادەیە بە سەرهەڵدانی ڕێنیسانس دەستیکرد بە گۆڕان. لە ڕێنیسانسدا خەڵك وا سەیری مرۆڤایەتیان دەکرد کە بریتی بێت لە سەنتەری گەردوون، لە جیاتی ئەوەی خوا سەنتەری گەردوون بێت. بە دەربڕینێکی تر، ئێمە تەنها پشت بە کەنیسە {و دامەزراوەی تری تەقلیدی} نابەستین لەو ڕێچکەیەدا کە چوینەتە سەری. دواتر وەرە سەر سەردەمی چاکسازییەکان *Reformation*، ئەوان ئەو ئایدیایەیان خستەڕوو کە هەریەکێك لە ئێمە بە شێوەیەکی تاکگەرایانە بەرپرسین لە پاکبوونەوە (خلاص)ی ڕۆحی خۆمان. دواتر شۆڕشە دیموکراتیخوازەکانی وەك ئەوەی ئەمریکاو فەرەنسا سەریانهەڵدا. ئێستا لە پڕێکدا ئێمە ڕووبەڕووی ئەوە بووینەوە کە خودی خۆمان بەڕێوەبەرین.

دوای ئەوە شۆڕشی پیشەسازی هاتە کایەوەو لەبری ئەوەی خاکەمان ئامادە بکەین بۆ کشتوکاڵ یان شتەکان بە دەستی خۆمان دروست بکەین، دەبوایە ڕەنجی خۆمان لە بەرامبەر پارەدا بگۆڕینەوە. لە پڕێکدا ئێمە بووینە فەرمانبەرو بەکارهێنەر! دواتر شۆڕشی سۆشیالیستی وەك ئەوەی لە ڕوسیاو چین ڕوویدا، سەریهەڵدا، کە ئایدیای زانستی ئابوری بەشداریکەری ناساند. ئیتر تۆ چیتر تەنها لە باشبوونی خۆت بەرپرس نەبوویت، بەڵکو لە باشبوونی کرێکارە هاوڕێکانیشت بەرپرس بوویت. کەواتە لە ماوەی تەنها (*500*) ساڵدا (ئایدیای تاك "فرد" بیروبۆچوون، هەست، ئاکار، ئازادی، و بەرپرسیارێتی تاك) هاتنە بوونەوە. بەڵام لەگەڵ تاکگەراییدا، تەنهایی و دابڕان و نامۆبوونیش هاتن. هەبوونی ئازادی شتێکی قورسە، کە ئازادیشمان هەبوو، ئێمە دەمانەوێت لێی هەڵبێین.

فرۆم سێ شێواز باسدەکات کە ئێمە لە ڕێگەیانەوە لە ئازادی هەڵدێین:

یەكەم: دەسەڵاتگەرایی. ئێمە لە هەوڵداین بۆ دووركەوتنەوە لە ئازادی، ئەویش لە ڕێگەی خۆ تێكەڵكردنمان لەگەڵ ئەوانی تردا، هەروەها لە ڕێگەی بوون بە بەشێك لە سیستمێكی دەسەڵاتگەرایی وەك كۆمەڵگەی چاخەكانی ناوەڕاست. دوو ڕێگە هەیە بۆ نزیكبوونەوە یان گرتنەبەری ئەم حاڵەتە. یەكەمیان بە ملكەچكردن بۆ هێزی كەسانی تر كە دەبێتە ناچالاك و بە گلەیی. دوەمیان ئەوەی خودی خۆت ببیتە دەسەڵاتێك، ببیتە كەسێك كە دانەری بنەماكانی كەسانی تر بێت. لە هەریەكێك لەم دوو ڕێگەیەدا، تۆ لە كیانی جیای خۆت هەڵدێیت.

فرۆم ئامازەی داوە بە ماسۆشیزم و سادیزم وەك توندترین دەربڕینی دەسەڵاتگەرایی و دەستنیشانی ئەوە دەكات كە هەردووكیان هەست بە زۆرلێكردن و ناچاركردن دەكەن بۆ ئەنجامدانی ڕۆڵە جیاوازەكانیان، بە شێوەیەك كە تەنانەت كەسێكی سادی، بە هەموو ئەو توانا ئاشكراو ڕوونەی بەسەر كەسی ماسۆشیدا هەیەتی، ئازاد نیە لە هەڵبژاردنی چالاكیەكانیدا. بەڵام دەربڕینە میانڕەوەكانی دەسەڵاتگەرایی لە هەموو شوێنێك هەن. لەزۆر چیندا، بۆ نمونە پەیمانێكی- ڕێككەوتن ئاشكرا لە نێوان خوێندكارو پرۆفیسۆرەكاندا هەیە: خوێندكاران داوای بنەما دەكەن، پرۆفیسۆرەكەش پابەندە بە وتنەوەی وانەكانیەوە. تا ئێرە هیچ شتێك خراپ نیەو شتەكان ئاساییین، بەڵام بەم ڕێگایە خوێندكارەكان لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی فێربونیان دوور دەكەونەوە، پرۆفیسۆرەكەش دەتوانێت خۆی لە وەرگرتنی هەر مەسەلەیەكی گرنگ بدزێتەوە لە بوارەكەی خۆیدا.

فرۆم ئامازەی داوە بە ماسۆشیزم و سادیزم وەك توندترین دەربڕینی دەسەڵاتگەرایی و دەستنیشانی ئەوە دەكات كە هەردووكیان هەست بە زۆرلێكردن و ناچاركردن دەكەن بۆ ئەنجامدانی ڕۆڵە جیاوازەكانیان

دوەم: وێرانكارێتی: دەسەڵاتخوازەكان وەڵامی بوونێكی پڕ ئازاری بە كوشتنی خۆیان دەدەنەوە: ئەگەر من نەبم، چۆن شتێك دەتوانێت ئازارم بدات؟ بەڵام هەندێ كەسی تر، بە دەستوەشاندن لە دژی جیهان، وەڵامی ئازارەكانیان دەدەنەوە: ئەگەر من جیهان وێران بكەم، ئیتر چۆن جیهان دەتوانێت ئازاری من بدات؟ ئا ئەم خۆدزینەوەیەیە لە ئازادی كە زۆرێك لە بەدكاریو خراپیەكانی ژیانی لێدەكەوێتەوە وەك دڕندەیی، بەدكاری، شەرمەزاری، تاوان، تیرۆریزم.. هەروەها فرۆم ئەمەش زیاد دەكاتە سەر قسەكانیو دەڵێت ئەگەر ئارەزووی كەسێك بۆ وێرانكردن بە هۆی بارودۆخێكەوە ڕێی لێگیرا، ڕەنگە لە ژێرەوە یان لە ناخی خۆیدا دووبارە ئاراستەی بكاتەوە. بێگومان ئاشكراترین جۆری خۆوێرانكردن بریتیە لە خۆكوشتن، بەڵام ئێمە دەتوانین چەندین جۆری نەخۆشیش زیادبكەین وەك ئالوودەبوون بە ماددە بێهۆشكەرەكان و ئەلكهولەوە، تەنانەت چێژی كات بەسەربردنی ناچالاكیش. فرۆم

غەریزەی مردن لای فرۆید ئاوەژوو دەکاتەوە: خود– وێرانکارێتی ڕێگرە لە بەردەم وێرانکارێتیدا نەك شتی تر.

سێیەم: پیادەکردنی بێسۆزی: دەسەڵاتخوازان بە خۆشاردنەوە لەناو دەزگایەکی دەسەڵاتگەرادا لە ئازادی هەڵدێن. بەڵام کۆمەڵگەی ئێمە جەخت لەسەر یەکسانی دەکاتەوە. دەزگای کەم هەن بۆ خۆشاردنەوە (هەرچەندە زۆر دەزگا هەر دەمێنن بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، هەشن بۆ ئەوانەی نایانەوێت). کاتێك ئێمە پێویستمان بە خۆشاردنەوە دەبێت، ئەوا لە جیاتیدا ئێمە لەناو کلتوری بەرفراوانی خۆماندا خۆمان دەشارینەوە. کاتێك سەرلەبەیانی خۆم دەگۆڕم، ئەوا چەندین بڕیار لە بەردەممدایە! بەڵام من تەنها پێویستم بەوە هەیە سەیری تۆ بکەم کە چیت لەبەرکردوە، ئیتر ڕێگرەکانم دیارنامێنن. یان دەتوانم سەیری تەلەفزیۆن بکەم، وەك بەختگرەوەیەکی ئەستێرەوان، بە خێرایی پێم دەڵێت چی بکەم. ئەگەر من وەك هەر کەسێکی تری ناو کۆمەڵگەکەم بیربکەمەوە، هەست بکەم، قسە بکەم، ڕەفتار بکەم، ئەوا لەناو قەرەباڵغییەکەدا دیارنامێنم و پێویستم بەوە نابێت کە ئازادی خۆم قبووڵ بکەم یان بەرپرسیارێتی وەربگرم. ئەمە هاوتای ئاسۆیی دەسەڵاتگەرایییە. ئەو کەسەی پیادەی بێسۆزی دەکات (وەك ئامێر ڕەفتار دەکات)، وەك مارمێلکەیەکی کۆمەڵایەتی وایە کە لەگەڵ هەموو بارودۆخەکانی تیایدا دەژی، خۆی دەگونجێنێت. کاتێك ئەو لە ملیۆنێك خەڵکی تر دەچێت، ئەو چیتر هەست بە تەنهایی ناکات. ڕەنگە ئەو تەنها نەبێت، بەڵام خودی خۆشی نیە. کەسێك کە پەیڕەوکەری بێسۆزییە تووشی دابەشبوونێك دەبێت لە نێوان هەستە ڕەسەنەکانیو ئەو ڕەنگانەی پیشانی جیهانی دەدات، ئەو زۆر لەگەڵ چەند هێڵێکی تیۆرەکەی هۆرنیدا یەکدێتەوە.

لە ڕاستیدا، لەوەتەی "سروشتی ڕاستەقینەی" مرۆڤایەتی بریتییە لە ئازادی، هەریەکێك لەم هەڵاتنانە لە ئازادی لە خودی خۆمانمان نامۆ دەکات. ئەمە قسەکانی فرۆمە لەم بارەیەوە:

*مرۆڤ وەك حاڵەتێکی شازو ناسروشتی لە دایك دەبێت، لەناو سروشتدا دەژی کەچی فرازمەندیشی دەکات (franssend). پێویستە لەسەر مرۆڤ بنەماگەلێکی چالاکیو بڕیاردان بدۆزێتەوە کە جێگەی بنەما غەریزیەکان بگرێتەوە. پێویستە مرۆڤ چوارچێوەیەکی ئامادەیی هەبێت ڕێگەی پێبدات کە وێنەیەکی ڕێکخراوی جیهان وەك بارودۆخی چالاکیە ڕێکخراوەکان، ڕێکبخات.*

لە ڕاستیدا، لەوەتەی "سروشتی ڕاستەقینەی" مرۆڤایەتی بریتییە لە ئازادی، هەریەکێك لەم هەڵاتنانە لە ئازادی لە خودی خۆمانمان نامۆ دەکات

مـرۆڤ نـەك تەنـها پێویسـتە لـە دژی مەترسـییەکانی مـردن، لـە برسـا مـردن و ئازارچەشـتن بجـەنگێت، بـەڵکو پێویسـتە لـە دژی تورەییـەکی تریـش بجـەنگێت کـە بریتییە لە رەگەزێکی مرۆڤی. مەترسی ئەوەی کە ناتەندروست بێت. بە دەربڕینێکی تر، پێویستە نەك تەنها خۆی لە مەترسی لە دەستدانی ژیانی بپارێزێت، بەڵکو خۆی لە مەترسـی لـە دەسـتدانی مێشکیشـی بپـارێزێت. (فـرۆم *1968*، لا *61*). پێویسـتە مـن لێرەدا ئازادی وەك ئایدیایەکی ئاڵۆز زیاد بکەم، کە فرۆم قسـە دەربـارەی ئازادییـەکی شەخسـی "ڕاسـتەقینە" دەکـات، زیـاتر لـەوەی مەبەسـتی لـە ئازادییـەکی سیاسـی (کـە زۆرجـار پێـی دەوترێـت ئـازادی) بێـت: زۆربـەی زۆری ئێمـە، جـا ئـازاد بـن یـان نـەء، ئـارەزووی حـەزکردن لـە ئایدیـای ئـازادی سیاسـی دەکـەین، چونکـە ئەمـە مانـای ئـەوە دەگەیـەنێت کـە ئێمـە دەتوانین حـەزمان لـەچی بوو بیکـەین. باشترین نمونـە کەسـێکی سـادی سێکسـییە (یـان ماسۆشـیەك) کـە گرفتێکـی دەروونـی هەیـەو پاڵنـەری رەفتارەکانیـەتی. ئـەو لـە ڕووی شەخسـییەوە ئـازاد نییـە، بـەڵام ئـەو پێشـوازی لـە کۆمەڵگەیـەکی ئـازاد لـە ڕووی سیاسـییەوە دەکـات کـە پێـی بڵێـت ئـەوەی گـەورەکان (کەسە پێگەیشتوەکان) دەیکەن لە نێوان خۆیاندا، کاری دەوڵەت نییە! نموونەیەکی تر کە زۆربەی ئێمە دەگرێتەوە لەم رۆژگارەدا: ڕەنگـە ئێمـە بـاش بجـەنگین بـۆ ئـازادی (لـە جۆرە سیاسـییەکەی)، بـەڵام کـاتێك بـە دەسـتی دەهێنـین، ئێمـە حەزدەکـەین پابـەند (ملتزم) بین و زۆرجاریش نابەرپرسیار دەبین. ئێمە دەنگمان هەیە بۆ هەڵبژاردن، بەڵام شکست دەهێنین لە بەکارهێنانیدا! فرۆم زۆر باس لـە ئازادی سیاسی دەکات.. بـەڵام ئـەو بـە تایبـەت لـەوەدا بـە پەرۆشـە کـە ئێمـە ئـەو سەربەسـتییە بەکاردەبـەین و ئـەو بەرپرسیارێتییەش وەردەگرین کە لەگەڵیدا بەسەردەچێت.

## خێزانەکان

تۆ حەزدەکەیت کام هەڵهاتنە لە ئازادی بەکاربهێنیت؟ تـۆ لـە چ جۆرێکـی خێزاندا پـەروەردە بوویـت؟ فـرۆم دوو جـۆر لـە خـێزانی نابەرهەمـهێن (*Unproactine*) دەستنیشان دەکات:

***1-خێزانە پشت بەیەکتر بەستوەکان*** (*Symbiotic families*)**:**

سیمبایۆتیك ئەو پەیوەندیەیە دوو ئۆرگانیزم هەیانەو ناتوانن بەبێ یەکتری بژین. لە خێزانی سیمبایۆتیکدا، هەندێ لە ئەندامەکانی خێزان لـە لایـەن چـەند ئەندامێکی ترەوە "دەقۆزرێنـەوە"، هـەتا ئـەوان نـاتوانن کـە شەخسـیاتگەلێك بـۆ خۆیـان گەشـە

پێبدەن. نموونەی لەوە ئاشكراتر ئەو حاڵەتەیە كە دایك و باوك منداڵەكەیان هەڵدەلوشن، تا بە شێوەیەكی لێدێت كەسایەتی منداڵەكە تەنها ڕەنگدانەوەی حەزی دایك و باوكەكە دەبێت. لە زۆرێك لە كۆمەڵگە تەقلیدییەكاندا، ئەمە حاڵی منداڵانە، بە تایبەتی كچان. نموونەیەكی تر ئەو حاڵەتەیە كە منداڵەكە دایك و باوكی هەڵدەلووشێت. لەم حاڵەتەدا منداڵەكە كۆنترۆڵی دایك و باوكی دەكات كە لە بنەڕەتدا بۆ خزمەتكردنی منداڵەكە بوونیان هەیە. گەر ئەمە بە نائاساییو نامۆ بێتە بەرچاو، ئەوە من دڵنیات دەكەمەوە كە ئەمە زۆر ئاساییو بەربڵاوە بە تایبەت لە كۆمەڵگە تەقلیدییەكانداو بە تایبەت لە پەیوەندی كوڕ بە دایكەوە. لە چوارچێوەی قسەكردن لەم كلتورە تایبەتە، زۆر پێویستە بزانرێت كە كوڕێك چەندی تر فێری هونەری دەسەڵات دەبێت، ئەو دەسەڵاتەی پێویستی دەبێت بۆ ئەوەی وەك پێگەیشتوویەك بژی؟

لە ڕاستیدا، زۆربەی كەس لە كۆمەڵگەیەكی تەقلیدیدا فێری هەردوو حاڵەتی چۆنێتی كۆنترۆڵكردن و چۆنێتی ملكەچ كردن دەبێت. لەو كاتەوەی كە هەموو كەس لە دەزگای كۆمەڵایەتیدا كەسێكی هەیە كە لە سەروویەوە بێت و كەسێكی هەیە لە خواروو خۆیەوە بێت. ڕوونتر، كەسی دەسەڵاتخواز لە كۆمەڵگەی لەم جۆرەدا خۆی لە ئازادی دەدزێتەوە. بەڵام تێبینی ئەوە بكە كە بۆ هەموو ئەمەش ڕەنگە ئەمە پێوەرە مۆدێرنەكانی ئێمە بۆ یەكسانی ببەزێنێت، ئەمە ئەو شێوازەیە كە خەڵكی بۆ ماوەی هەزاران ساڵ تیایدا ژیاون. ئەمە سیستمێكی كۆمەڵایەتی جێگیرەو ڕێگە بە بڕێكی زۆر لە خۆشەویستیو هاوڕێیەتی دەدات كە بلیۆنەها خەڵك لەناویا بژین.

لە ڕاستیدا، زۆربەی كەس لە كۆمەڵگەیەكی تەقلیدیدا فێری هەردوو حاڵەتی چۆنێتی كۆنترۆڵكردن و چۆنێتی ملكەچ كردن دەبێت

### 2-**خێزانە پاشەكشە كردوەكان**- *Withdrawing families*.

لە ڕاستیدا، جێگرەوەی سەرەكی بەوە ناسراوە كە ئەگەر قێزەوەندو ساردوسڕ نەبێت، ئەوا بێپەروایەكی ساردە. هەرچەندە پاشەكشەكردن وەك ستایڵی خێزان هەمیشە هەبوە، بەڵام لەم چەند سەد ساڵەی دواییدا دەستیكرد بە كۆنترۆڵكردنی چەند كۆمەڵگەیەك، ئەمەش لەوكاتەوە بوو كە بۆرژواكان –چینی بازرگان– وەك هێز هاتنە ناو كایەكەوە.

جۆرە (سارد)ەكە كە لە هەردوو جۆرەكەی تر كۆنترە، لە باكوری ئەوروپاو چەند بەشێكی ئاسیا، هەروەها لەهەر شوێنێك بازرگانەكان چینی بەهێز بووبن، بینراوە. باوك و دایك زۆر داواكارن لە منداڵەكانیان، ئەو منداڵانەی چاوەڕێ دەكرێ بۆ

بەرزکردنەوەی پێوەری باش و شێوە –بەندکراو بژین. سزادان هەر تەنها ئەوە نییە کە لە نیوەی نانخواردندا کۆڵەمشتێك بکێشرێت بە تەپڵی سەردا، بەڵکو بریتییە لە کاروبارێکی ڕەسمیو سروتێکی تەواو دامەزراوە کە بە شێوەیەك ئەگەری ڕووناکی لێبڕین و خستنە ژوورێکی کلۆمدراوی لێ چاوەڕوان دەکرێت. سزادان بریتییە لە کردارێکی خوێن ساردانە لە پێناو باشبوونی تۆدا ئەنجام دەدرێت. ڕەنگە لە جیاتی ئەمە، کلتورێك گوناه و لێسەندنەوەی سۆز وەك سزا بەکاربهێنرێت. لەهەر شێوازێکیاندا، منالان لەو کلتورانەدا بە شێوەیەکی بەهێز پاڵیان پێوە دەنرێت لەو شتەی کە کلتورەکەیان وەك سەرکەوتن دەستنیشانی کردوە، سەربکەون. دوەم جۆری خێزانی پاشەکشە کردوو بریتییە لە خێزانی مۆدێرن کە لە بەشە زۆر پێشکەوتوەکانی جیهاندا دەبینرێت، بە تایبەت لە ئەمەریکا زۆر بەرچاوە. گۆڕان لە ئاراستەکانی پەروەردەکردنی منالدا وایکرد خەڵکانێکی زۆر لە پەروەردەکردنی منالدا، سزای جەستەییو گوناه– دانەپاڵ وەلابنێن. ئایدیای نوێ بریتییە لەوەی منالەکەی خۆت وەك هاوتاکانی خۆت بنرخێنیت. پێویستە باوك ببێتە باشترین هاوڕێی کوڕەکەی. دایکێك پێویستە ببێتە هاوڕێی ڕوحی کچەکەی، بەڵام لە پرۆسەی کۆنترۆلکردنی سۆزی منالەکانیاندا، باوك و دایك بە شێوەیەکی ساردو سڕانە فەرامۆشکەر دەبن. ئەوان لە ڕاستیدا چیتر دایك و باوکی ڕاستی نین، بەڵکو تەنها پەیوەندی پێکەوەژیان لەگەڵ منالەکانیاندا کۆیان دەکاتەوە. ئیتر لەم کاتەدا، منالەکان بەبێ هیچ ڕێبەرێك (پێگەیشتوان– گەورەکان)، بادەدەنە سەر هاوتەمەنەکانی خۆیان و بوارەکانی ڕاگەیاندن بۆ دۆزینەوەی بەهاکانیان. ئەمەیە خێزانی مۆدێرنی بێبایەخ!

هەڵاتن لە ئازادی، لێرەدا بە شێوەیەکی تایبەت ئاشکرایە: ئەویش بریتییە لە پابەندبوون بە بێسۆزییەوە. هەرچەندە تا ئێستا ئەمە کەمینەکی بچووکی خێزانە لە جیهاندا (بێگومان جگە لە تەلەفزیۆن)، کەچی ئەو جۆرەیە کە فرۆم زۆر دوودڵە بەرامبەری. وا دەردەکەوێت کە ئەمە پێشبینی داهاتوو بکات.

چی دەبێتە هۆی پێکهێنانی خێزانێکی بە بەرهەم و تەندروست و باش؟ فرۆم پێی وایە ئەو خێزانەی کە تیایدا دایك و باوك بەرپرسیارێتی فێرکردنی منالەکانیان لەسەر بنەڕەتی عەقڵ لە ژینگەیەکی خۆشەویستیدا دەگرنە ئەستۆ، خێزانێکی سەرکەوتوو دەردەچێت گەورەبوونی منال لە خێزانێکی لەم جۆرەدا دەبێتە هۆی ئەوەی منال ڕێز لە ئازادییەکەی بگرێت و بەرپرسیارێتی لە ئەستۆی خۆی بگرێت و دواجار بەرپرسیارێتی کۆمەڵگە وەك گشتێك بگرێتە ئەستۆی خۆی.

چی دەبێتە هۆی پێکهێنانی خێزانێکی بە بەرهەم و تەندروست و باش؟ فرۆم پێی وایە ئەو خێزانەی کە تیایدا دایك و باوك بەرپرسیارێتی فێرکردنی منالەکانیان لەسەر بنەڕەتی عەقڵ لە ژینگەیەکی خۆشەویستیدا دەگرنە ئەستۆ، خێزانێکی سەرکەوتوو دەردەچێت

## ناهۆشیاری کۆمەڵایەتی

زۆربەی زۆری خێزانەکانمان تەنها ڕەنگدانەوەی کۆمەڵگەو کلتورەکانمانن. فرۆم جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئێمە کۆمەڵگاکانمان بە شیری دایکمان خوساندوە. ئەمە هێندە لێمانەوە نزیکە زۆرجار بیرمان دەچێت کە کۆمەڵگەی ئێمە تەنها ڕێگەیەکە لەو ژمارە بێکۆتاییانەی ڕێگاکانی لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکانی ژیان. ئێمە زۆرجار وا هەست دەکەین کە شێوازی ئێمە بۆ کردنی شتەکان تەنها شێوازە و شێوازێکی سروشتییە. ئێمە باش فێربووین. هەموو ئەمانە بوونەتە ناهۆشیاری- ناهۆشیاری کۆمەڵایەتی. کەواتە زۆرجار لەو باوەڕەداین ئێمە بە پێی ویستی ئازادی خۆمان ڕەفتار دەکەین، بەڵام ئێمە تەنها دوای فرمانەکان کەوتووین و وەها لەسەری ڕاهاتووین کە چیتر تێبینییان ناکەین.

فرۆم لەو باوەڕەدایە کە بە پشکنینی سیستەمی کۆمەڵایەتیمان، باشتر لە ناهۆشیاری کۆمەڵایەتیمان بە ئاگا دەبین. لە ڕاستیدا فرۆم پێنج جۆر کەسێتی دەستنیشان دەکات یان ناودەنێت، کە بە ڕێچکەکان *Orientations* ناویان دەبات، لە هەلومەرجێکی ئابووریدا.

*1*- ڕێچکەی وەرگرانە *The receptive Orientation*: ئەمە ئەو جۆرە کەسانە دەگرێتەوە کەوا پێشبینی دەکەن ئەوەی پێویستیانە دەستیان بکەوێت. ئەگەر دەستبەجێش دەستیان نەکەوت، ئەوا چاوەڕوانی دەکەن. ئەوان لەو باوەڕەدان کە هەموو کەلوپەلەکان و خۆشییەکانیش لە دەرەوەی خۆیانەوە دێن. ئەم جۆرە لەنێو دانیشتوانی جوتیاراندا زۆر بڵاوە. هەروەها نموونەی ئەم جۆرە کەسانە لەو کلتورانەدا زۆر بەرچاو دەکەوێت کە خاوەنی سەرچاوەی سروشتی زۆرو زەوەندی تایبەتن. لەبەرئەوە کەسێك پێویستی بەوە نییە زۆر تێبکۆشێت بۆ بەدەستهێنانی بژێوی (هەرچەندە ڕەنگە سروشت لە پڕێکدا ئەم بەخشندەییەی خۆی بکشێنێتەوە!). هەروەها لە پلە هەرە نزمەکانی هەر کۆمەڵگایەکیشدا بەدی دەکرێت: کۆیلەکان، سوخرەکێشەکان، خێزانە خۆشگوزەرانەکان، کرێکارە کۆچبەرەکان.. هەموویان لە بەردەم بەزەیی یەکتریدان.

ئەم ڕێچکەیە *Orientation* لەگەڵ خێزانە پشت بە یەکتر بەستوەکاندا دەگونجێت، بە تایبەت کە تیایدا منداڵەکان لە لایەن دایك و باوکەوە "دەقۆزرێنەوە"، هەروەها لەگەڵ

فرۆم لەو باوەڕەدایە کە بە پشکنینی سیستەمی کۆمەڵایەتیمان، باشتر لە ناهۆشیاری کۆمەڵایەتیمان بە ئاگا دەبین

فۆرمـە ماسۆشیسـتەکەی دەسەڵاتگەرایشـدا دەگونجێـت. ئەمـە هاوشـێوەیە لەگـەڵ ناچالاکی زارەکی فرۆیدو ئـارەزووی بەدەسـتهێنانی ئەدلـەرو، کەسـایەتی گونجـاوی هۆرنیدا. لە فۆرمە توندوتیژەکەیدا، ئەم ڕێچکەیە دەتوانرێت بە ئاوەڵناوی وەك ملکەچ *Submissive*، و ئاواتەخواز *Wishful* دەستنیشان بکرێت. لە فۆرمێکی میانەڕەوانەتردا، ئاوەڵناوی وەکو قبووڵکردن *accepting* و گەشبین *optimistic* زیاتر وەسفین.

*2*–ڕێچکەی بەکاربەرانە *exploitative orientation*. ئەم جۆرە خەڵکانە پێیان وایـە ئـەوەی پێویستیانە پێویسـتە بیبـەن. لـە ڕاسـتیدا شـتەکان لـە نرخـدا زیـاد دەکـەن بـە جۆرێـك کـە لـە کەسـانی تـر دەبرێـت: سـامان بەوپـەڕی ئارەزووکردنـەوە دەدزرێـت، ئایدیاکـان دەدزرێــن و بــەناوی تــرەوە بڵاودەکرێنــەوە، خۆشەویســتی لــە ڕێگــەی ناچارکردنــەوە دەکرێــت. ئــەمجۆرە لـــەنێو چینـــە بـــەرزەکانی ئیمپراتۆریەتـــە کۆلۆنیالیستەکان و ئەرستۆکراسیەتەکانی مێژوودا زۆر بەرچاوە. بۆ نموونـە بـیر لـە ئینگلیزەکان بکەرەوە لە هیندستان: پێگەی ئینگلیزەکان بە شێوەیەکی گشتگیر لەسەر بناغەی توانایان لە زەوتکردنی شتوومەکی خەڵکی مەدەنیەوە سەرچاوەی گرتبوو. یەکێك لە تایبەتمەندێتییەکانی ئەم جۆرە کەسانە بریتییە لە توانای ئاسوودەبوون لە فەرمانکردن بەسەر کەسانی دەوروبەردا! هەروەها نموونەی ئەم کەسانە لـە بەربەریـە گوندنشـینەکان و ئـەو کۆمەڵگەیانــەی پشــت بــە ســوارچاکی دەبەســتن (وەك لــە ڤایکینکەکاندا هەیە).

ڕێچکەی بەکاربەرانـە لەگەڵ لایـەنی (قۆستراوانەی) خێزانی پشت بـە یەکبەسـتوو شێوازی ماسۆشیانەی دەسەڵاتگەراییدا وێکدێتەوە. ئەم کەسانە بریتین لە دوژمنکاری زارەکی فرۆیـدو فـەرمانڕەوای کۆنترۆڵکەری ئادلـەرو، جـۆری دوژمنکارانـەی هۆرنـی. ئەمانە بە ڕادەیـەکی زۆر دوژمنکـارو خۆبـە گرنگزان و هەڵخەڵەتێنـەرن ئەمـە سـەرباری سیفاتە دروستەکانیان کە بە بڕواو پڕشانازیو سەرنجڕاکێشن.

*3*–ڕێچکەی پاشەکەوتکەرانە: خـەڵکی پاشـەکەوتکەر ئـارەزووی پاراسـتنی شـت دەکـەن. ئـەوان جیـهان وەك کەلوپـەل و کـاڵا دەبینـن، تەنانـەت خۆشەویسـترین شـت ئەوانـەن کـە دەتوانرێـت خـاوەندارێتی بکرێـت و بپـارێزێن یـان بکڕیـێـن. فـرۆم، بـە بەکارهێنانی ئایدیای کارل مارکس، ئەم جۆرە کەسانە پەیوەست دەکات بە بۆرژوا، چینی ناوەندی بازرگانەکان و جوتیارە دەوڵەمەندو خەڵکە سەنعەتکارەکانەوە. ئەو ئەم جـۆرە بـە شـێوەیەکی تایبــەت لەگـەڵ کـاری ئاکـاری پرۆتســتانت و گروپــی وەك پیوریتانەکانی ئێمەدا دەگونجێنێت.

پاشەکەوت کردن لەگەڵ فۆرمە سادەکەی خێزانی پاشەکشێ کردوودا دەگونجێت، هەروەها لەگەڵ وێرانکاریشدا دەگونجێت. پێویستە ئەوە زیادبکەم کە لێرەدا پەیوەندییەکی ئاشکرا بە (تەواوی گەرایی *oerfectinism*)یشەوە هەیە. فرۆید ئەمە بە جۆری (*anal retentive*) ناودەبات، ئادلەریش بە جۆری دوورەپەرێز ناویدەبات و هۆرنیش ناویناوە جۆری پاشەکشەکردوو. لە فۆرمە پەتییەکەیدا، ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ کەللەڕەق و چرووك و نابیرمەندیت. ئەگەر تۆ جۆرێکی مامناوەندی جۆری پاشەکەوتکەریت، ئەوا تۆ دڵسۆزو، بە ئابووری، کردارەکیت.

4–ڕێچکەی بازاڕخواز *The Merketing Orientation*: ڕێچکەی بازاڕخواز داوای فرۆشتن دەکات سەرکەوتن لەوەدایە کە چۆن بتوانم بە باشی خۆم بفرۆشم، خۆم بکەمە پاکەتەوە، چۆن بانگەشە بۆ خۆم بکەم، خێزانەکەم، خوێندنم، کارو فەرمانەکانم، جلوبەرگەکانم.. هەموویان بریتین لە بانگەشەیەك و پێویستە "ڕاست" بن. تەنانەت خۆشەویستیش وەك مەسەلەیەکی ئابووری سەیردەکرێت. تەنها ڕێچکەی بازاڕخواز عەقدی هاوسەرێتی دەهێنێتە ئاراوە کە تیایدا ئێمە لەسەر ئەوەی من ئەوەو ئەوە دابین دەکەم، لە بەرامبەردا تۆ دەبێت ئەمەو ئەوە دابین بکەیت. ئەگەر چەند کەسانێك لە ئێمە شکستیان خوارد لە پابەندبوون بە کۆتایی ڕێکخستنەکانەوە، ئەوا هاوسەرێتییەکە پووچ و نامەشروع دەردەچێت و هەستی قووڵی تیا نامێنێت (لەوانەشە هێشتا بتوانین باشترین هاوڕێ بین!). لە ڕوانگەی فرۆمەوە، ئەمە ڕێچکەی کۆمەڵگەی پیشەسازی مۆدێرنە. ئەمە ڕێچکەی ئێمەیە! جۆری مۆدێرن لە خێزانی پاشەکشەکردووی ساردوسڕەوە دێتەدەرو ئارەزوو دەکات کە پابەندبوونی بێسۆزی بەکاربهێنێت وەك خۆدزینەوەو هەڵاتنی لە ئازادی. ئادلەرو هۆرنی هاوشێوەی ئەمەیان نییە، بەڵام فرۆید هەیەتی: ئەمە لانی کەم نیوەی کەسێتی نێرگەرایی تەمومژاوییە، کە جۆرێکە لە ژین وەك سەنجڕاکێشییەکی سێکسی ڕاگوزار. لە زۆرترین ڕادەدا، کەسی بازاڕخواز هەلپەرست، عەقڵ و منداڵ و نەزانە. لانی کەمیش ئەو کەسە بە مەبەست و لاوچاك و کۆمەڵایەتییە. سەرنج لە بەهاکانی ئەمڕۆ بدە کە لە ڕێگەی هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە پێمان دەگات: مۆدێل، ڕێکپۆشی، لاوێتی هەمیشەیی، سەرکێشی، بوێری، تازەیی، سیکسوالێتی.. ئەمانە جێگەی بایەخی "یوپی– *yuppie*"– {کەسێکی گەنجە کە تەنها بایەخ بە کارەکەی دەدات و پارەیەکی زۆر کۆدەکاتەوەو لە کڕینی شتی گرانبەهادا خەرجی دەکات و–}ەکانە. ڕووکەش هەموو شتێکە!

5-ڕێچکــەی بەرهەمهێنەرانــە: *The Productive Orientation*: لــەم حاڵەتــەدا کەسێتییەکی تەندروست هەیە، فرۆم بەم بۆنەیەوە وەك ئەو کەسەی ماسکی نەپۆشیوە ئاماژەی بۆ دەکات. ئەمە ئەو کەسەیە بەبێ نکوڵی کــردن لــە سروشــتی بـایۆلۆژیو کۆمەڵایەتی خۆی، خۆی لە ئازادی و بەرپرسیارێتی نادزێتەوە. ئەم جۆرە کەسانە لە خێزانێکەوە سەرچاوە دەگرن کە خۆشەویستی تیا دەکرێت بەبێ ئەوەی تاك تێکوپێك بشــکێ، ئــەو تاکــەی کــە عــەقڵی بــەلاوە باشــترە لــە ڕێســاکان و ئــازادی لاباشــترە وەك لە پابەندبوون.

ئەو کۆمەڵگەیـەی ڕێخۆشکەرە لـە بەردەم سـەرهەڵدانی جـۆری بەرهەمهێنـەردا بـە بۆچوونی فرۆم هێشتا بوونی نییە. بەڵام گومانی تێدا نییە ئەو هـەندێ ئایدیای هەیە دەربـارەی ئـەوەی کــە ئـەو کۆمەڵگەیــە چــۆن چۆنــی دەبێــت. فــرۆم نــاوی دەنێــت سۆشیالیزمی کۆمۆنگەرایی مرۆڤی *humanistic cimunitarian socialism* ئەم دەربڕینە زۆر دوورو درێــژەو لــە چــەند وشــەیەك پێکــهاتوە کــە بــە تــەواوەتی لــە ویلایەتــە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا باو نین، بەڵام با ڕوونی بکەمـەوە: مرۆڤـی *humanistic* واتـە ئارەزووکردن بەلای مرۆڤەکاندا، نەك ئارەزووکردن بەرەو کیـانێکی بـەرزتر.. نـەوەك بۆ دەوڵەتی بەهێز، نـەوەك بۆ چەمکی کەسێك (بـۆ خـوا). کۆمۆنگـەرایی *Communitorian* واتە لە جڤاتی بچووك بچووك پێکهاتوە، وەك ئەوەی ڕووبەڕووی حکومەتی گەورە یان دامــەزراوەکان دەبێتــەوە. سۆشــیالیزمیش واتــە هــەر کەســێك بەرپرســیارە لــە خۆشـگوزەرانی هـەر کەسێکی تـر. بـەم جـۆرە تێگەیشـتنەوە گفتوگۆکـردن لـە بـارەی ئایدیالیزمی فۆرمەوە کارێکی گرانە!.

فرۆم دەڵێت چوار ڕێچکەی یەکەم (کە ڕەنگە کەسانی تر بە نیوروتیك *Neurotic* یان عوصـاب نـاوی بـەرن) لـە مـۆدی هـەبوون *The haviny mode*دا دەژیـن. ئـەوان تـەرکیز دەخەنـە سـەر بـەکارهێنان، بەدەستهێنان، خـاوەنداریتی.. ئـەوان بـەو شـتانەی هەیانـە دیاریدەکرێن. فرۆم دەڵێت "من ئەو شتەم هەیە" دەگۆڕێت بۆ ئەوەی "ئـەو شـتە منـی هەیە" و ئێمە لە لایـەن کاڵاو کەلوپەلەکانمانـەوە ئاراستە دەکرێـین! لە لایـەکی تـرەوە ڕێچکەی بەرهەمهێنەرانە لە مۆدی هەبووندا دەژی. ڕەفتارەکانی تۆ لـەم دنیایـەدا ئـەوە دیـاری دەکـات کـە تـۆ چیـت. تـۆ بـە بـێ ماسـك دەژیـت، ئـەزموونی ژیـان دەکـەیت، پەیوەست دەبیت بە خەڵکەوەو دەبیتە خۆت.

فرۆم دەڵێت زۆربـەی خـەڵکی وا ڕاهـاتوون لـە مـۆدی هـەبوون *having mode*دا بـن، وشـەی هـەبوون *have* بەکاردەهێن بۆ وەسفکردنی گرفتـەکانیان: "دکتـۆر، من گرفتێکم

فرۆم دەڵێت زۆربەی خەڵکی وا ڕاهاتوون لە مۆدی هەبوون *having mode*دا بن

هەیە: من ئینسۆمینیام هەیە. هەرچەندە من ماڵێکی جوانم هەیە، مناڵی سەرنجڕاکێشم هەیە، کەچی زۆر دوودڵم". ئەو کەسە چاوەڕێی پزیشکەکەیە کە شتە خراپەکان لابەرێت و شتە باشەکان بهێڵێتەوە، وەك ئەوەی داوا لە نوژدارێك بکەیت کە زراوت دەربهێنێت.

ئەوەی تۆ ڕەنگە بیڵێیت زیاتر لەوە دەچێت کە بڵێیت "من نەگبەتیمە. من دڵخۆشانە چوومەتە ژیانی هاوسەرێتییەوە، کەچی ناتوانم بنووم.." بەم وتنەدا دەردەکەوێت تۆ گرفتێکت هەیە، تۆ لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ڕاستییەی کە تۆ کێشەکەیت، خۆت دووردەخەیتەوە، واتە تۆ جارێکی تر خۆت لە وەرگرتنی بەرپرسیارێتی ژیانی خۆت دەدزیتەوە.

| هەڵهاتن لە ئازادی | خێزان | کۆمەڵگە | ڕێچکە |
|---|---|---|---|
| دەسەڵاتگەرایی (ماسۆشیستی) | پشت بە یەکبەستبوو (ناچالاك) | کۆمەڵگەی جوتیاری | وەرگر |
| دەسەڵاتگەرای (سادیستی) | پشت بە یەکبەستوو (چالاك) | کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتی | بەکاربەر |
| تەواوخواز بۆ وێرانکەر | پاشەکشەکردوو (پاکژگەرا) | کۆمەڵگەی بۆرژوازی | پاشکەوتکەرا |
| پابەندبوونی بێسۆزی | پاشەکشەکردوو (منالانە) | کۆمەڵگەی مۆدێرن | بازاڕخواز |
| سەربەستیو بەرپرسیارێتی پێزانراو و قبووڵ کراو | خۆشویستن و ئەقلاندن | سۆشیالیزمی جڤاتگەرایی مرۆڤی | بەرهەمهێن |

## بەد (**خراپ**) *Enil*

فرۆم هەمیشە حەزی بە هەوڵدان دەکرد بۆ تێگەیشتن لە خەڵکە بەد (خراپ)ەکانی جیهان.. نەك تەنها ئەوانەی کە شڵەژاو و گومڕاو گەمژەو نەخۆشن، بەڵکو ئەوانەی تەواو بە ئاگان لە خراپی کردەوەکانیان و بەهەر شێوازێك بێت ئەنجامی دەدەن: هیتلەر، ستالین، جیم جۆنز.. هتد، بە گەورەو بچووکەوە.

هەموو ئەو ڕێچکانەی کە قسەمان لە سەریان کردو بە بەرهەمهێن و نابەرهەمهێنەوە لە مۆدی هەبووندا یان لە مۆدی بووندا، لە یەك شتدا هاوبەشن: هەموو ئەمانە هەوڵ و ڕەنجن لە ژیاندا. بە هەمان شێوەی هۆرنی، فرۆم بڕوای وابوو کە تەنانەت

فرۆم هەمیشە حەزی بە هەوڵدان دەکرد بۆ تێگەیشتن لە خەڵکە بەد (خراپ)ەکانی جیهان.. نەك تەنها ئەوانەی کە شڵەژاو و گومڕاو گەمژەو نەخۆشن، بەڵکو ئەوانەی تەواو بە ئاگان لە خراپی کردەوەکانیان و بەهەر شێوازێك بێت ئەنجامی دەدەن

کارەساتبارترین حاڵەتی عوصاب لانی کەم هەوڵدەدات بۆ هەڵکردن لەگەڵ ژیاندا. ئەو کەسانە (بایۆفیلیەس *Biophlous*)ن واتا ژیانیان خۆش دەوێت.

جۆرێکی تر خەڵك هەن، فرۆم ناویان دەنێت (نیکرۆفیلیەس *necrophilous*) ئەوانەی عاشقی مردنن. ئەوان پەیوەستبوونێکی سۆزدارییان هەیە بە هەر شتێکەوە کە مردبێت، ڕزی بێت، ئەوە ئەو سۆزەیە کە دەیەوێت ئەو شتە زیندوە بگۆڕێت بۆ شتێکی نازیندوو؛ دەیەوێت لە پێناو وێرانکاریدا وێران بکات؛ بەرژەوەندی تایبەتی لە هەموو ئەمەدا بە شێوەیەکی پەتی میکانیکییە. ئەمە سۆزێکە بۆ "تێکوپێکدانی بنەما زیندوەکان".

جۆرێکی تر خەڵك هەن، فرۆم ناویان دەنێت (نیکرۆفیلیەس *necrophilous*) ئەوانەی عاشقی مردنن

گەر بیر لە سەردەمی خوێندنی ئامادەییت بکەیتەوە، ئەوا تۆ چەند کەسانێکی نەگونجاوت بیردەکەوێتەوە: کە ئارەزوومەندی مەترسیداری سینەما بوون. ڕەنگە ئەو کەسە نەگونجاوانە چەندین جۆری ئازارچەشتن ڕووشاندنی هەستیان دروست کردبێت و ویستویانە یاری جەنگئاسا بکەن. ئەوان حەزیان دەکرد کەلوپەلی وانەکانی کیمیا بکێشن بە هەموو شتێکدا. ئاژەڵە بچووکەکانیان دەدایە بەر شەق و تێهەڵدان. ئەوان بەهایان دەبەخشییە چەکەکانیان. ئەوان لە ڕاستیدا بەرەو هۆکارێکی میکانیکی دەڕۆیشتن.

لە بیرمە جارێکیان سەیری چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیم دەکرد، لە سەردەمی شەڕی نیکاراگوادا، چەندین بە کرێگیراوی ئەمریکی لەنێو کۆنتراکاندا هەبوون، یەکێکیان بە تایبەت چاوی پەیامنێرێکی بەستبووەوە. ئەو شارەزایەکی بواری چەکسازی بوو.. کەسێك بوو کە پردو باڵەخانەکانی هەڵدەتەکاندو سەربازەکانی دوژمنی لەناو دەبرد. کاتێك لێیان پرسی چۆن هێڵی ئەم جۆرە ئیشەی بەدەست هێناوە، ئەو زەردەخەنەیەك گرتیو بە پەیامنێرەکەی ڕاگەیاند کە ڕەنگە حەزی لەو چیرۆکە نەبێت. تۆ بۆت دەردەکەوێت ئەو کاتێك منالْ بوو فیشەکە شێتەی لە کلکی ئەو باڵندە بچووکانە دەبەست کە دەیگرتن و ئنجا بەری دەداو سەیری دەکرد کە چۆن دەتەقینەوە. فرۆم چەند گریمانەیەك دەکات کە چۆن کەسی لەم جۆرە پەیدا دەبێت. ئەو پێشبینی ئەوە دەکات کە ڕەنگە هەندێ هەڵچوونی جینی، وا بکات ئەو کەسانە لە هەست کردن یان سۆز وەرگرتن بێبەش بکات. ڕەنگە ئەمە مەسەلەیەکیش بێت پەیوەندی بە ژیانێکەوە هەبێت کە پڕ بێت لە بەربەست و ڕێگر. ئەو کەسانە باقی ژیانیان لە تورەییدا بەسەردەبن. لە کۆتاییشدا، ئەو پێشنیاری ئەوە دەکات کە ڕەنگە ئەمە مەسەلەیەك بێت پەیوەندی بە گەورە بوونەوە هەبێت لەگەڵ دایکێکی

نیکرۆفیلیدا، بە جۆرێك منداڵەکە کەسی نییە تا خۆشەویستی لێوە فێربێت. شتێکی زۆر شیاوە هەندێك لەو تێکەڵانە لە فاکتەرو هۆکارەکان لە کاردان. هێشتاش ئەو ئایدیایەی ئەو خەڵکانە ئەزانن چی دەکەن و بە ئاگان لە خراپەکانیان و هەڵیدەبژێرن، لە ئارادایە. ئەمە ئەو بابەتەیە لێکۆڵینەوەی زیاتری دەوێت.

| بایۆفیلیەس (ژیاندۆست) | | نیکرۆفیلیەس (مەرگدۆست) |
|---|---|---|
| مۆدی هەبوون | وەرگر<br>پاشەکەوتکەر<br>بەکاربەر<br>بازارخواز | |
| مۆدی بوون | بەرهەمهێن | |

## گفتوگۆ

لە هەندێ شێوازدا، فرۆم کەسایەتیەکی گۆڕاوە *Tronsition* یان ئەگەر پێت باش بێت، تیۆریستێکە تیۆری تر پێکەوە دەلکێنێت. ئەوەی جێگەی بایەخی ئێمەیە ئەوەیە ئەو تیۆری فرۆیدیو فرۆیدیە نوێیەکان، کە ئێمە باسمان کرد پێکەوە گرێ دەدات (بە تایبەت ئەدلەرو هۆرنی) و ئەو تیۆرە مرۆڤگەراییانەی دواتر باسیان دەکەین. لە ڕاستیدا فرۆم زۆر نزیکە لەوەوەی ئیگزستنشیالیستێك (وجودییەك) بێت کە زۆربەی جار ئەمە مەسەلەیەك نیە. من لەو باوەڕەدام بایەخی ئایدیاکانی بەرزتر دەبنەوە وەك چۆن سایکۆلۆژیای وجودی، ئەو هەلەی بۆ ڕەخسا.

ڕوویەکی تری تیۆرەکەی فرۆم کە نەرمونیانانەو دەگمەنە، ئەوەیە ئەو بایەخ بە ڕەگ و ڕیشە ئابووریو کلتوریەکانی کەسێتی دەدات. لەوەوپێش کەس بەو ڕاستەوخۆیەتیە ئەمەی نەکردوە. کەسێتی تۆ تا ڕادەیەکی بەرچاو ڕەنگدانەوەی جۆرە مەسەلەیەکی وەك چینی کۆمەڵایەتی، حاڵەتی کەمایەتی، پەروەردە، کارکردن، ئایین و زەمینەی فەلسەفییە. ئەمە تێڕوانینێکی ژێربەژێر بوە ڕەنگە بەو هۆیەوە بێت کە گونجانکارییەکی لەگەڵ مارکسیزمدا هەبێت، بەڵام بە بڕوای من شتێکی حەتمییە کە دەست بکەین بە زیاتر لەبەرچاوگرتنی ئەمە، بە تایبەت وەك دژە هاوسەنگییەك بۆ زیادبوونی کاریگەری تیۆرە بایۆلۆژییەکان.

د. موسا ئیبراهیم

# فاشیزم و نازیزم



ئەدۆلف هیتلەر



مۆسۆلینی

و: شوان ئەحمەد

## بەرایی

لەژێر کاریگەری فەلسەفەی سیاسی "هیگڵ" وتێزەکانی ئەو سەبارەت بە دەوڵەتی نیشتمانی –نەتەوەیی، "بسمارك" توانی بە هۆی ڕژێمە سیاسیە بەهێزەکەیەوە پاش سەرکەوتنی لە ساڵی *1870* بەسەر فەرەنسادا، ئەڵمانیا لە دەوڵەتێکی نەتەوەیی بەهێزو یەکگرتوودا ڕێك بخات.. لێرە بەدواوە ئەڵمانیا بوە دەوڵەتێك کە ڕۆڵی گرنگی لە سیاسەتی ئەوروپاو جیهاندا دەگێڕاو، هەر لەو ماوەیەشدا بوو بە یەکێك لە دەوڵەتە زلهێزەکانی دنیا.

لەم سەروبەندەدا ئەڵمانیا دەستی کرد بە داگیرکاری کۆڵۆنیالی، کارێك کە بوە مایەی ئەوەی دوچاری ململانێیەکی بەهێز بێت لەگەڵ دوو دەوڵەتی کۆڵۆنیالی مەزنی

هەریەك لە فەرەنساو بەریتانیا توانیان لە ڕێی موستەعمەراتە زۆرو زەوەندەکانیانەوە، بەسەر ئەو قەیرانەدا زاڵ بن و لە ڕێی ئەوانەوە درێژە بە گەشەی بواری پیشەسازی خۆیان بدەن

وەك (بەریتانیاو فەرەنسا). ئەم دوو دەوڵەتە لەو قۆناغەدا زۆربەی زۆری ناوچە دەڵەمەندو پڕ خێرو بێرەکانیان خستبوە ژێر ڕکێفی خۆیان و خاك و ئاوێکی بە کەڵکی وەها نەمابوەوە تا خواستە کۆلۆنیالیەکانی ئەڵەمانیا تێر بکات.

ئەمە لەسەر ئاستی دەرەوە، لەسەر ئاستی ناوخۆش تەواوی وڵاتانی ئەوروپا بە دەست کۆمەڵێك کێشەی کۆمەڵایەتیەوە گیرۆدە بوون. ئەو هەژاریو بێ نەواییەی چینی کرێکاران لە ئاکامی شۆڕشی پیشەسازی تێی کەوتبوون، بێ سنوور بوو. تەنانەت پرانسیپە دیموکراسیەکانیش نەیاندەتوانی پاساو بۆ ئەو واقیعە ناهەموارە بهێننەوە. وەك پەرچەکردارێك لە بەرامبەر ئەو هەلومەرجەدا، بزوتنەوە سەندیکایی و هەرەوەزی و سۆسیالستیەکان هاتنە ئارا و هێدی هێدی پارتە سۆسیالستیەکان خەریك بوو تەواوی ئەوروپای دەگرتەوە، بەمەش هوشیاریان لای چینی کرێکاران دروست کردو هانیان دان داوای گۆڕینی سستمە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان بکەن.

هەریەك لە فەرەنساو بەریتانیا توانیان لە ڕێی موستەعمەراتە زۆرو زەوەندەکانیانەوە، بەسەر ئەو قەیرانەدا زاڵ بن و لە ڕێی ئەوانەوە درێژە بە گەشەی بواری پیشەسازی خۆیان بدەن، ئیتر ئەوە لە ڕێی بە دەستهێنانی کەرەستەی خاوەوە بووبێت یاخود بە دۆزینەوەی بازاڕی بەرخۆری بەرفراوان بۆ ساخکردنەوەی شتومەکەکانیان. بەڵام گەشەکردنی پیشەسازی لە ئەڵمانیا ڕووبەڕووی کێشەی بە دەستهێنانی کەرەستەی خاوی پێویست و دابینکردنی بازاڕ بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمەکانی بوەوە. هەروەها زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و بەرتەسکی ڕووبەری وڵات کێشەیەکی تر بوون کە ئەڵمانیا بە هۆی نەبوونی موستەعمەرات و نەبوونی توانایەکی وا کە پەل بۆ وڵاتانی چواردەوری خۆی بهاوێت، بە دەستیەوە گیرۆدە بوو. ئیتاڵیاش حاڵی لە ئەڵمانیا چاکتر نەبوو، ئەگەرچی توانی لە دەوڵەتێکی نەتەوەیی یەکگرتوودا خۆی ڕێك بخات، بەڵام نەیتوانی جگە لە چەند ناوچەیەکی هەژارو دیاریکراو نەبێت نفوزی ئیستعماری خۆی بسەپێنیت، هەروەها ڕەوشی ئابووری ئیتالیا هاوشێوەی هەلومەرجی ئەڵمانیا بوو.

**1-فاشیزم..**

(ژیانی مۆسۆلینی و هەلومەرجی کۆمەڵگەی ئیتالی):

ئەو ئاشتی و ئارامیەی دوای جەنگی جیهانی یەكەم لە ئیتالیادا بەرقەرار بوو، دەرەنجامی خراپ و ناهەمواری لەسەر تەواوی بوارە ئابوری و كۆمەلأیەتی و سیاسیەكان هەبوو.

دوای جەنگ نرخی شتومەك و باج زیادی كردو نەوت و بەنزین و گازۆیل دایانە كزی، كارێك كە بوە مایەی ئەوەی كرێكارانی ئەو ولأتە بكەونە لێپێچینەوەی ئەوەی حكومەتەكەیان لە ئەنجامی جەنگێكی وا چی بەسەردا هێناون. ئەمە هانی دان بە گژ حكومەت و ئەو ڕژێمە گەندەڵەدا بچنەوە كە لە ئارەدا بوو، بە مەبەستی دروستكردنی گۆڕانكاریش پەنایان بردە بەر پارتی كۆمۆنیست، بەڵام پارتی كۆمۆنیست گۆڕانكاری نەكرد –وەك چاوەڕوان دەكرا–، بەڵكو ئەوەی بەو كارە هەستا مۆسۆلینی و حیزبەكەی بوو (حیزبی فاشی). "مۆسۆلینی" لە ژینگەیەكی هەژاردا پەروەردە بوو، باوكی كاری ئاسنگەری دەكرد و دایكیشی مامۆستا بوو.

لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا ماوەیەك بوە مامۆستا، بەڵام هەر زوو وازی هێنا. دوای ئەوە چوە ولأتی سویسراو بوە كرێكاری بیناسازی. بە هۆی پەیوەندی كردنی بە ئانارشیستەكانی ئەو ولأتەوە لەسەر كارەكەی زۆر نەمایەوەو (لەوێش دەركراو) خرایە زیندانەوە. دوای ئازادكردنی ڕویكردە فەرەنسا، بەڵام لەوێش ڕێیان پێ نەداو دەریانكرد. بەمجۆرە گەڕایەوە ولأتەكەی خۆی. ئەوكات تەمەنی گەیشتبوە بیست و یەك ساڵ، و ڕاپێچی خزمەتی سەربازی ئیجباری كرا. دوای ئەوە لە بواری ڕۆژنامەوانیدا دەستی بەكار كردو وەك نووسەرێك لە ڕۆژنامەی (سۆسیالست)دا دامەزرا.

بەرامبەر بە جەنگی ڕوسیا –ئەڵمانیا، سیاسەتی پارتی (سۆسیالست) لەگەڵ ئەو شەڕەدا بوو، ئەمەش وایكرد "مۆسۆلینی" واز لە بیروباوەڕە سۆسیالستیەكانی بهێنێ‌و ببێتە ناسیۆنالستێكی توندڕەو. ئەو داوای ئەوەی دەكرد ولأتەكەی لەگەڵ نەمسادا بچێتە جەنگەوە، تا خواستە نەتەوەییەكانی ولأتەكەی بەدی بهێنێت. بۆ ئەم مەبەستە چوە ڕیزی سوپاوەو بەشداری شەڕەكانی كردو لە یەكێكیاندا بریندار بوو. ئەو شەڕە "مۆسۆلینی" كردە پیاوێكی توندوتیژو دڵ ڕەق و سەركێش. دوای ئەوە یەكەم كار كردی دروستكردنی حیزبێك بوو كە لایەنگری بیروبۆچوونەكانی خۆی بێت بە ناوی حیزبی (*Fascisti*).

(خواستی ئەوە بوو حیزبێك دروست بكات سستمێكی كۆنكرێتی هەبێت و سەرشار بێت لە چالاكی و زیندەگی. ئەندامەكانی ژیانێكی زبرو نالەباری وەك

ئەسپارتەییەکان بگوزەرێنن و چاوەڕێی ئەو ڕۆژەش بن کە جڵەوی دەسەڵات دەگرنە دەست)[1]. تا کۆتایی تشرینی یەکەمی *1922* حیزبی *Fascisti* لە فراوانبووندا بوو، لەو کاتەدا "مۆسۆلینی" بەرەو ڕۆما بەڕێکەوت و جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست. پادشا تەنها دەسەڵاتە شکلیەکانی لە دەستا مایەوە. حیزبی *Fascisti* بەر لەوەی ببنە حوکمڕان و دواتریش کە دەسەڵاتی وڵاتیان کەوتە دەست، هەموو جۆرە شێوازێکی جەورو ستەم و سەرکوتکردنیان بە گەڕ خست، کارێك کە بوە مایەی ئەوەی تەواوی نەیارەکانیان پاکتاو بکەن، بەمەش توانیان تەواوی نەتەوەی ئیتالی و لاوانی ئەو وڵاتە کۆنترۆڵ بکەن.

### *2*-فیکری فاشیزم:

فیکری فاشی یان تیۆری فاشیزم دەربارەی حوکمڕانی، بەرەنجامی فیکری بیرمەندگەلێکی ئیتاڵیە کە لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی دەوڵەتی نیشتمانی نەتەوەییدا بوون و بڕوایان بە یەکانگیری دەوڵەت هەبوو وەك بوونەوەرێکی زیندوو. فاشیزم شالاوێکی کردە سەر ئەو تیۆریا سیاسیانەی لە سەدەی نۆزدەدا باوبوون و تەوەری سەرەکیشیان بریتی بوو لە ئازادی و دیموکراسی.

فاشیزم شالاوێکی کردە سەر ئەو تیۆریا سیاسیانەی لە سەدەی نۆزدەدا باوبوون و تەوەری سەرەکیشیان بریتی بوو لە ئازادی و دیموکراسی

فاشیەکان پێیان وابوو دەوڵەت بە دوور لە ئایدیای گردبوونەوەی نێوان تاکە کەسەکان دروست دەبێت و یەکەیەکی تایبەتییەو ژیان و بوونی خۆی هەیە، هاوکات ئامانجەکانیشی دوورە لە مەبەست و ئامانجی تاکەکەسان.. دەوڵەت لە پێناو بەرژەوەندی تاکە کەسەکاندا دروست دەبێت، بەڵام گەر بەرژەوەندیەکانیان ناکۆك بوو، ئەوا پێویستە تاکەکەس دەست بەرداری بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی بێت لە پێناو بەرژەوەندیە باڵاکانی دەوڵەتدا. گەر ئەوەشی نەکرد، ئەوا بە زۆرو بە زەبری هێز ئەوەی بەسەردا دەسەپێنرێت. بەو پێیەی دەوڵەت لای فاشیەکان لە پەرەسەندێکی مێژوویی بەردەوامدایە، ئەوا دەبێت پارێزگاری کردن و برەودان بە هێزو تواناکانی لە ریزی پێشەوەدا بێت، واتە دەبێت تاکەکەس بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت بخاتە سەرو ئازادیو مافەکانی خۆیەوە. ئەرکی قوربانی دانی فەرد بۆ دەوڵەت بەرزترین بەهای ئەخلاقییە لای فاشیزم، هەر بۆیە جەنگ لای ئەو یاسای سەرمەدیو نەمری مرۆڤە.

ئامانجی فاشیزم هێنانە ئارای دەوڵەتێکی کۆنکرێتیی وەهایە کە پێویستی بە کەس نەبێت، ئەمەش پێویستی بەوەیە تاکە کەسەکان و پرۆژەکان ملکەچی پلانێکی سەرتاسەری تۆکمە بن، بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجە زیندوەکانی نەتەوە.

فاشیەكان دیموكراسیەت و سەروەری میللی ڕەتدەكەنەوەو بە ڕەواشی نازانن تاكەكەس مافی ئەوەی هەبێت جۆرو فۆرمی حكومەت دەستنیشان بكات، چونكە ئەوان پێیان وایە حكومەت دەبێت لە دەستی كەمینیەكی هەڵبژاردەدا بێت. هەروەها لای ئەوان بەشداریكردنی تاكەكەس لە ژیانی سیاسیدا سنوردارەو تەنها لە ڕێگای ڕێكخراوە پیشەییەكانەوە دەبێت. هەرچی سەروەری میللیشە درۆیەو بوونی نییە، لەبەرئەوەی سەروەری هەمیشە بۆ دەوڵەتە.

فاشیەكان ململانێی چینایەتیان ڕەتكردەوە، بەڵام بڕوایان بە هاوكاری سەرمایە لەگەڵ كاردا هەبوو. لەم پێناوەشدا ڕێكخراوگەلێكی هاوبەشیان دروستكرد و بۆ دەستنیشان كردنی ئەندامانی لیژنەی یاسادانان بەكاریان هێنان. هەروەها فاشیەكان ئایدیای جیهانگەراییان پێ پەسەند نەبوو، بەڵكو لای ئەوان دەوڵەت باڵاترین و كاملترین فۆرمی سستمی سیاسی بوو، دەوڵەتێك كە لەسەر بنەمای یەكیەتی جوگرافی و مرۆیی و پەیوەندیە مێژووییەكان دامەزرا بێت.

پێویستە دەوڵەت خزمەتی خۆی بكات بە بێ گوێدانە بەرژەوەندی دەوڵەتانی دیكە. هەركاتێكیش دەوڵەت پێویستی بە كەرەستەی خاو یان بازاڕ هەبوو بۆ كاڵاو كەلوپەلە پیشەسازیەكانی یاخود پێویستی بە زەوی و زار هەبوو بۆ نیشتەجێ كردنی هاوڵاتیانی، ئەوا جەنگ ئامرازێكی شەرعیە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە. هاوكات جەنگ دۆخێكی سروشتییە كە هێزە ئەفرێنەرو تواناكان لە نەتەوەدا بە زیندوویی دەهێڵێتەوە، تا بە ڕۆڵی پێشەوایەتی كردنی خۆی هەستێت و دەوڵەت لە ڕووی یەكڕیزی گەل و ڕێكخستنێكی نموونەییەوە بگەیەنێتە ژیانێكی گونجاو شایستە.

فاشیەكان بڕوایان بە یەك حیزب و یەك سەركردە هەبوو، شاڵاویشیان كردە سەر فرە سەركردەیی سیاسی لە دەوڵەتدا. هەروەها پێیان وابوو "نیكۆلۆ ماكیاڤیللی" بێ هاوتاترین و مەزنترین بیریاری سیاسی ئیتاڵیایە لە سەردەمی نوێدا، ڕادەی سەرسامی فاشیەكان بە "ماكیاڤیللی" دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی یەكەمین ئیتاڵیە هەوڵی بەدیهێنانی یەكخستنی نەتەوەی ئیتاڵیای داوە. سەرباری ئەوەی لە سیاسەتدا پیاوێكی واقعی بوەو پێی وابوە مرۆڤ بوونەوەرێكی خۆپەرستە، هاوكات دەوڵەتی نیشتمانی گەیاندۆتە ئاستی پەرستن و بەكارهێنانی هەموو جۆرە ئامرازێكی بە پێویست زانیوە بە مەبەستی پاراستنی و گەشەدان بە هێزو تواناكانی.

فاشیەكان پێیان وابوو لە ئێستادا دەوڵەت ئەو "میر"ەیە كە "ماكیاڤیللی" باسی دەكات و پێویستە بە هۆی گەشەی مێژوویی خۆیەوە، یەكیەتی نەتەوەیی دەستەبەر

فاشیەكان ململانێی چینایەتیان ڕەتكردەوە، بەڵام بڕوایان بە هاوكاری سەرمایە لەگەڵ كاردا هەبوو

بکات و سەروەری و شکۆمەندیەکانی ڕابردوو بگێڕێتەوە[2]. دەوڵەت لای فاشیەکان دامەزراوەیەکی پیرۆزە، دامەزراوەیەك کە ژیانی تایبەتی خۆی هەیەو هەمیشە لە پەرەسەندن و بەرەو پێشچووندایەو لە دەرەوەی بازنەی ئەو فەردانەدایە کە دروستی دەکەن.

### 3-نازیزم:

دوای شکستی گەورەی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، ڕێکەوتننامەی ڤێرسای کۆمەڵێك مەرجی زۆر قورسی بەسەر ئەڵمانیادا سەپاند کە بوە مایەی داتەپینی ئابووری ئەو وڵاتە. گەلی ئەڵمانی چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوون بتوانن خۆیان لەو واقعە ناهەموارە ڕزگار کەن. لەم پێناوەشدا پارتە سیاسیەکان کەوتنە خۆیان، لە پێش هەمووشیانەوە حیزبی کۆمۆنیست کە دەیویست شۆڕشێك هاوشێوەی ئەوەی ڕوسیا لە ئەڵمانیادا بەرپا بکات، بەڵام نەتەوە پەرستە توندڕەوەکانی ئەڵمان نەفرەتیان لە هاوپەیمانەکان و سستمە سیاسیەکانیان کرد کە لەسەر ئازادی و دیموکراسی دامەزرابوون. هاوکات پرانسیپەکانی حیزبی کۆمۆنستیشیان بە نەفرەت کرد کە لەسەر ململانێی چینایەتی و ئافەرۆزە کردنی ئایدیای نەتەوایەتی دروست بووبوو. هەلومەرجی نالەباری ئەڵەمانیا پێویستی بە گۆڕانکاری هەبوو، ئەم گۆڕانەش لەسەر دەستی "ئەدۆڵف هتلەر" و حیزبی نازیدا ڕووی دا کە لەسەر بیروباوەڕی سۆسیالستی-نەتەوەیی دامەزرابوو.

دوای شکستی گەورەی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، ڕێکەوتننامەی ڤێرسای کۆمەڵێك مەرجی زۆر قورسی بەسەر ئەڵمانیادا سەپاند

### 4-ژیانی "هتلەر":

"ئەدۆلف هتلەر" ساڵی *1889* لە خانەوادەیەکی دەستکورت و هەژاردا هاتۆتە دنیا. باوکی فەرمانبەری گومرگ بوە. تەمەنی سیانزە ساڵ دەبێت باوکی دەمرێت و لە تەمەنی پانزە ساڵیشدا دایکی دەمرێت. لەبەر بێ پارەیی ڕوودەکاتە ڤیینای پایتەختی نەمسا، خەونی ئەوەی دەبێت ببێتە هونەرمەندێکی نیگارکێش. بەڵام ئەکادیمیای هونەر داواکەی قبوڵ ناکات و ناچار ڕوو دەکاتە خوێندنی ئەندازیاری تەلارسازی. بە هۆی کەم دەرامەتی و بێ پارەیی بە ناچاری واز لە خوێندنەکەی دێنێت و ڕوو دەکاتە شاری میونخی پایتەختی هەرێمی باڤاریا و لەوێ حیزبی کرێکارانی نیشتمانی-سۆسیالستی دروست دەکات. لە ماوەیەکی کورتدا ئەم حیزبە زۆربەی زۆری لاوانی ئەڵمانیا بەلای خۆیدا کێش دەکات و دواتر ناوەکەی دەبێتە حیزبی- نازی.

"هتلەر" ساڵی *1925* بەرنامەی حیزبەکەی دادەنێت کە لە بیست و پێنج خاڵ پێك دێت، هـەروەها (الصلیـب المعقـوف) دەکـات بـە دروشمـی حیزبەکـەی. سـاڵی *1923* هـەوڵی کودەتایـەك دەدات، بەڵام سـەرکەوتوو نابێت. لـە پـای ئـەم هەوڵـەیدا دەسـگیر دەکرێـت و بـۆ مـاوەی سـیانزە مـانگ زیندانـی دەکرێـت. ئـەو ماوەیـەی لـە زیندانـدا دەمێنێتەوە کتێبە بەناوبانگەکەی (تێکۆشانم) دەنووسێت و بەرنامەی حیزبەکەی تیا دادەڕێژێت. دوای دەرچوونی لە زیندان، سەرکەوتوانە تا ساڵی *1933* درێـژە بە کارو چالاکی سیاسی خۆی دەدات. لەم ماوەیەدا نێوبانگێکی زۆر بۆ خۆی پەیدا دەکات و لەناو لاوانی ئەڵمانیشدا پشتیوانییەکی گەرمی لێدەکرێت.

سـاڵی *1933* هـەڵبژاردنی گشـتی دەکرێـت، حیزبەکـەی "هلتـەر"یـش بەشـداری دەکات و زۆرینـەی دەنگەکان بە دەست دێنن. لە پای ئەمەدا وەك سەرەك وەزیرانی وڵات لە کۆماری ڤایماردا دادەنرێت، لەم پۆستەشدا بەردەوام دەبێت تا کۆتایی دوەم جەنگی جیهانی لە ساڵی *1945*. لەم جەنگەدا ئەڵمانیا دووچاری شکستێکی گەورە دێت، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی "هتلەر" لە *8* ئایاری *1945* کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێت. "هتلەر" پیاوێك بوو ڕقێکی گەورەی لە ژیان بوو، کەسێکی وشك و دڵڕەق بوو. خەیاڵاوی و تا ئاستی هێستریا توندوتیژ بوو، بێ ئەندازە ڕقی لە جولەکە بوو.

### *5*-فیکری نازی:

سەرەتا "هتلەر" کەوتە ژێر کاریگەری پرانسیپەکانی فیکری فاشیزم، بەڵام ئەم حاڵەتە زۆری نەخایاندو دەستی کرد بە دانانی بیروبۆچوونی جیاوازو تایبەت بە خۆی. پرانسیپی یەکەمی ئەوە بوو کە دەوڵەت ئەو دەسەڵاتەیە دەبێت هەموان ملکەچ بکەن لە ئاستیدا، ئەم بۆچوونەشی لەژێر کاریگەری بیروڕاکانی "هیگڵ" و "بسمارك"دا بوو.

نازیەکان داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیکتاتۆریان دەکرد، دەوڵەتێك "فۆهرەر" سەرکردایەتی بکات و سەرجەم ئەڵمانیەکان (بە تاکە کەس و ڕێکخراوەکانەوە) لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا کۆبکاتەوە. هەروەها داوای ئەوەیان کرد ڕێکەوتننامەکانی ئاشتی هەڵبوەشێنرێتەوەو ئەو ناوچانەی موستەعمەرەی ئەڵمانیا بوون سەرلەنوێ بدرێتەوە پێیان و مافی دەنگدان لە هەڵبژاردنەکاندا لە جولەکەکانی نیشتەجێی ئەڵمانیا بسەنرێتەوەو سوپایەکی نیشتمانی پێك بهێنرێت. هاوکات بڕوایان وابوو پێویستە دەوڵەت دەست بخاتە ژیانی ئابوورییەوە، ئەویش لە ڕێگای دانانی نەخشەو پلانی

نازیەکان داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیکتاتۆریان دەکرد، دەوڵەتێك "فۆهرەر" سەرکردایەتی بکات و سەرجەم ئەڵمانیەکان (بە تاکە کەس و ڕێکخراوەکانەوە) لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا کۆبکاتەوە

پێویست، لەگەڵ دابین کردنی کارو نەهێشتن و بنەبڕکردنی مانگرتن. ئەگەرچی نازیەکان بڕوایان بەوە هەبوو موڵکیەت لە دەستی تاکە کەسەکاندا بێت، بەڵام بە مەرجێك دەوڵەت مافی ئەوەی هەبێت ئەو موڵکە بەکاربهێنێت و دەستی بەسەردا بگرێو سوود لە قازانجەکەی ببینێت.

کتێبە بەناوبانگەکەی (تێکۆشانم) کە لە ماوەی ساڵانی (*1923–1924*) و لە زینداندا نوسیبووی، بنەماکانی فیکری نازیزمی لەخۆ گرتبوو. نازیزم ستایشی پرانسیپی هۆزە جێرمانیە کۆنەکان دەکات و ئەفسانەکانیان لەمەڕ جەنگی نێوان خواکان بەرز ڕادەگرێت، هاوکات ئاینی مەسیحی بە ئاینێکی لاواز دەداتە قەڵەم. فاشیەکانی ئیتاڵیاش وەك ئەمان بە چاوی ڕێزەوە سەیری مێژووی مەزنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیان دەکرد.

(ئەڵمانیا لەسەر هەموانەوەیە) گرنگترین دروشمی "هتلەر" بوو. ئەمەش بەو مانایەی ڕەگەزی ئاری یاخود ئاری نەژادەکان لە سەرو هەموو ڕەگەزو نەژادەکانی ترەوەن. هەروەها پێی وابوو ئەڵەمانیا ڕۆڵێکی ژیاری گەورە لە دنیادا دەگێڕێت و مافی ئەوەی هەیە حوکمڕانی ڕەگەزە لاوازەکان بکات یاخود لە ناویان بەرێت.

(پەیوەندی خوێن) کە نازیزم بڕوای پێی هەبوو، لە پشت ئەو بانگەشەیەوە بوو کە دەیوت: (ئەڵەمانیەکان لەهەر کوێیەك بن ڕۆڵەی نەتەوەی ئەڵمانین و پێویستە لە سەریان وەلائی خۆیانی پێشکەش بکەن. هەروەها دەبێت ئەو هەرێمانەی دیکەی ئەوروپا کە ئەڵمانی تێدایە بخرێتە سەر ئەڵەمانیا، ئەگەرچی کەمینەش بن).

لە سۆنگەی بڕوابوونی بە باڵادەستی نەژادی ئاری، "هتلەر" هەموو ئەوانەی لە پۆستە گشتییەکاندا لادا کە سەر بە ڕەگەزی ئاری نەبوون. هەروەها ژن و ژنخوازی لە نێوان ڕەگەزەکاندا قەدەغە کردو فەرمانی دا بە پاکتاوکردنی کەسە لاوازو بێ تواناکان. لەگەڵ ئەم هەنگاوانەشدا شاڵاوێکی گەورەی کردە سەر جولەکەو شکستی ئەڵەمانیای لە جەنگدا خستە ئەستۆی ئەوان. "هتلەر" ئایدیای جیهانگەرایی و ئاشتی نێودەوڵەتی ڕەتکردەوەو بڕوای بە جەنگ و هێزو توندوتیژی هەبوو، پێی وابوو جەنگ دروشمی گەورەی دەوڵەتی نەتەوەیی زیندوە.

بڕوایەکی لە ڕادە بەدەریشی بە فیکری "فێختە" و "هیگڵ" هەبوو سەبارەت بە دەوڵەت، لەبەرئەوە ستایشکردنی ڕۆڵی دەوڵەت و بەهێزکردنی و مامەڵەکردن لەگەڵیدا

(پەیوەندی خوێن) کە نازیزم بڕوای پێی هەبوو، لە پشت ئەو بانگەشەیەوە بوو کە دەیوت: (ئەڵمانیەکان لەهەر کوێیەك بن ڕۆڵەی نەتەوەی ئەڵمانین و پێویستە لە سەریان وەلائی خۆیانی پێشکەش بکەن

وەك ئەقڵێكی ڕەسمی كە فەرد دەچێتە ناویەوە تا خۆی دروست بكات، لە سەردەمی حوكمڕانی نازییەكاندا شتێكی باو بوو.

نازیزم وەكی فاشیزم هێرشی كردە سەر بنەماكانی دیموكراسی و سەروەری پەرلەمان و فرەحیزبی، هەر بۆیە جگە لە تاكە حیزبێك كە دەستەبژێرێكی لە ئەڵەمانەكان گرتبوە خۆ، ڕێیان بە دروستكردنی حیزبی دیكە نەدا. هەموو جۆرە ڕەخنەو دژایەتیكردنێكی دەسەڵاتدارانیشیان قەدەغە كردو داوایان كرد دەسەڵات بدرێتە دەست "فۆهرەر".

نازیەكان پێیان وابوو یەكەمین ئەركی نیشتمانی دەوڵەتی نەتەوەیی (فێركردنە)، ئەم پرۆسەیەش دەبێت تایبەت بێت بە كلتوری ڕەگەزپەرستی و پێویستە ئەم مەسەلەیە لەسەر سنگی لاوانی ئەڵمانیا بنەخشێنرێت. نابێت ڕێگەیان بدەین قوتابخانە جێ بهێڵن، تا ئەوكاتەی هەموو شتێك دەربارەی گرنگی پاراستنی ڕەگەزی ئاری بە پاكی فێر دەبن.

نازیەكان هەر لەو كاتەوەی "هتلەر" لە ساڵی *1933* گەیشتە پۆستی ڕاوێژكاری ئەڵمانیا، توانیان بیروباوەڕو بنەما فیكریەكانی خۆیان زۆر بە توندی بئاخنە مێشكی لاوانی ئەڵەمانیاو زۆربەی زۆریشیان بخەنە خزمەتی دەوڵەتەوە.. هەروەها پلانێكی ئابووری وایان داڕشت كە خزمەتی بە بەرژەوەندی گەورە پیشەسازیەكان دەكرد، هەروەك چۆن خزمەتی ئامانجە سەربازیەكانیشی دەكردو بوە مایەی هەڵایسانی دوەم جەنگی جیهانی. جەنگێك كە تەنها بە ڕاماڵینی سستمی نازیزم كۆتایی هات.

## پەراویزو سەرچاوەكان

*1*-ه. أ. ل. فیشر: تأریخ اوروبا في العصر الحدیث- تعریب: احمد نجیب هاشم و ودیع الضیع- دار المعارف، القاهره- *1958*، ص *600* و لاپەڕەكانی دواتر.

*2*-د. عمر عبدالحی: سەرچاوەی پێشوو- ص *174*.

## سەرچاوە

د. موسی ابراهیم: معالم الفكر السیاسی الحدیث و المعاصر- مؤسسة عزالدین للطباعة و النشر، بیروت- الطبعة الاولی، *1994*.

بندكت ئەندرسۆن

# سەرچاوەكانی هۆشمەندیی ناسیۆنالیزم



وەرگێڕانی: ئارام جەمال سابیر

ئەگەر پەرەسەندنی چاپەمەنی كالایی كلیلێكی گەیەنەر بووبێت لە بەرهەمهێنانی هـزرە تـەواو نوێكـاندا لـە ڕووی كاتـەوە، ئـەوا ئێمـە هێشـتا، لەگـەڵ ئەوەشـدا، لـەو خاڵـەداین كــە تەنــها ئیمكــانی ئــەوەی تێدایــە گــروپ و جڤاتــە (*Communities*) عەلمانییەكانی لە ڕووی ئاسۆییو كاتەوە- تێدا دروستبن.

بۆچی لـەناو ئـەمجۆرە جڤاتانـەدا نەتـەوە بـوە شـتێكی بـاو؟ وەك ئاشـكرایە ئـەو هۆكارانەی بەشدرای لەم خاڵەدا دەكەن چەند شتێكی تێكچڕژاوو هەمەچەشنن، بەڵام دەكرێـت بەڵگـە بـۆ ئـەوە بهێنرێتـەوە كـە گەشـەی سـەرمایەداریی لـە دروسـتبوونی نەتەوەدا پێشینەی هەیە.

ئاماژەمان بەوە دا کە لە ساڵی *1500*دا نزیکەی *20* هەزار کتێب چاپکراوە[1]، بەمەش وەك بنجامین دەڵێت "سەردەمی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی میکانیکی" سەریهەڵدا. خۆ ئەگەر ناسینی دەستنووسەکان دانسقەو نهێنی بووبن، ئەوا ناسینی دەقە چاپکراوەکان بە هۆی توانای زۆرکردن و بڵاوبوونەوەوە، درێژەی بە ژیانی داوە[2].

ئەگەر ژمارەی ئەو کتێبانەی تا ساڵی *1600* بەچاپ گەیەنراون، هەروەك ڤیڤەرو مارتن دەڵێت لانی کەم *20* ملیۆن دانە بێت، کەواتە هیچ سەیر نابێت کەسێکی وەك {فرانسیس بێکۆن} پێی وابێت کە چاپەمەنی "شێوەو دۆخی جیهان"ی گۆڕی[3].

پیشەسازی بڵاوکردنەوەی کتێب، یەکێکە لە شێوە هەرە سەرەتاییەکانی پرۆژەی سەرمایەداری بە هەموو ئەو خولیایەی کە سەرمایەداری بۆ بازاڕ هەیەتی. ئەوانەی لە سەرەتاوە کاری چاپیان دەکرد لقیان لە سەرتاسەری ئەوروپادا دامەزراند: (بەمجۆرە خانەگەلێکی بڵاوکردنەوەی "نێونەتەوەیی" پەیدابوو کە سنوورە نەتەوەییەکانی {بەجۆرێك لە جۆرەکان} فەرامۆشکرد)[4]. لەبەر ئەوەشە کە ساڵانی (*1500*–*1550*) ساڵانێکی پەرەسەندنی بێهاوتا بوو لە ئەوروپاداو کەرتی بڵاوکردنەوە بەشداری لە ئاسودەیی گشتیدا کرد.

ئەم پیشەسازیە "زیاتر لە هەموو کاتێکی تر" بوە پیشەسازییەکی "مەزن لەژێر فرمانی سەرمایەدارە دەوڵەمەندەکاندا"[5]. بێگومان "فرۆشیارانی کتێبەکانیش لە بنەڕەتدا گرنگیان بە کۆکردنەوەی قازانج و ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان دەداو هەر شتێك هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبانەیان دەدا کە بە لای خەڵکانێکی زۆری سەردەمەکەیانەوە گرنگ بوو"[6].

ئەوروپای ئەبجەدی، یەکەمین بازاڕ بوو، کە لە توێژێکی فراوان پێکهاتبوو، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان بە لاتینی دەیانخوێندەوە. تێربوونی ئەم بازارە (*150*) ساڵی خایاند. لە ڕاستیدا لاتینی (ئەگەر واز لە پیرۆزییەکەی بهێنین) زمانی ئەوانە بوو کە بە دوو زمان قسەیان دەکرد. ئەوانەی هەر لە لەدایکبوونەوە قسەیان پێدەکرد ژمارەیان زۆر کەمبوو، لە کاتێکدا ئەوانەی بە لاتینی خەویان دەبینی، ژمارەیان زۆر لەمەش کەمتر بوو. ڕێژەی ئەوانەی لە سەدەی شازدەهەمدا بەم دوو زمانە قسەیان دەکرد، لەچاو کۆی دانیشتوانی ئەوروپادا، زۆر کەم بوون، ڕەنگە لەمڕۆشدا ڕێژەیان لەچاو کۆی دانیشتوانی جیهاندا شتێکی ئەوتۆ زیادی نەکردبێ. بە هەمان شێوە وێڕای ئێنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاریا– لە سەدەکانی داهاتوودا. زۆربەی زۆری خەڵك

پیشەسازی بڵاوکردنەوەی کتێب، یەکێکە لە شێوە هەرە سەرەتاییەکانی پرۆژەی سەرمایەداری
بە هەموو ئەو خولیایەی کە سەرمایەداری بۆ بازاڕ هەیەتی

خاوەنی یەك زمانن. بەمجۆرە خودی لۆژیکی سەرمایەداری، خۆی دەستنیشانی ئەوەی کرد کە سنورداربوونی نوخبەی لاتینی بە مانای ئەوەیە ئەو بازاڕە شاراوەیەی جەماوەرێکی بەرفراوانی {خاوەن یەکزمان} پێکیدێنێ، بزوێنەری خولیاو تەماحە. با دڵنیابین لەوەی کە ئەو ((دژە ڕیفۆرم))ەی کلێسای کاسۆلیك بۆ بەرەنگاربوونەوەی پرۆتستانت پێی هەستا، بۆ ماوەیەك توانی هانی بوژاندنەوەی پرۆسەی بڵاوکردنەوەی زمانی لاتینی بدا، بەڵام ئەم بزاڤە (واتە دژە ڕیفۆرم) لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەدا پووکایەوەو بەمەش پەڕتووکخانەی کاسۆلیکی نەیتوانی لە توانای خۆی زیاتر هەڵبگرێو لەژێر ئەم بارەدا پسا. لەم سەروبەندەدا کەمپارەیی ڕووی لە ئەوروپا کردو ئەمەش پاڵی بە بڵاوکەرەوەکانەوە نا تا بیر لە چاپی هەرزان و زمانی ناوچەیی بکەنەوە[7].

سێ هاندەری نوێ، سێ هۆکاری دەرەکی پاڵیان بە سەرمایەدارییەوە نا بەوەی برەو بە زمانی ناوچەیی بدات، کە دوانیان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەشداریان لە پێکهێنانی هۆشیاری نەتەوایەتیدا کرد.

یەکەمیان، کە بایەخێکی کەمتری هەیە، خۆی لە گۆڕینی شەقڵ و مۆرکی خودی زمانی لاتینیدا دەبینێتەوە. هەوڵ و تەقەللای هیومانیستەکان (*Hunanists*) لە بوژانەوەی ئەدەبی کلاسیکی فراوان، کە پێش مەسیحیەتەو بڵاوکردنەوەی لە ڕێگەی بازاڕەکانی چاپەمەنیەوە، تەقدیرێکی تازەی لای سەرجەم ئەنتلجنیسیای ئەوروپی ڕسکاندو ئەو دەسکەوتە شێوازخوازە پێشکەوتوانەی باووباپیرانیان بەرز نرخاند.

بەمجۆرە ئەو لاتینییەی کە حەزیاندەکرد پێی بنووسن، وایلێهات کە زیاتر لە زمان و شێوازەکەی شیشرۆنەوە نزیك بێت و زۆریش لە زمانی کلێساو زمانی ژیانی ڕۆژانە دووركەوێتەوە. بەمچەشنە ئەم زمانە خەسڵەتێکی سۆفیگەریانەی {ناوەکی} وەرگرت کە بە هەموو شێوەیەك لەو خەسڵەتانەی لاتینیەتی کلێسای سەدەکانی ناوەڕاست جیاواز بوو. هەروەها زمانی لاتینی کۆن بە هۆی بابەت و شێوازەکانیەوە لێڵ و ناڕۆشن نەبوو، ئەوەندەی لەبەر ئەوەبوو نوسرابۆوە؛ واتە بەهۆی جێگەکەیەوە بوو وەك تێکستێك، بەڵام ئاڵۆزیی ئێستای بە هۆی ئەو بابەتانەوەیە کە نوسران، بە هۆی زمانەکەوەیە لە- خۆیدا.

دووەم، کاریگەریی ڕیفۆرمی ئاینی، کە بەشێکی زۆری سەرکەوتنەکەی قەرزاری چاپەمەنی سەرمایەدارییە. پێش سەردەمی چاپەمەنیو لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا، ڕۆما

زۆر بە ئاسانی شەڕەکانی دژ بە هەرتەقەی دەبردەوە، ئەویش لەبەرئەوەی کڵێسا لە نەیارەکانی زیاترو بە شێوەیەکی بە تواناترو باشتر هێڵە پەیوەندیە ناوخۆییەکانی لەبەردەستدا بوو، بەڵام وەختێك مارتن لوسەر لەساڵی *1517*دا بزماری بە دەروازەکانی کڵێسای جیابۆوەی فێتێنبرگەوە داکوتا، تاوەکو تێزو بۆچوونە چاپکراوەکانی خۆی پیاهەڵواسیێ، تێزو نووسراوەکان چاپکراو بوون و وەریشگێڕرابوونە سەر زمانی ئەڵمانیو "لە ماوەی *15* ڕۆژدا بە سەرتاسەری وڵاتدا بڵاوبۆوە"[(8)]. ئەوەبوو لە ماوەی تەنها دوو دەیەدا (*1520–1540*) ژمارەی ئەو کتێبانەی لە ئەڵمانیادا بڵاوکرانەوە سێ ئەوەندەی هەمان ئەو کتێبانە بوون کە لە ماوەی نێوان ساڵانی (*1500–1520*) بڵاوکرابوونەوە، ئەمەش ئاڵوگۆڕێکی سەرسوڕهێنەر بوو کە دیارە لوسەر چەقە قورساییەکەی پێکدێنێ. کتێبەکانی (لوسەر) لانیکەم یەك لەسەر سێی هەموو ئەو کتێبە ئەڵمانیانەی پێکدەهێنا کە لە نێوان ساڵانی *1518* و *1522*دا فرۆشراون، بەڵام لە ماوەی نێوان ساڵانی *1522–1546*دا *430* چاپی تەواو و بەش بەشی لە وەرگێڕراوە ئینگلیزیەکانی بڵاوکرایەوە. "ئێمە لێرەداو، بۆ یەکەمین جار، بە ڕاستی لە بەردەم جەماوەرێکی خوێندەواری بەرفراوان و ئەدەبێکی میللیدا دەوەستین کە نووسینەکان دەست هەموان دەکەوێت"[(9)]. لە ڕاستیدا لوسەر بوە یەکەمین نووسەر لە جیهانداو شانسی ئەو شتەی هەیە کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێت "زۆرترین فرۆشتن" و هەر بەم سیفەتەشەوە دەناسرێ، یاخود، ئەگەر بە شێوەیەکی جیاوازتر گوزارشت لە هەمان ئەم مەسەلەیە بکەین، دەتوانین بڵێین لوسەر یەکەمین نووسەرێك بوە کە توانیویەتی کتێبە نوێکانی خۆی لەسەر بنەمای ناوو ناوبانگی خۆی "بفرۆشێ"[(10)].

چەند نووسەرێکی تر لە دوای لوسەرەوە هاتن بۆ تەواوکردنی ئەوەی ئەو دەستی پێکردوە، لەو پێناوەدا شەڕێکی پڕوپاگەندەیی ئاینی گەورەیان لە سەدەی دواییدا لە سەرتاسەری ئەوروپادا دەستپێکرد. لەم شەڕە مەزنەدا (شەڕی بەدەستهێنان و ڕاکێشانی عەقڵی خەڵکی)، مەزهەبی پڕۆتستانی، بە بەردەوامی لە حاڵەتی هێرشبردندا بوو، چونکە زۆر باش دەیزانی کە بە چ شێوەیەك فراوانی بازاڕی چاپەمەنی بە زمانە ناوچەییەکان وەگەڕبخات کە سەرمایەداری خوڵقاندوویەتی، ئەمە لە حاڵێکدا بزووتنەوەی دژە ڕیفۆرمی کاسۆلیکیەت داکۆکی لە پایەکانی زمانی لاتینی دەکرد. هێماو سیمبولی ئەم داکۆکیەش کتێبەکەی فاتیکانە *Index Liberorum Prohibitorum* (کە لە بەرامبەر ئەمەدا هیچ کتێبێکی پڕۆتستانتی پێچەوانە بەمە نیە)، کە بریتیە لە کەتەلۆکێکی نوێو پێویستی دەرکردنی ئەم کتێبەش دەگەڕێتەوە بۆ

قەبارەی ئەو بابەتە تێکدەرانەی چاپکراون. هیچ شتێك نیە باشتر لەو ترسەی فرانسوای یەکەم بتوانێ وێنای ئەو هەستکردن بە گەمارۆدانە بکات کە بڕیاری قەدەغەکردنی چاپکردنی هەر کتێبێکی لە وڵاتەکەیدا دەرکرد له ژێر لیستی سزای لە سێدارەدان هەتا مردن! هۆکاری ئەم یاساغکردنەو سەختی پیادەکردنەکەی لەوەوە بوو کە سنووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکەی بە چەند شارو شارۆچکەیەکی پرۆتستانتی گەمارۆ درابوو، کە ژمارەیەك بڵاوکراوە زۆریان چاپدەکردو دەیاننارده ئەوێ. با شاری جنێڤ تەنها وەك نموونەیەکی سەردەمی کالڤین وەربگرین. لە نێوان ساڵانی *1533* و *1540*دا تەنها *42* کتێب دەرچوو، کەچی لە ماوەی نێوان ساڵانی *1556–1564* ئەم ژمارەیە گەیشتە *527* کتێب. لە دوا ساڵدا چل خانەی چاپەمەنی لەو شارەدا هەبوەو بەوپەڕی تواناو وزەیانەوە زێدەکارییان کردوە[11].

هاوئاهەنگی نێوان پرۆتستانت و چاپەمەنی‌و سەرمایەداری، چاپە میلییە هەرزانەکانی وەگەڕخست، بۆ ئەوەی بتوانرێت لە ماوەیەکی کورتدا جەماوەرێکی خوێندەواری نوێی بەرفراوان دروستبکرێت بەو بازرگان و ئافرەتانەشەوە کە خۆبەخۆ زمانی لاتینی نازانن، یان تەنها شتێکی کەمی لێدەزانن، ئەمەش لە پێناو بزواندن و ئاڕاستەکردنی ئەو جەماوەرە بەرەو چەند ئامانجێکی ئایینی– ڕامیاریی. ئاکامەکەشی ئەوەبوو هەژانەکە گەیشتە سەر بنج و ئێسقان و تەنها بە لەرزاندنی کڵێساشەوە نەوەستا. ئەم زریانە بوە سەرەتایەك بۆ ئەو دەوڵەتە ئەوروپیە گرنگانەی کە دەوڵەتی– خێزانی پادشاهی یان دەوڵەتی شار نین، بەڵکو دەوڵەتێکی نوێیەو لەسەر شێوازی کۆماریخوازیی هۆڵەندیی‌و کۆمۆنوێلسی بیورتانیەکان پێکهاتوە (ترسی فرانسوای یەکەم چەندێك ئایینی بوو ئەوەندەش سیاسی بوو).

هۆکاری سێهەم، بڵاوبوونەوەیەکی بە کاوەخۆی چەند زمانێکی ناوچەییە، کە لە ڕووی جوگرافییەوە وێکچوو نین و وەك ئامرازگەلێك وان بۆ بەڕێوەبردنێکی سەنترالیستی (یان سەنترالیزمێکی کارگێڕیی) لەسەر دەستی چەند پاشایەکی تۆکمە، کە خەریکن ببنە چەند پادشایەکی موتڵەق (پادشایەکی ڕەها).

لە ڕاستیدا پێدەچێ بەراوردکردنی نێوان ئەورووپاو ئیمپراتۆریای چین مەسەلەیەکی بەکەڵك بێت، ئەویش لەبەرئەوەی پانتایی بەڕێوەبردنی بیرۆکراتیانەی ئیمپراتۆریەت، تا ڕادەیەکی زۆر، هاوجوتە لەگەڵ ڕووبەری بڵاوبوونەوەی پیتە وێنەییەکاندا. لە ڕاستیشدا، دابەشبوونە سیاسیەکەی ئەورووپای ڕۆژئاوای پاش

ڕوخانی ئیمپراتۆریای ڕۆژئاوا، بەو مانایە دێت كە هیچ میرنشینێك بە تەنیا ناتوانێت زمانی لاتینی بۆ خۆی قۆرغ بكات و بیكاتە زمانی دەوڵەتەكەی‌و بە تەنها زمانی دەوڵەتەكەی خۆی بێت، لەبەرئەوە دەسەڵاتە ئاینییەكەی زمانی لاتینی، هەرگیز هاوتایەكی سیاسی ڕاستەقینەی لە پاڵدا نەبوە.

لەدایكبوونی زمانە ناوچەییەكان، وەك زمانی بەڕێوەبردن، دەكەونە پێش لە دایكبوونی چاپەمەنی‌و شۆڕشی ئاینی سەدەی شازدەوە، لەبەرئەوە پێویستە (لانیكەم لە سەرەتاوە) وەك فاكتەرێكی سەربەخۆو بێلایەن سەیری كاریگەریی ئەو هۆكارە بكەین لە پەرتكردنی جڤاتە پیرۆزە فەنتازیكراوەكەدا. لە هەمانكاتدا هەرگیز شتێكیش نیە ئاماژە بۆ ئامادەبوونی چەند پاڵنەرێكی قووڵی ئایدیۆلۆژی بكات كە زمانە ناوچەییەكان لە بەڕێوەبردندا پشتی پێ ببەستن، چ جای پاڵنەرە نەتەوەییە سەرەتاییەكان. "ئینگلتەرا" لەلای باكوری ڕۆژئاوای ئەوروپای لاتینیەوە نمونەیەكی تایبەتی ڕۆشنگەریە. پێش داگیركردنی نۆرماندی، ئەنگلۆساكسۆنی زمانی ناو كۆشك و زمانی ئەدەب و بەڕێوەبردن بوو، بەڵام لە سەدەو نیوی داهاتوودا هەموو دۆكیومێنتەكانی پاشایەتی، بە كردەوە، بە زمانی لاتینی دەنووسران. لە نێوان ساڵانی (*1200–1350*)دا زمانی فەرەنسی نۆرماندی جێگەی لاتینی ڕەسمی (لاتینی–دەوڵەت)ی گرتەوە. لەو سەروبەندەدا ئاوێتەبوونێك لە نێوان زمانە فەرەنسیەكە كە زمانی چینی فەرمانڕەوایی بیانیە– لەگەڵ زمانی ئەنگۆساكسۆنیدا –كە زمانی خەڵكانی ڕەشۆك و بەستەزمانە– ڕوویداو بەوەش ئینگلیزییەكی بەرایی هاتە ئاراوە. ئەم ئاوێتەبوونە دەرفەتی لە بەردەم زمانە نوێكەدا كردەوە بەوەی كە لە دوای ساڵی *1362*ەوە ڕۆڵی خۆی بگێڕێ، تاوەكو ببێتە زمانی كۆشكەكان و ئەو زمانەی دەركەی پەرلەمانی پێدەكرێتەوە– لە پاش ئەوەش دەستنوسێكی وایكلیف هاتە پێشەوەو لە ساڵی *1382*دا {ئەنجیل}ی وەرگێڕرایە سەر زمانی ناوچەیی[12]. زۆر پێویستە ئەوە ڕەچاوبكرێت كە ئەو یەكبەدوای یەك هاتنە زنجیرە زمانێكی {دەوڵەت} دەگرێتەوە، نەك زنجیرەیەك زمانی {نەتەوەیی}؛ ئەو دەوڵەتەشی لێرەدا مەبەستە، تەنها ئینگلتەرەو وێڵزی ئەمڕۆ ناگرێتەوە، بەڵكو لە هەندێ كاتی جیاجیادا، چەند بەشێكی ئێرلەندەو ئۆسكوتلەندەو فەرەنساش لەخۆدەگرێت. وەك دەزانرێت ژمارەیەكی زۆری خەڵكانی ڕەشۆكی هەبوون هیچ كام لە زمانەكانی لاتینی‌و فەرەنسی‌و نۆرماندی‌و، ئینگلیزی سەرەتایشیان نەزانیوە[13]. بە هەمووی سەدەیەك بەسەر باڵادەستی سیاسییانەی زمانی ئینگلیزیدا تێنەپەڕیبوو كە دەسەڵاتی لەندەن لە فەرەنسا داماڵرا.

هـەمان ڕەوت لەسـەر ڕۆخـەکانی سـینیش ڕوویـان دا، ئەگـەرچی بـە ئاسـتێکی سستریش بووبێت. بلوخ سەبارەت بەم پێشکەوتنانە دەڵێت "زمـانی فەڕەنسـی کـە پێشـتر جگـە لـە شـێوەیەکی گەندەڵیانـەی زمـانی لاتینـی شـتێکی تـر نـەبوو، چـەند سەدەیەکی خایاند بۆ ئەوەی خۆی بخاتە ئاستی زمانێکی ئەدەبی ناوازەوە[14]، بەڵام لە ساڵی *1539*دا لەناو گۆڕەپانی داوەریدا بوە زمانی ڕەسمی، بە تایبەتیش ئەوکاتەی شا فرانسوای یەکەم بڕیارنامەی *Edit of Villers*[15]ی دەرکرد، ئەمە لـە کاتێکدا زمـانی لاتینیش ماویـەکی زۆر درێژتر لـە شانشینەکانی تردا بە زیندوویی مایەوە لە ژێـر سایەی فەرمانڕەوایـەتی خێزانی هابسبۆرگدا تـا بەشێك لـە سـەدەی نۆزدەهـەم بـڕی کـرد– لـەلای شانشـینەکانی تریـش چـەند زمـانێکی ناوچـەیی {بیـانی} دەرکـەوتن و جێگـەی زمـانی لاتینیـان گرتـەوە: زمانی نـاو کۆشکی وەچـەی ڕۆمـانتۆڤ لـە مـاوەی سەدەی نۆزدەهەمدا فەڕەنسیو ئەڵمانی بوە[16].

لە هەموو حاڵەتێکدا، "هەڵبژاردن"ی زمان، ئاڵوگۆڕێکی هێواشی بەخۆوە دیوە، کە بەدەر بوە لە هۆشیاری خودییو بە پێی سوودو بەرژەوەندی خۆی، چۆتە پێش، چ جـای بڵێـین هەڕەمـەکیو لـەخۆوە بـوە، چونکـە ئـەم هەڵبژاردنـە، بـەم سـیفەتەی، بـە تـەواویی لـەو سیاسـەتگەلە زمانەوانیـە هۆشمـەندە مەبەسـتدارە، جیـاواز بـوە، کـە بنەماڵـەکانی پاشـایەتی فـەرمانڕەوا لـە سـەدەی نۆزدەهـەمدا گرتویانەتـە بـەر کاتـێ ڕووبەڕووی هەڵکشـانی تـەوژمی ناسیۆنالیزمی زمانـەوانی جەماوەریو دوژمنکارانـە بوونەتـەوە. هێمایـەکی ڕوون و ئاشـکرا بـۆ ئـەم جیاوازییـەش، ئـەوەبوو، کـە زمانـە کۆنەکانی بەڕێوەبردن، کورتبوونەتەوە بۆ ئەمانەی خوارەوە: ئەمانە ئەو زمانگەلە بوون کـە دەسـتەو نـاوەندە ڕەسمیـەکان بـە پێـی پێداویسـتیە ڕۆژانەییـەکانیان بـەکاریان هێنـاون. هیـچ بیرۆکـەو نیـازێکی پێشـوەخت لـە ئـارادا نـەبوە تـا بێـت و بـە پێـی بەرنامەیـەکی داڕێـژراو زمانێك بەسـەر چـەند کاتێکی ڕەشۆکیدا بسـەپێنێ[17]. لەگـەڵ ئەوەشـدا، بەرزکردنـەوەی ئـەو زمانـە ناوچەییانـە بـۆ ئاسـتی زمانـەکانی دەسـەڵات، پێویسـتییان بەوەیـە، بـە مانایـەك لـە ماناکـان، وایـان لێ بکرێـت کێبڕکـێ لەگـەڵ زمـانی لاتینیـدا بکـەن (فەڕەنسـی لـە پـاریس و، ئینگلیـزی {سـەرەتا} لـە لـەندەن)، کـە ئێمـەش ڕۆڵی خۆی لە تێکشکاندنی بیرۆکەی جڤاتی فەنتازیکراوی جیهانی مەسیحیەتدا گێڕا.

ئەگەر بە قووڵی بە ناخی مەسەلەکاندا ڕۆچین، ئەوەمان بە لاوە پەسەند دەبێت کە لە چوارچێوەی ئێستادا، دەستەبژێری زمانی لاتینی، بە بەرچاو لێڵیەکەیەوە، ڕیفۆرمە

پرۆتستانتیو پەرەسەندنە هەرەمەکیەکەی زمانە ناوچەییەکان لە کاروباری بەڕێوەبردندا، هەموویان کاریگەری پڕبایەخن، کە ئەم گرنگیەشیان بە مانا سلبیەکەی لە بەشداریکردنیانەوەیە لە هێنانەوە خوارەوەی زمانی لاتینی لەسەر تەختی دەسەڵات و لەت و پەتکردنی بیرۆکەی جڤاتی فەنتازیکراوە لە جیهانی مەسیحیەتدا. هەروەها دەکرێت بە تەواوی وێنای چۆنێتی دەرکەوتنی جڤاتە ناسیۆنالیزمە فەنتازیکراوەکان لە سەردەمی هاوچەرخدا، بکەین، بێ ئەوەی هیچ یەکێکیان، یاخود بێ ئەوەی هەموویان بە شارستانی بووبن، بەڵام ئەوەی وای لەم کۆمەڵ و جڤاتە نوێیانە کرد، بە مانا ئیجابییەکەی، بە فەنتازیا بکرێن، ئەو کارلێکە نیمچە ڕێکەوت و لەخۆوەی نێوان سیستمی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی {سەرمایەداری} و تەکنەلۆژیای گەیاندن (چاپەمەنی) و حەتمیەتی هەمەجۆرییەکەی زمانی مرۆڤایەتیە[18].

چەمکی {حەتمیەت}، لێرەدا بە مەسەلەیەکی جەوهەری دادەنرێت. هەرچۆنێك بێت تەنها لە توانای سەرمایەداریدایە تراژیدیای بان مرۆیی بیهێنێتە ئاراوە، کە لە هەریەك لە مەرگ و فرەیی زماندا، دوو دوژمنی سەختی پێکهێناوە[19]. دەکرێت زمان بمرێت یان بپووکێتەوە، بەڵام هەرگیز ناکرێت هەموو مرۆڤایەتی لە زمانێکدا کۆبکرێتەوە. پێکەوەگرێدانی ئەم دوو ڕاستیەو زەحمەت بینین لە تێگەیشتنیاندا، بایەخێکی کەمی هەیە گەر لە ڕوانگەیەکی مێژوویی بەر لە سەردەمی سەرمایەدارییەوە سەیریان بکەین، بەڵام ڕەوشەکە لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرمایەداریو چاپەمەنیدا گۆڕرا، چونکە ئەم دوانە دوایی خوێنەرێکی فراوانیان پەیدا کرد کە بە یەك زمان دەخوێنێتەوە.

کاتێك کە دەڵێین پێویستە دەست بە بیرۆکەی حەتمیەتی ڕەوشە گشتییەکەی فرە زمانێتییەوە بگرین، ناکرێت لە یەکتری بترازێنرێن، هەڵەیە ئەو حەتمیەتە بکەینە هاوشانی توخمە باوە بەربڵاوەکەی نێو ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیزم، ئەم توخمەی کە پێ لەسەر حەتمیەتی ئەسڵی (بەرایی) چەند زمانێکی دیاریکراو دادەگرێت کە لە پاڵ چەند یەکەیەکی ناوچەیی دیاریکراودان، بەڵام ئەوەی بە لامانەوە شتێکی جەوهەری بێت، تێهەڵکێشبوون و کارلێکی نێوان هەریەك لە حەتمیەت و تەکنەلۆژیاو سەرمایەداریە. لە ئەورووپاداو بە تایبەتیش لە هەموو ئەو شوێنانەی کەوتوونەتە پێش قۆناغی چاپەمەنیەوە، ژمارەیەکی زۆر لە زمانی ئاخاوتن هەبوون، واتە ئەو زمانانەی کە بەلای ئەوانەی پێی دەواون، هەموو شتێك بوە. بەڵام قەبەیی ئەم هەمەجۆرییەی لە

ئاستێکدا بوە ئەگەر سەرمایەداری چاپەمەنی، هەوڵی وەگەڕخستنی هەر بازاڕێکی خاوەن زمانێکی ناوچەییو شەفەوییانەی دابێت، ئەوا لە دواجاردا تەنها سەرمایەداریەکی کورتەبنەی گرگنی بۆ هێشتۆتەوە، بەڵام ئەو شێوازە هەمەجۆرانە دەکرێن لە سنوورێکدا یەکبخرێن و کۆبکرێنەوە تاوەکو بکرێنە زمانگەلێکی چاپئامێزو لە رووی ژمارەشیانەوە کەمبکرێنەوە. مۆرکە چلۆنایەتیەکەی هەر پێڕەوگەلێکی هێمای دەنگەکان، پرۆسەی کۆکردنەوەی ئاسانکردوە[20].

هاوکات، تاوەکو هێماکان زیاتر وێنەیی رەمزیی بووبن، رووبەری کۆکردنەوەشیان فراوانتر بوە. مرۆڤ دەتوانێت سەرنجی جۆرێك لەو پلەبەندییە بدات کە لە جەبرەوە بەرەو خوار داکشاوەو بەرەو زمانی چینیو ئینگلیزی دەڕوات و لەوێشەوە بە هەندێك برگەی ئەبجەدیی زمانەکانی وەك فەرەنسیو ئەندەنووسی دەگات. هیچ شتێك ئەوەندەی سەرمایەداری نەیتوانیوە زمانەکان {یەکبخات} و لە چوارچێوەیەکی شیاوی رێزمان و رستەسازیدا، زمانگەلێکی چاپئامێزانە دابهێنێو لە رووی میکانیکیشەوە بەرهەمی بهێنێتەوەو بەنێو بازاڕیشدا بڵاوی بکاتەوە[21].

ئەم زمانە- چاپئامێزانە بە سێ رێگەی جیاواز بنەمایان بۆ هۆشیاری نەتەوەیی داڕشتوە:

یەکەم: پێش هەر شتێك، ئەم زمانە چاپئامێزانە چەند کایەیەکی یەکگرتوویان بۆ ئاڵوگۆڕکردن و گەیاندن دروستکردوە کە لە زمانی لاتینی نزمترو لە زمانە ناوچەییە شەفەوییەکانیش باڵاتر بوون. ئەوانەی بە شێوەزارە هەمەچەشنە زۆرو زەبەندەکانی فەرەنسی (*Freches*)، یاخود ئینگلیزی (*English*)، یان ئیسپانی (*Spanishes*) دەدوان، ئەوانەی رەنگە لە کاتی ئاخاوتندا زەحمەتی زۆریان بۆ لێکتر تێگەیشتن دیبێ، دواتر لە رێگەی چاپەمەنیو کاغەزەوە بە باشی لێکتر تێدەگەیشتن. هێدی هێدی، لە میانەی ئەم پرۆسەیەوە پەییان بەوە برد کە بە سەدان هەزارو بگرە ملیۆنان کەس هەن لە هەمان کایەی زمانەوانی تایبەتدان، هەروەها لەوەش تێگەیشتن کە هەر ئەو سەدان هەزارو چەند ملیۆن کەسەن ئینتیمایان بۆ ئەو کایەیە هەیە. ئەو خوێنەرانەی کە چاپەمەنی بە یەکەوە گرێی داون، لە وجودە دونیاییە {عەلمانی}یە تایبەتیەکەیاندا ئەو نادیارە بینراوەیان پێکهێنا، کە کۆرپەلەی جڤاتە فەنتازیکراوە ناسیۆنالیستیەکانە.

دووەم: چاپەمەنی سەرمایەداری مۆرکێکی جێگیربوونی نوێی بەخشیە زمان، کە لە مەودای دووردا، زەمینەی بۆ پێکهێنانی وێنەی ئەو ڕابردووە دوورە خۆشکرد، کە

لە بیرۆكەی خودێتی گەلاندا چەقێكی ناوەندی پێكدێنێ. كتێبی چاپكراو، هەروەك مارتن و ڤیڤەر پێمان دەڵێن، هەمیشە پارێزگاری لەوە كردوە كە لە هەموو كات و شوێنێكدا دەتوانێت بە شێوەیەكی لە ئەژماردن نەهاتوو زیاد بكات. هەروەها نەشچۆتە ژێر ڕكێفی ئەو نەریتە تاكیو {نوێخوازییە ناهۆشیاریەكان}ی چاپكەرانی {كڵێسا}وە. بەمجۆرە لە كاتێكدا ئەو زمانە فەڕەنسییەی سەدەی دوازدە جیاوازیەكی زۆری لەگەڵ ئەو فەڕەنسیەی {فیلۆن}ی سەدەی پازدەدا هەبوە كە پێی نوسیوە، كەچی تاوی گۆڕان لە سەدەی شازدەدا خاوبوونەوەیەكی گەورەی بەخۆوە دیوە. "بەهاتنی سەدەی حەڤدەهەم، زمانەكان لە ئەوروپادا، چەند فۆرمێكی نوێیان لەخۆگرت"[22]. ئەگەر بە شێوازێكی تر ئەمە دەربڕین، ئەوكات دەڵێین، ئەو سێ سەدەیەی بە دوای ئەم كاتەدا هاتوون، وای لەو زمانە چاپئامێزە سەقامگرتووانە كردوە، بریقەیەكی تاریك و ئەنگوستە چاویان هەبێت. وشەكانی باووباپیرانمان كە لە سەدەی هەڤدەدا هاتوونەتە بەردەستمان، زۆر جیاوازە لەو ڕەوشەی فیلۆن، چونكە ئەو وشەكانی باپیرانی سەدەی دوازدەهەمی خۆی لێ كلۆم درابوو.

سێهەم: چاپەمەنی سەرمایەداری چەند زمانێكی بۆ دەسەلات خولقاندوە كە جیاوازن لە زمانە ناوچەییە كارگێڕیە كۆنەكان. هەندێ لە شێوازەكان "نزیكتر" بوون لە زمانی چاپەمەنیەوەو توانییان بەسەر دوا فۆرمی خۆیاندا زاڵ بن. بەلام هەرچی شێوە زارەكانی تری سەر بە خێزانی {كچە ئامۆزا زەرەرمەندەكان} بوو، ئەوان ڕۆڵی خۆیان ونكرد، ئەگەرچی دەكرا ئەمانە لە لایەن زمانی چاپئامێزانەی تازە سەرهەڵداوەوە لەخۆ بگیرێن، بەلام هۆكاری لەدەستدانی ئەو ڕۆڵەشیان بۆ سەرنەكەوتوویی ئەم شێوە زارانە دەگەڕێتەوە {یاخود سەركەوتنێكی كەمیان بەدەستهێنا} لە پێدانی فۆرمێكی چاپئامێزانەی تایبەت بە خۆیان. زمانی ڕەشۆكیانەی {ئەڵمانی/ باكوری ڕۆئاوا} سەرباری ئەوەی شێوە زارێكی پلە دوون، كەچی توانی ببێتە ئەڵمانییەكی قسەپێكراو، هۆكارەكەشی ئەو نەرمیەیە كە ئەم شێوە زارە لە كاتی گۆڕانیدا بۆ ئەڵمانیەكی چاپئامێز نواندی. بە پێچەوانەی زمانی چیكی شەفەویی لە بۆهیمیا، كە نەیتوانی لەگەڵ بواری چاپەمەنیدا بێتەوەو لەگەڵیدا نەگونجا. هەریەك لە زمانی {ئەڵمانی باڵا}و شا ئینگلیزو {پاشتریش} تایلەندی نێوەند، هەر هەموویان بەرەو ئاستێكی نوێی سیاسی ڕۆشنبیریی باڵا هەڵكشان. (لێرەدایە كانگای ناكۆكیەكانی سەدەی بیستەم لە ئەوروپادا، لە لایەن هەندێ لە {لقە} نەتەوەییەكان كە دەیانویست پێگە نزم و لاوەكانیان لە ڕێگەی بڕینی دیواری چاپەمەنی- ڕادیۆوە، بگۆڕن).

پێویستە لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە جێگیربوونی زمانە بەچاپگەیشتوەکان و گۆڕینی جێوڕێی هەریەکەیان، تا ڕادەیەکی زۆر پرۆسەیەکی نائاگایانەیەو زمادەی ئەو کارلێکە بەتینەی نێوان هەریەک لە سەرمایەداریو تەکنەلۆژیاو فرەییە لە زمانی مرۆڤدا، بەڵام ئەو ئەنجامەش، وەك هەر کام لە سیماکانی تری ناسیۆنالیزم، بۆ ئەوە دەرناکەون ببنە چەند مۆدێلێکی ڕوکەش کە مایەی لاساییکردنەوە بن، بەڵکو دەکرێت بە شێوەیەکی هۆشیارانەو بە ڕۆحێکی میکیاڤیلانەوە بخرێتە گەڕ بە جۆرێك کە سودبەخش بن. بۆ نمونە، لەمڕۆماندا حکومەتی تایلەندی دژی ئەو مزگێنبەخشە بیانیانەیە کە دەخوازن سیستەمی ئەبجەدیی بدەنە هۆزو تیرە کەمایەتیەکانی سەر چیاکان، بە مەبەستی پێشخستنی نووسین بە زمانی ئەو کەمایەتیانە خۆیان، لە کاتێکدا ئەو حکومەتە گوێیەکی ئەوتۆ بە هیچ کام لەو زمانانە نادات کە ئەو کەمایەتییانە لەنێو یەکدا پێی دەئاخڤن. یاخود ئەو گەلانەی بە زمانی تورکی دەدوێن و لەو ناوچانەشدا نیشتەجێن کە بەهەریەك لە تورکیای هاوچەرخ و ئێران و عێراق و یەکێتی سۆڤێتەوە لکێنراون، نمونەیەکی تری زۆر ئاشکراو تایبەتە، ئەوانە خێزانێکیان لە چەند شێوە زارێکی شەفەوی پێکهێناوە کە دەشێت لە ڕێگەی ڕێنووسی عەرەبیەوە کۆبکرێنەوەو لێیان تێبگەین، بەڵام کە ئەم یەکێتییەیان بزرکردوە. ئەوە بە هۆی چەند گەمەیەکی ئاگایانەی مەبەستدارەوەیە. {ئەتاتورك} بۆ بەهێزکردنی هۆشیاریی نەتەوەیی تورك، پیتە ڕۆمانییەکانی بە زۆری زۆردارەکی سەپاند کە ئەمەش لەسەر حیسابی ئیماکردنێك بوو بۆ شوناسێکی ئیسلامی فراوانتر[23]. پاش ئەویش یەکێتی سۆڤێت هەمان ڕێچکەی گرتەبەرو پیتە ڕۆمانیەکانی سەپاند بە نیازی ئەوەی دژایەتی ئیسلام و فارسەکانی پێبکات، بەڵام لە سەردەمی ستالینداو لە سیەکانی سەدەی بیستدا، کاروبارەکان بە ئاقاری سەپاندنی پرۆسەی بەڕوسیکردندا ڕۆیشتن، ئەویش لە ڕێگەی بەکارهێنانی پیتی سلاڤیەوە[24].

هەموو ئەوانەی باسکران، دەکرێت بۆ چەند دەرەنجامێك کورتبکرێنەوە کە ئەویش دەرەنجامی ئاوێتەبوونی هەریەك لە سەرمایەداریو تەکنەلۆژیای چاپەمەنیو فرەبوونی حەتمیانەی زمانی مرۆڤایەتیە. پێکەوە هەموویان زەمینەیان بۆ شێوەیەکی نوێ لەو جڤاتە فەنتازیکراوە ڕەخساند کە لەلای خۆیەوەو لە میانەی مۆرفۆلۆجیە سەرەکیەکەیەوە فەزای بۆ نەتەوەیەکی نوێ خوڵقاند. توانای درێژبوونەوەی ئەو جڤاتانە لە ڕووی پێکهاتنەوە سنووردارن، هەروەك چۆن ئەو جڤاتانە پەیوەندییەکی

تەواو ڕێکەوتنیشیان لەگەڵ سنووری سیاسیدا هەبووە (ئەو سنوورەی کە هەمیشە، ڕاژەو ئاماژەگەلێك بوون بۆ خولیای فراوانخوازانەی سولالە پادشایەکان).

وەك ئاشکرایە هەموو ئەو قەوارە نوێیانەی کە ئەمڕۆ خۆیان بە نەتەوە *{Nation}*، یان دەوڵەت نەتەوە *(Nation- state}* دەزانن، خاوەنی *{*زمانگەلێکی نەتەوەیی بە چاپگەیشتوون*}*، ئەمە لە حالێکدا زۆرێك لە دەوڵەتەکان تەنها یەك زمانی هاوبەشیان هەیە، یان هەندێ دەوڵەتی تر هەن، زمانی نەتەوەییان لە ئاخاوتن و لەسەر ڕووبەری کاغەز *{*بەکارناهێنن*}*، تەنها بەشێکی کەمیان نەبێت..

دەوڵەت– نەتەوەییەکانی ئەمریکای ئیسپانی، یاخود ئەوانەی سەر بە خێزانی (ئەنگلۆ– ساکسۆنین) نمونەیەکی بەرچاوی حاڵی یەکەمن، لە کاتێکدا ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتە داگیرکراوەکانی ڕابردوون بە تایبەتیش ئەوانەی ئەفریقیا، نمونەن بۆ حاڵەتی دووەم. بە واتایەکی دی، بە هیچ شێوەیەك گردبوونەوەو پێکهاتنی دەوڵەتە– نەتەوەییە هاوچەرخەکان لە ڕووی فۆرمەوە هاوشێوەی ئەو بڵاوبوونەوە زۆرەی زمانە بە چاپگەیشتوە تایبەتیەکانی نین. ڕاڤەکردنی ئەو بەردەوامنەبوون و پچڕانەی نێوان زمانە چاپئامێزەکان و هۆشیاری نەتەوەییو دەوڵەت– نەتەوە، پێویستی بە لالێکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو قەوارە سیاسیانە هەیە کە لە نیوەی گۆی ڕۆژئاوای نێوان سالانی *1776–1836*دا بەدەرکەوتن، ئەمانە چەند قەوارەیەکن و بە شێوەیەکی ئاگایانە خۆیان بە نەتەوە داناوە، لەگەڵ ئەو کۆمارانەشی *{*خاوەن سولالەی پادشاهی نین، تەنها نمونەی بەرازیل نەبێت کە جێگەی سەرنج و تێڕامانە*}*. کەواتە ئەمانە یەکەمین دەوڵەتی لەمجۆرە نین کە لە ڕووی مێژووییەوە لەسەر شانۆی جیهانی دەرکەوتبن و بەمەش یەکەمین مۆدێلیان پێشکەش کردبێت، تا پێویست بکات ئەم جۆرە دەوڵەتانە وەك ئەو دەربکەون، بەلام ژمارەی ئەو دەوڵەتانەو لە دایکبوونە هاوچەرخەکەیان زەمینەیەکی بەپیتن بۆ توێژینەوەیان لە ڕووی بەراوردکاریەوە.

## پەراوێزەکان

*1*–وەختێك ئەوروپا چاپەمەنی ناسی ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی (*100*) ملیۆن کەس بووە. سەیری ڤیڤەرو مارتن، هاتنی کتێب، لاتینی *248–249* بکە. ***F ever & Martion The Coming of the Book***.

*2*–لەو کاروکردەوانەی دەلالەتی خۆیان هەیە، کتێبی "گەشتەکانی مارکۆپۆلۆ" بە نادیاری مایەوە تا ئەو دەمەی بۆ یەکەمین جار لە ڕێگەی چاپخانەوەو لە ساڵی *1559*دا چاپکرا، لاتینی *13*.

*3*–ئیزنشتاین لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی "بعض الحدوس"، ئاماژەی پێداوە: ***S ome Conjecures, p. 56***.

*4*–ڤیڤەرو مارتن، هاتنی کتێب، لاتینی *122*. (بەلام دەقە ئەسڵییەکە زۆر بە سادەیی تەنها باس لە "بەزاندنی سنوور" دەکات): *184* .

5-هەروەها سەرچاوەی پێشوو، لاتینی 187. دەقە ئەسڵییەکە باس لە سەرمایەدارانی "بەهێز" دەکات نەک "دەوڵەمەند": 281

6-"لێرەداو لەو ڕووەوە، هاتنە ناوەوەی چاپەمەنی، قۆناغێك بوو بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگاکانی ئێستامان، کۆمەڵگەی بەکاربەری بە کۆمەڵ و یەکبوونی پێوانەیی" هەمان سەرچاوە، ل 259-260. ڕەنگە باشترین وەرگێڕانێکی ئەم دەقە ئەوەی: ژیارێکی بە کۆمەڵی یەکبووی پێوانەیی بێت: 394

7-هەمان سەرچاوە، ل 195.

8-هەمان سەرچاوە، ل 289-290.

9-هەمان سەرچاوە، ل 291-295.

10-لە سەرەتای ئەمەوە، ڕەوشەکە هەنگاوێك دوور بوو لە فەڕەنسای سەدەی حەڤدەهەمەوە کە هەریەك لە کۆرۆڵیو مۆلیێرو لافۆنتێن توانییان ئەو دەستنووسانەیان بە کەسە بڵاوکەرەوەکان بفرۆشن کە باسیان لە تراژیدیاو کۆمیدیاکان، دەکرد، ئەم کەسانەش بەو ئامانجە دەیانکڕین کە شاکاری نایابن و نووسەرەکانی بەناوبانگن و نووسینەکانیان لەناو بازاڕی کتێبدا دەنگی داوەتەوە، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل 161.

11-هەمان سەرچاوە، 310-315.

12-ستیون- واتسون، نەتەوەکان و دەوڵەتەکان، لاتینی 28-29. Seton- Watson: Nations & States، بلوخ، کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی، بەرگی یەکەم، ل 75.

13-پێویستیمان بەو گریمانەیەیە کە یەکخستنی کارگێڕیی زمانەوانی ناوچەیی دەمودەست یان بە تەواویی پێکدێت. چاکتر وانیە کە جووییەکان (Guyennce) کە لەناو لەندەندا مەحکومن، هەر لە بناغەوە بە زمانی ئینگلیزی بەرایی بەڕێوەچوە.

14-بلوخ، کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی، بەرگی یەکەم، ل 98.

15-سیتون- واتسون، ل 48.

16-هەمان سەرچاوە، ل 83.

17-جەختکردنەوەیەکی لەبارو گونجاو لەم خاڵەدا هەیەو فرانسوای یەکەم پێشکەشمان دەکات، کە لە ساڵی 1935دا چاپکردنی هەموو جۆرە کتێبێکی یاساغکرد، پاشان بە چوار ساڵ دوای ئەمە زمانی فەڕەنسی کردە زمانی ناو کۆشکەکەی!

18-ئەمە یەکەم {بەریککەوتن}ی کاتی لەمجۆرە نیە. چونکە ڤیڤەرو مارتن سەرنجی ئەوە دەدات کە لە کۆتایی سەدەی سیازدەداو لە ئەوروپادا بۆرژوازیەتێکی دیارو بەرچاو لە ئارادایە، لەگەڵ ئەوەشدا کاغەز بە شێوەیەکی گشتی بەکارنەهاتوە تەنها لە کۆتایی سەدەی چواردەدا نەبێت. ڕووتەختە لەوە ڕێکەکەی کاغەز ڕێگە بەوە دەدا لەسەر ئاستێکی فراوان نووسینەکان زیادبکرێن هەروەها چاپکردنی وێنەش ئەمەش دوای تێپەڕبوونی 75 ساڵ بەسەر بڵاوبوونەوەی کاغەزدا داهات. بەڵام دیسانەوە کاغەز داهێنانێکی ئەوروپی نیە، بەڵکو لە مێژوویەکی ترەوە -لە ڕێگەی جیهانی ئیسلامەوە- بۆمان هاتوە. سەیری، هاتنی کتێب ل 22 و 30 و 45 بکە.

## سەرچاوە

القومية مرض العصر ام خلاصه؟ د. فالح عبدالجبار و آخرون- دار الساقي- الطبعة الاولى- 1995.

جــۆن لاینـــز

# زمانو زمانناسی



لە ئینگلیزیەوە: هــادی محەمەد

## زمان

### زمان چییە؟

+ زمانناسـی دیراسـەکردنی زانسـتیانەی زمانـە. لـە یەکـەم سـەیرکردنەوە ئـەم پێناسـەیە، کە پێناسـەیەکە لـە زۆربـەی پەرتوکـە قوتابخانەییـەکانداو مامەڵـە کردنـە گشــتیەکاندا دەربــارەی بابەتەکــە دەبینرێتــەوە- پێناســەیەکە بــەپێی پێویســت ڕاستەوخۆو یەکسەرییە. بەلام کت ومت مەبەست لـە وشـەکانی "زمان"و "زانسـتی" چییە؟ ئایا دەکرێت زمانناسی بەو شێوەیەی کە ئێستا پراکتیزە دەکرێت، بە زانست وەسف بکرێت؟

+ پرسیاری "زمان چییە؟" هاوتای پرسیاری "ژیان چییە؟"یەو هەندێکیش دەڵێن بە ئاستەم جەوهەریبونی لە جەوهەریبونی ئەو پرسیارە کەمتر بێت. کە ئەمەش پرسیارێکە پێشگریمانەکانی گەمارۆی زانستە بایۆلۆژییەکان دەدەن و یەکی دەخەن. بێگومان "زمان چییە؟" ئەو تەرزە پرسیارە نیە کە هەمیشە بایۆلۆژیست لە ئیشی رۆژانەیدا لە بیریدا بێت. زیاتر، ئەم پرسیارە دەنگدانەوەیەکی فەلسەفیانەی هەیەو بایۆلۆژیست، وەکو هەر زانایەکی تر، عادەتەن هێند بە قوڵی نوقمی وردەکاری کێشەیەکی دیاریکراو دەبێت ناتوانێت بیر لە مانا ناوەکییەکانی وەها پرسیارێکی گشتی بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، واتادارییی ( پڕمانایی -و-) گریمانەکراوی پرسیاری "ژیان چییە؟"_ واتە گریمانەی پێش وەختی ئەوەی کە هەموو شتە زیندوەکان لە خەسڵەتێکدا یان لە چەند خەسڵەتێکدا بەشدارن کە لە هەموو شتە نازیندوەکان جیایان دەکاتەوە- سنورەکانی هومومی بایۆلۆژیست دیاری وجێگیر دەکات و پاساوی سەربەخۆیی یان سەربەخۆیی جوزئی، دیسپلنەکەی دەکات. هەرچەندە دەکرێت پرسیاری "ژیان چییە؟"، بەم مانایە، بکرێت بۆئەوەی هۆی بوون بۆ بایۆلۆژیی، واتە بونی بایۆلۆژی خۆی، دەستەبەر بکات، بەلام ئەوەی زەخیرە دەبەخشێتە مەزەنەو لێکۆڵینەوە رۆژانەکانی بایۆلۆژیست، ئەوەندە ئەو پرسیارە خۆی نیە ئەوەندەی ئەو لێکدانەوە دیاریکراوەیە کە بایۆلۆژیست دەیداتێ، وە روونکردنەوەی مانا زمنیە دورودرێژترەکانی لە چوارچێوەیەکی تیۆرەیی بۆ ئێستا قبوڵکراودا. کەواتە بۆ زمانەوان ئەو پرسیارە پەیوەندیدارە بە پرسیاری "زمان چییە؟"وە.

+ یەکەم شت کە سەبارەت بە پرسیاری "زمان چییە؟" تێبینی ئەکرێت ئەوەیە کە وشەی زمان (***language***) بە تاك بەکار دەهێنێت بەبێ ئامرازی نەناس. داڕشتنی بەم شێوەیە بە زمانی ئینگلیزی، گراماتیکیانە جیاوازە، ئەگەرچی لە رووی ماناشەوە نەبێت، لە پرسیاری بە روکەش هاوشێوەی "زمان چییە؟"(***what is a language***). چەند زمانێکی ئەوروپی دوو وشەیان هەیە بۆ وەرگێڕانی وشەی ئینگلیزی "***language***": بۆ نمونە لە زمانی فەرەنسیدا: (***langage***)،(***langue***). ئیتالی: (***linguaggio***)،(***lingua***)، ئیسپانی(***lenguaje***)،(***lengua***). لە هەر یەك لەو حاڵەتانەدا، جیاوازی نێوان دوو وشەکە، هاوپەیوەندە، هەتا ئاستێك، بە جیاوازی نێوان دوو مانای وشە ئینگلیزییەکە"***language***". بۆ نمونە، لە زمانی فەرەنسیدا وشەی (***langage***) بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژەکردن بە زمان بە شێوەیەکی گشتی و وشەی (***langue***) بۆ

پرسیاری "زمان چییە؟" هاوتای پرسیاری "ژیان چییە؟"یە

ئاماژەکردن بە زمانی دیاریکراو (وەکو زمانی ئینگلیزی کوردی عەرەبی هتد-و-). وا ڕێکەوتوە کە زمانی ئینگلیزی ڕێگە ئەدات بە قسە پێکەرەکانی دەربارەی کەسێك بڵێن، نە تەنها خاوەنی زمانێکە (وەکو ئینگلیزی،چینی، مالیزی، سەواحیلی هتد) بەڵکو خاوەن زمانە( واتە زمان وەکوتوانایەك‌و بەهرەیەکی مرۆیی-و-). فەیلەسوفان‌و دەروونناسان‌و زماننناسان هەموو بە شێوەیەکی باو ئەو تێبینیە ئەدەن کە هەبوونی زمانە زۆر بە ڕوونی مرۆڤ لە گیانەوەرەکانی دی جیادەکاتەوە. لەم نەسکەدا بە وردی سەیری گەوهەری ئەم ئیدیعایە ئەکەین. لێرەدا حەزئەکەم جەخت لەسەر ڕاستیەکی ئاشکراو دیار، بەڵام گرنگ بکەمەوە ئەویش ئەوەیە کە کەس ناتوانێت زمانێکی سروشتی هەبێت (یان بەکاری بهێنێت) بە بیٚ هەبوونی (یان بەکارهێنانی) زمانێکی سروشتی دیاریکراو.

+ من هەر ئێستا زاراوەی "زمانی سروشتی"م بەکارهێنا؛ کە ئەمەش ئەمانباتەوە سەر خاڵێکی دی. وشەی "زمان" نە تەنها بەسەر زمانەکانی ئینگلیزی‌و چینی‌و مالیزی‌و سەواحیلیدا پراکتیزە دەبێت بەڵکو _ واتە ئەو شتەی کە هەموان لەسەر ئەوە پێك هاتون کە لە جێی خۆیەتی پێی بوترێت زمان_ بەڵکو چەند سیستمێکی جۆراوجۆری تر لە کۆمۆنیکەیشن، نۆتەیشن (*notation*) (دانانی نیشانەی زاراوەیی-و-)، یان حسابکردن، کە دەربارەیان بواری مشتومڕ هەیە. بۆ نمونە ماتماتیکناسان، لۆژیستان‌و زانایانی بواری کۆمپیوتەر زۆرجار بە مەبەستی دیاریکراو پشتگیری لەو ڕایە دەکەن، کە سیستمەکانی نۆتەیشن، چ لە جێی خۆیدا بێت یان نا کە پێیان دەوترێت زمان، سیستمی دەستکردن(*artificial*) زیاتر لەوەی زمانی سروشتی بن. هەروەها ئیسپرانتۆ، کە لە دوادواییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا داهێنرا بۆ مەبەستی کۆمۆنیکەیشنی نێودەوڵەتی، زمانێکی دەستکردە هەرچەندە پشت دەبەستێت بە زمانە سروشتیە لەوەوپێش هەبوەکان‌و بە شێوەیەکیش کە نکولی لیٚ ناکرێت زمانە. سیستمی تری کۆمۆنیکەیشن هەیە، مرۆیی‌و نا-مرۆیی، کە بە جەختەوە سروشتین نەوەك دەستکرد، بەڵام وا دیارنین زمان بن بە مانای وردی زاراوەی زمان هەرچەندە وشەی "زمان" بە شێوەیەکی باو بۆ ئاماژە پێکردنیان بەکار دەهێنرێت. گوزارەی وەکو "زمانی نیشانە"، "زمانی جەستە" یاخود "زمانی هەنگ" لەم بارەیەوە وەربگرە. زۆرینەی خەڵك ئەڵێن کە لێرەدا وشەی "زمان" وەکو میتافۆر یان بە شێوەیەکی مەجازی بەکار هاتوە. تەواو جێی سەرنجە کە وشەی "*langage*" زیاتر لە "*langue*" عادەتەن بەکاردەهێنرێت لە وەرگێڕانی وەها گوزارەیەکدا بۆ زمانی فەرەنسی. وشەی

فەرەنسی "*langage*" (وەکو وشەی "*linguaggio*" ئیتالی و وشەی "*lenguaje*" ئیسپانی) گشتیترە لە تاکەکەی تری ئەو جووتە وشانە، نە تەنها لەوەدا کە بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژەکردن بە زمان بە شێوەیەکی گشتی، بەڵکو هەروەها لەوەشدا کە بەسەر سیستەمەکانی کۆمۆنیکەیشندا پراکتیزە دەبێت، چ سروشتی بن چ دەستکرد، چ مرۆیی بن چ نا-مرۆیی، کە بۆیان وشەی "*language*"ی ئینگلیزی بەکار دەهێنرێت کە وا دیارە ماناکەی درێژکراوەی ئەم وشەیە بێت.

+ زمانناسان بە شێوەیەکی سەرەکی گرنگی بە زمانە سروشتییەکان ئەدەن. پرسیاری "زمان چییە؟" ئەو گریمانە پێشوەختە لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت کە هەر یەکێك لەو چەند هەزار زمانە سروشتیە جیاوازە ناسراوەی کە لە سەرتاسەری جیهاندا قسەی پێدەکرێت حاڵەتێکی دیاریکراو(معین)ە لە شتێکی گشتیتر. ئەوەی زمانناس ئەیەوێت بیزانێت ئەوەیە ئایا هەموو زمانە سروشتیەکان شتێکیان هەیە بە عام کۆیان بکاتەوە کە سیستەمەکانی تری کۆمۆنیکەیشن هاوبەش نەبن تیایدا، ئیتر ئەو سیستمانە مرۆیی بن یان نا-مرۆیی، لەوەدا ئایا جێی خۆیەتی وشەی "زمان" بۆ هەر یەکێکیان بەکار بهێنرێت، وە کە نکوڵی لە بەکارهێنانی زاراوەکە بکەن بۆ سیستەمەکانی تری کۆمۆنیکەیشن- بێجگە لەو حاڵەتەی کە تیایدا وەستابنە سەر زمانی سروشتی لەوەوبەر هەبوو وەکو ئێسپرانتۆ. ئەمە ئەو پرسیارەیە کە لەم نەسکەدا پێیەوە خەریك دەبین.

## چەند پێناسەیەکی "زمان"

+ زەحمەت نیە پێناسەکانی زمان ببینینەوە. با سەیری هەندێکیان بکەین. هەر یەك لەم بەیانکردن(تصریح)انەی خوارەوە، چ مەبەست لێیان پێناسە بێت یان نا، خاڵێك یان زیاتر دەوروژێنن کە دواتر وەریان دەگرین. هەموو بەیانکردنەکان لە کارە کلاسیکیەکانەوە وەرگیراون کە دەگەڕێنەوە بۆ زمانناسە بەناوبانگەکان. بە وەرگرتنی هەموویان پێکەوە، یارمەتی ئەوە ئەدەن ئیشارەتێکی سەرەتایی بدەن بە دەستەوە سەبارەت بەو خەسڵەتانە کە زمانەوان لانی کەم ئەیەوێت وەکو شتێکی بنەڕەتی سەبارەت بە زمان بیری لێ بکاتەوە.

-لای ساپێر (*1921 : 8*)"زمان میتۆدێکی مرۆیی پەتی و ناغەریزیە بۆ ئاڵوگۆڕی بۆچوون و هەست وسۆزو حەزەکان لە ڕێگەی هێمای خۆ-ویستانە(وعی) بەرهەم هێنراوەوە".ئەم پێناسەیە چەند خەوشێکی تێدایە. هەر چەندێك بەر بڵاوانە

زاراوەکانی وکو "بۆچوون"و "سۆز"و "حەز" لێك بدەینەوەو ڕاڤە بکەین، ڕوون دیارە کە زۆر شت هەیە لە ڕێگەی زمانەوە ئاڵوگۆڕ دەکرێت (دەگەیەنرێت–و–) کە هیچ کام لەو زاراوانە نایانگرنەوە: بە شێوەیەکی تایبەت، وشەی "بۆچوون" (*idea*)، لە بنەڕەتەوە وشەیەکی ورد نیەو تەمومژاویە. لە لایەکی ترەوە، چەندین سیستمی هێمای خۆ–ویستانە بەرهەمهێنراو هەیە کە بە زمان لە قەڵەممان داون تەنها لەبەرئەوەی هەست ئەکەین کە مانایەکی درێژکراوەی یان میتافۆریانەی وشەی "زمان"ن. بۆ نمونە ئەو شتەی کە ئێستا لەناو خەڵکدا بە گوزارشتی "زمانی جەستە" ئیشارەتی پێ ئەکرێت– کە تیایدا "ئیمائە" (واتە جوڵەی دەست یان سەر بۆ ئیشارەتکردن بە....، یان ڕوونکردنەوەی بۆچوونێك –و–)، "پۆسچەر" (باری وەستانی لەش‌و لار –و–)، ورد بونەوە بە چاوو هتد، وا دیارە لەگەڵ ئەم بەشەی پێناسەکەی ساپێردا دێتەوە، بەڵام مەسەلەی ئەوەی ئایا مرۆیی پەتی‌و ناغەریزیە مەسەلەیەکە بە شێوەیەکی نکوڵی لێنەکراو گومانی لێ دەکرێت. هەروەها مەسەلەی ئەوەی ئایا زمان، بە واتای زمان، لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی پەتی مرۆیی‌و ناغەریزیشە، ئەویش مەسەلەیەکە بە شێوەیەکی نکوڵی لێنەکراو گومانی لێدەکرێت وەکو لە داهاتودا دەیبینین. ئەمە ئەو خاڵە سەرەکیەیە کە دەبێت لە پێناسەکەی ساپێردا تێبینی بکرێت.

–لە کتێبی "کورتەیەك لەسەر شیکاریی زمانناسی"[1] بلۆچ‌و ترەیگەر نوسیویانە (*1942: 5*): "زمان سیستمی هێمای دەنگی یان گوتراوی هەڕەمەکیە[2] کە لە ڕێگەیەوە گروپێکی کۆمەڵایەتی هاوکاری دەکەن". ئەوەی لەم پێناسەیەدا جێگەی سەرنجە، بە پێچەوانەی پێناسەکەی ساپێرەوە، ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆو زمنی نەبێت، سەرنج بۆ لای وەزیفەی کۆمۆنیکەیشن–ئامێز (الوظیفة الایصالیە)ی زمان ڕاناکێشێت. لەباتی ئەوە، هەرچی جەختە ئەیخاتە سەر وەزیفە کۆمەڵایەتیەکەی، بەمەش، هەر وەکو دواتر دەبینین، تێڕوانینێکی تا ڕادەیەك تەسکی دەبێت بۆ ئەو ڕۆڵەی زمان دەیگێڕێت لە کۆمەڵگەدا. پێناسەکەی بلۆچ‌و ترەیگەر لەوەدا لە پێناسەکەی ساپێر جیاوازە کە خەسڵەتی هەڕەمەکێتی دەهێنێتە ناوەوەو بەئاشکرا زمان دەوەستێنێتە سەر تەنها زمانی قسەکردن (بەمەش گوزارەی "زمانی نوسراو" دەکاتە شتێکی هاودژ(متناقض)). زاراوەی "هەڕەمەکێتی" لێرەدا بە واتایەکی تاڕادەیەك تایبەت بەکار دەهێنرێت: کەمێکی تر دەگەڕێینەوە سەر ئەمە. هەروەها دەگەڕێینەوە سەر مەسەلەی ئەو پەیوەندیەی کە لە نێوان زمان‌و ئاخاوتندا هەیە.

هەموو ئەوەی پێویستە لەم ئاستەدا بوترێت ئەوەیە: بەشبەحاڵی زمانە سروشتیەکان، پەیوەستییەکی نزیک هەیە لە نێوان زمانو ئاخاوتندا. بە شێوەیەکی لۆژیکی، قسەکردن گریمانەی پێشوەختی زمان ئەکات: واتە ناتوانین بەبێ زمان قسە بکەین (واتە بەبێ زانینو قسەکردن بە زمانێکی دیاریکراو)، بەڵام ئەتوانین بەبێ قسەکردن زمان بەکار بهێنین، بەڵام بە پێ-لێنان لەوەی کە زمان بە شێوەیەکی لۆژیکی سەربەخۆیە لە ئاخاوتن، زەمینیەکی لەبار هەیە بۆئەوەی بڵێین، پێ بزانین لە هەموو زمانە سروشتیەکاندا قسەکردن لە رووی مێژوییەوە، پێدەچێت لە ڕوی بایۆلۆژیشەوە، پێش نوسین کەوتوە. ئەمە ئەو تێڕوانینەیە کە زۆربەی زمانناسان هەیانە.

-لە نوسینەکەیدا بە ناونیشانی "ووتارێك لەسەر زمان"[3] ، هال (*1968: 158*)، پێمان ئەڵێت زمان "ئەو دامەزراوەیە کە لێیەوە مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدی کۆمۆنیکەیشنو کار لێك دەکەن لە ڕێگەی هێمای هەڕەمەکی زارەکی-بیستراو (شفهی-سمعی)ی وەکو عادەت بەکارهێنراوەوە". لەناو ئەو خاڵانەی لێرەدا تێبینی ئەکرێن ئەمانەن، یەکەم شت، ڕاستی ئەوەی کە کۆمۆنیکەیشنو کارلێککردن هەردوکیان هێنراونەتە ناو پێناسەکەوە (لەحاڵێکدا "کارلێککردن" فراوانترەو لەم ڕووەوە، باشتریشە لە "هاوکاریکردن"). دوەم شت، دەکرێت زاراوەی "زارەکی-بیستراو" تەقریبەن وەکو هاوتای "گوتراو یان دەنگی" وەر بگیرێت، کە ئەمەش تەنها لەوەدا جیاوازە لێی کە گوزارەی "زارەکی-بیستراو" ئیشارەت بە بیستەر هەروەها قسەکەریش دەکات (واتە ئیشارەت بە وەرگر هەورەها نێرەری ئیشارەتە گوتراو یان دەنگیەکان ئەکات کە ئێمە وەکو لەبز یان گوتەکانی زمان(تفوهات أو ملفوظات اللغە) دەستنیشانی ئەکەین). هاڵیش وەکو ساپیر مامەڵە لەگەڵ زماندا وەکو دامەزراوەیەکی مرۆیی پەتی دەکات: زاراوەی "دامەزراوە" ئەو تێڕوانینە ڕون دەکاتەوە کە ئەو زمانەی لە لایەن کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە بەکار دەهێنرێت بەشێکە لە کولتوری ئەو کۆمەڵگایە. ئەوا جارێکی تریش خەسڵەتی هەڕەمەکێتی، جارێکی تر پەنجەی دەخرێتە سەرو ناودەبرێت.

+ سەرباری ئەوەش، ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر شایانی باسە لە پێناسەکەی *هاڵ*دا، بەکارهێنانێتی بۆ زاراوەی "وەکو عادەت بەکارهێنراو": ئەمەش هۆی مێژویی لە پشتەوەیە. زمانناسیو سایکۆلۆژیای زمان بۆ ماوەی نزیکەی سی ساڵێك بە

قورسی لەژێر کاریگەری تیۆرەکانی هاندەر–وەڵام (المثير والاستجابة)ی سلوکیەکاندا بون، بە تایبەتی لە ئەمریکاو لەناو چوارچێوەی تیۆرەی سلوکیەتدا، زاراوەی "عادەت *habit*" واتایەکی تا ڕادەیەك تایبەتی وەرگرت. زاراوەی عادەت وەکو ئیشارەت–کردن بەو ڕەفتارانە بەکار دەهێنرا کە قابیلی دەستنیشان–کردنن وەکو ئەوەی لە ڕووی ئاماریەوە وەڵامی پێشبینی پێکراو بن بۆ هاندەری دیاریکراو. (واتە ڕەفتارەکان وا سەیر دەکران کە وەڵام بن بۆ هاندەری دیاریکراو–و–). زۆر لەو شتانەی کە ئێمە عادەتەن وا بیری لێ ناکەینەوە وەکو مەسەلەی عادەت ئەنجام بدرێن، هێنرانە ناو مەودای زاراوەی سلوکیەکانەوەو زۆر لە کتێبە قوتابخانەییەکانی سلوکیەکان کەمتازۆر ڕەنگدانەوەی ئەم بەکارهێنانە تەکنیکییەی زاراوەکەی تێدایە[4]، ئەم کتێبانە بە وەرگرتن و لەخۆ گرتنی ئەم زاراوەیە خۆیان پابەند دەکەن، لانی کەم بە شێوەیەکی زمنی، بە ڤێرژنێك لە ڤێرژنەکانی تیۆرەی هاندەر–وەڵام ی سلوکیەکانی تایبەت بە بەکارهێنانی زمان و وەرگرتنی زمان (أكتساب اللغە). ئێستا بەشێوەیەکی گشتی پێکهاتنێك هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم تیۆرەیە ئەگەر بەتەواوەتیش قابیلی پراکتیزەکردن نەبێت ئەوا قابلیەتی پراکتیزەکردنی زۆر سنوردار(مقيد)ە لە زماناسی و سایکۆلۆژیای زمان هەردوکیاندا.

+ واگریمانە دەکرێت هاڵ مەبەستی لە" هێماکانی" زمان ئەو ئیشارەتە دەنگیی یان گوتراوانە بێت کە بە شێوەیەکی فیعلی لە نێرەرەوە بۆ وەرگر ڕەوانە دەکرێن لە پرۆسەی کۆمەنیکەیشن و کارلێکردندا، بەڵام ئێستا ڕوونە کە هیچ مانایەك نیە لە زاراوەی "عادەت"دا، تەکنیکی بێت یان نا–تەکنیکی، کە تیایدا گوتەکانی زمانێك یان خۆیان عادەت بن یان لە ڕێگەی عادەتەوە دروست بکرێن. ئەگەر لێرەدا "هێما" بەکار بهێنرێت بۆ ئیشارەتکردن بە، نە بەگوتەکای زمان، بەڵکو بەو وشە یان گوزارانەی کە ئەو گوتانەی لێ پێکدێت، هێشتا هەر هەڵەیە وای بۆ بچین کە قسەکەر، وەکو عادەت، وەها وشەیەك بەکار دەهێنێت لە وەها بۆنەیەکدا. یەکێك لە هەرە گرنگترین هەقیقەتەکانی سەبارەت زمان ئەوەیە کە بە شێوەیەکی گشتی، پەیوەندیەك نیە لە نێوان وشەکان و ئەو بارودۆخانەی تیایدا بەکار دەهێنرێن بە جۆرێك کە ڕوودانی وشەیەکی دیاریکراو لە بارودۆخەکان خۆیانەوە پێشبینی پێ بکرێت، هەروەکو ئەو ڕەفتارو سلوکەی بوە بە عادەت پێشبینی پێ دەکرێت. بۆ نمونە ئێمە وەکو عادەت گوتەیەك بەرهەم ناهێنین کە وشەی "باڵندە"ی تێدا بێت هەر کاتێك وا ڕێکەوت خۆمان لە بارودۆخێکدا ببینینەوە کە باڵندەیەکی تێدا ببینین: لە ڕاستیدا ئەگەری

بەکارهێنانمان بۆ وشەی "باڵندە" لە وەها بارودۆخێکدا زیاتر نیە لە ئەگەری بەکارهێنانمان بۆ ئەو وشەیە لە هەر بارودۆخێکی تردا. زمان، هەروەکو دواتر ئەبینین، **هاندەر-ڕەهایە**[5].

-ڕۆبنز (*1979*أ: *9-14*) پێناسەیەکی مەنهەجی بۆ زمان نیە، ئەو بە سوکی ئیشارەت بەوە دەکات کە ئەو پێناسانە "زیاتر موبتەزەلن و زانیاری-بەخش نین، ئەگەر پێشگریمانەی ... جۆرێك لە تیۆرەی گشتی زمان و شیکاری زمانناسی نەکەن"، بەلاّم ئەو ژمارەیەك هەقیقەتی بەرچاو لیست دەکات و دەیخاتە بەر گفتوگۆ کە "پێویستە لە هەر تیۆرەیەکی جیددی زماندا لەبەر چاو بگیرێت". بە درێژایی چاپە یەکبەدوا-یەکەکانی ئەم پەرتوکە قوتابخانەییە ستاندەرەدا، ڕۆبنز ئیشارەت بەوە دەکات کە زمانەکان "سیستمی هێمان"... کە تەقریبەن بە تەواوەتی دەوەستنە سەر عورف پەتی یان هەڕەمەکی، بەلاّم جەختێکی تایبەت لەسەر مرونەت و خۆ گونجێنییان(*adaptability*) دەکات.* پێدەچێت ڕێنەکەوتنێکی لۆژیکی نەبێت لە نێوان ئەو تێڕوانینەی کە زمانەکان سیستمی عادەتن (لە حاڵێکدا عادەت بە مانایەکی دیاریکراو لێك بدرێتەوە) و ئەو تێڕوانینەی لە لایەن ڕۆبنزەوە گوزارشتی لێکراوە. دواجار ئەندێشەی ئەوە دەکرێت کە سیستمی عادەت پێویستە بە مروری زەمەن بگۆڕێت لە وەلاّمی پێویستیە هەردەم گۆڕاوەکانی ئەوانەی ئەو سیستمە بەکار دەهێنن، بەلاّم زاراوەی عادەت ئەو زاراوەیە نیە کە ئێمە عادەتەن ئەیبەستینەوە بە ڕەفتاری خۆ-گونجێن(السلوك القابل للتکیف)ەوە. دواتر پێویستمان بەوە دەبێت کەمێك لە نزیکترەوە سەیری چەمکی قابلیەتی درێژبوونەوەی بێسنور (*infinite extensibility*) بکەین[6]. ئەوکات دەبینین کە پێویستە جیاوازیەك لە نێوان قابلیەتی درێژبونەوەو قابلیەتی گۆڕین(تعدیل)ی سیستمێك و قابلیەتی درێژبونەوەو قابلیەتی گۆڕینی بەرهەمەکانی ئەو سیستمەدا، بکرێت. هەروەها گرنگە دان بەوەدا بنرێت کە بەشبەحاڵی سیستمەکە چەند تایپێك لە درێژکردنەوەو گۆڕین لە ڕوی تیۆرەییەوە سەرنج-ڕاکێشترە لە هی تر. بۆ نمونە ئەو ڕاستیەی کە دەکرێت وشەی تازە بێتە ناو موفرەداتی زمانێکەوە لە هەر کاتێك لە کاتەکاندا، گرنگیەکی تیۆرەیی زۆر کەمتری هەیە لەو ڕاستیەی کە ئەکرێت و هەر واشە، تەرکیبی گراماتیکی نوێ بە تێپەڕبونی کات لەناو زماندا سەرهەڵبدات. یەکێك لە مەسەلە سەنتراڵیەکان لە زمانناسیدا ئەوەیە ئایا هیچ سنورێك هەیە بۆ ئەمجۆرەی دوایی لە قابلیەتی گۆڕین، ئەگەر وایە، ئەو سنورانە کامانەن.

-دوا پێناسە کە لێرەدا کۆتبکرێت تێبینیەکی زۆر جیاوازی لێ دەکەوێتەوە: "لێرە بە دواوە زمان بە سێتێك لە ڕستە (سنوردار بێت یان بێسنور) لە قەڵەم دەدەم"، کە هەریەکەیان سنوردارن لە درێژیداو لە سێتێکی سنوردار لە ئێلیمێنت (عنصر) بینادەکرێن". ئەم پێناسەیە لە کتێبی (***بونیادە سینتاکسیەکان***)ی چۆمسکیەوە وەرگیراوە(*1957: 13*)، کە بڵاوبونەوەی بوە سەرەتای سەرهەڵدانی بزوتنەوەیەك کە بە گرامەری تەحویلی (*Transformational Grammar*) ناسراوە. بە پێچەوانەی پێناسەکانی ترەوە، لەباریدایە زۆر شتی تر، سەرباری زمانە سروشتیەکان باس لێوە بکات، بەڵام، بەپێی چۆمسکی، هەموو زمانە سروشتیەکان، چ لە فۆرمی قسەکردن یان نوسینیاندا، زمانن بەو واتایەی پێناسەکەی ئەو ئەیدات بە دەستەوە: بەحوکمی ئەوەی (أ) هەر زمانێکی سروشتی ژمارەیەکی سنوردار دەنگی هەیە (و ژمارەیەکی سنوردار لە پیتی هەیە لە ئەلفوبێکەیدا- بە گریمانەکردنی ئەوەی کە سیستمێکی نوسینی ئەلفوبایی هەیە): وە (ب) هەرچەندە لەوانەیە بێسنورانە چەندین ڕستەی لێکجیاواز هەبێت لە زماندا، ئەکرێت هەر ڕستەیەك بە زنجیرەیەکی سنوردار لەو دەنگانە(یان پیتانە) بنوێنرێت. ئەرکی زماناسە کە وەسفی زمانێکی سروشتی دیاریکراو دەکات، ئەوە دیاریبکات کام لەو زنجیرە ئێلیمێنتە سنوردارانە لەناو ئەو زمانەدا ڕستەن و کامیان نا-ڕستەن (واتە مەرجی ڕستەبونی تێدا نەبێت-و-). ئەو زماناسە تیۆریستە کە پرسیاری "زمان چییە؟" وەکو پرسیاری "زمانی سروشتی چییە؟" لێك دەداتەوە، ئەرکی ئەوە، ئەگەر توانی، ئەو خەسڵەتە بونیادییانە ئاشکرا بکات کە لێیانەوە زمانە سروشتیەکان لە زمانە ناسروشتیەکان، کە دەکرێت پێچەوانەی ئەوانە ئەم ناوەیان لێ بنرێت، جیاواز دەبن.

+ئەوە باوەڕی چۆمسکیە-- و ئەو بە شێوەیەکی ڕوو-لەزیاد جەختی لەسەر ئەم باوەڕە کردۆتەوە لە نوسینە تازەترەکانیدا- کە نە تەنها لە ڕاستیدا وەها خەسڵەتی بونیادیانە هەیە، بەڵکو هێند ئەبستراکت و هێند ئاڵۆزو تایبەتن بە مەبەستەکانیان کە پێدەچێت فێربونیان هەروا لە هیچەوە مومکین نەبێت لە لایەن ساوایەکەوە کە لە زۆرانبازیدایە لەگەڵ کێشەی وەرگرتنی زمانی دایکی. پێویستە ئەم بونیادانە لە لایەن مناڵەوە زانراوبن، بە واتایەك لە واتاکان، پێش وە سەربەخۆ لە ئەزمونی ئەو مناڵە بۆ هەر زمانێکی سروشتی و بەکاری بهێنێت لە پرۆسەی وەرگرتنی زماندا. چۆمسکی لەبەر هەبوونی ئەم ڕایەیە خۆی وەکو ڕاشناڵیستێك وەسف دەکات، زیاتر لەوەی وەکو ئەزمونگەرێك(*empirecist*). دواتر دەگەڕێینەوە سەر ئەم خاڵە.

پێناسەکەی چۆمسکی بۆ زمان تا ڕادەیەکی زۆر لەبەر ئەو جیاوازیە کۆتکراوە کە لەگەڵ پێناسەکانی تردا دروستی دەکات، چ لە ستایڵ و چ لە ناوەرۆکدا

+لێرەدا پێناسەکەی چۆمسکی بۆ زمان تا ڕادەیەکی زۆر لەبەر ئەو جیاوازیە کۆتکراوە کە لەگەڵ پێناسەکانی تردا دروستی دەکات، چ لە ستایڵ و چ لە ناوەرۆکدا. پێناسەکەی هیچ شتێك دەربارەی وەزیفەی کۆمۆنیکەشنی زمانە سروشتیەکان یان زمانە نا–سروشتیەکان ناڵێت: هیچ شتێك دەربارەی سروشتی هێماگەرایی ئێلیمێنتەکان یان زنجیرەکانی ئەو ئێلیمێنتانە ناڵێت. مەبەستی پێناسەکەی ئەوەیە قورسایی گرنگ بخاتە سەر خەسڵەتە بونیادیە پەتیەکانی زمانەکان و ئاماژە بەوە بدات کە ئەم خەسڵەتانە دەکرێت لە گۆشەنیگایەکی وردی ماتماتیکیانەوە لێیان بکۆڵرێتەوە. ئەوە گەورەترین بەشداری چۆمسکیە لە زمانناسیدا کە جەختێکی تایبەت دەکاتە سەر ئەوەی ئەو بە پاشکۆیەتی–بونیاد(*structure-dependence*) ناوی دەبات[7]، پاشکۆیەتی بونیادی ئەو پرۆسانەی کە لێیانەوە ڕستەکان بینا دەکرێن لە زمانە سروشتیەکانداو کە تیۆرەیەکی گشتی بۆ گرامەر دارشتوە کە وەستاوەتە سەر پێناسەیەکی تایبەتی ئەم خەسڵەتە.

یار+ئەو پێنج پێناسەیەی "زمان" کە لە سەرەوە کۆتکران و بە کورتی باسیان لێوەکرا مەتی ناساندنی ئەو خەسڵەتانەیان دا کە هەندێك لە زمانناسان وەکو سیما بنەڕەتیەکانی زمانەکان وەریان گرتوە؛ زمانەکان بەو پێیەی دەیانزانین. زۆربەیان ئەو تێڕوانینەیان هەیە کە زمانەکان سیستمی هێمان، گەر بتوانین بڵێین، دانراون بۆ مەبەستی کۆمۆنیکەیشن. بەم شێوەیەیە دواتر ئێمە سەیری زمان ئەکەین، لەو بەشەدا کە ناونیشانی "گۆشەنیگای ئاماژەناسیانە"ی هەڵگرتوە: ئاماژەناسی، هەروەکو دەبینین ئەو دیسیپلنە یان ئەو لقەی لێکۆڵینەوەیە کە تەرخانە بۆ ڕەفتار(سلوك)ی هێماگەرایی و کۆمۆنیکەیشنئامێز. ئەو پرسیارەی کە لەو ئاستەدا بۆمان گرنگ دەبێت ئەوە دەبێت ئایا هیچ خەسڵەتێکی سادە یان سێتێك لە خەسڵەت هەیە کە زمانە سروشتیەکان لە سیستمە ***ئاماژەناسیەکانی*** تر جوێ بکاتەوە. هەندێك لەو خەسڵەتانەی کە لێرەدا ناویان هێنراوە: هەڕەمەکێتی و مرونەت و قابلیەتی گۆڕین و ئازادبونە لە کۆنترۆڵی هاندەر(مثیر) و پاشکۆیەتی بونیاد. لە کاتی گونجاوی خۆیدا خەسڵەتی تر بۆ ئەم لیستە زیاد دەکرێت. پەیوەندی نێوان زمان و ئاخاوتن لە *1.4* دا باسی لێوە دەکرێت.

## ڕەفتاری زمانو سیستمەکانی زمان

ئێستا کاتی ئەوە هاتوە چەند جیاوازیەکی پێویست لە واتادا بکرێت لەناو زاراوەی "زمان"دا. ئەمێستا ئیشارەتم کرد بە جیاوازی نێوان زمان بە گشتی (واتە *langage* بە زاراوە فەرەنسیەکەی)و زمانێکی دیاریکراو (واتە*langue*). هەروەها ئاوەڵناوی "*linguistic* زمانی یان زماننناسی" بە هەمان شێوە تەمومژاوییە (تەنانەت کاتێك کە پەیوەندی بە "زمان"ەوە هەبێت زیاتر لە"زماننناسی"). بۆ نمونە گوزارەی "توانستی زمانی *linguistic competence*" کە لە لایەن چۆمسکییەوەو هەروەها کەسانی تریش دوای ئەو بەکار براوە بۆ ئیشارەتکردن بە لێزانیی کەسێك بۆ زمانێکی دیاریکراو، عادەتەن کەمتر بەو مانایەش لێك نادرێتەوە لە زمانی ئینگلیزی ڕۆژانەدا کە ئیشارەت بێت بەو توانا یان لێزانیەی کە کەسێك لەوانەیە هەیبێت بۆ وەرگرتن یان بەکارهێنانی نەوەك زمانێك بەڵکو زمان (بە گشتی). (و هەرکاتێك "زمان" وەکو ئاوەڵناو بەکارهێنرا لە ناوێکی لێکدراودا توشی هەمان جۆر لە تەمومژاوێتی(غموض) دەبێت وەکو "*language-competence*"و "*language-acquisition*"). زۆرجار ئەم تەمومژاوێتیە گرنگیەکی ئەوتۆی نابێت یان سیاقەکە دەیڕەوێنێتەوە. هەر کاتێك جێی گرنگی بوو دوو مانەکەی "زمان" لێك جیا بکرێتەوە، ئەوا بەم کارە هەڵدەستم.

+بەکارهێنانی زمانێکی دیاریکراو نەوەك زمانێکی تر، ڕەفتارکردنە بە شێوەیەکی دیاریکراو نەوەك بە شێوەیەکی تر. دەکرێت چ زمان بە گشتیو چ زمانە دیاریکراوەکان وەکو ڕەفتار یان چالاکی سەیر بکرێن کە لانی کەم بەشێکی دەکرێت وەکو ***ڕەفتاری زمان*** تێبینی بکرێتو بناسرێتەوە، نە تەنها لە لایەن ئەو کەسانەی بەشدارن لە پرۆسەی تێبینی-کردنەکەدا (واتە قسەکەرو بیستەر بەو پێیەی گرنگی-پێدانی خۆمان دەوەستێنینە سەر زمانی قسەکردن)، بەڵکو لە لایەن ئەو تێبینی کەرانەوە کە خۆیان بەشدار نین لە کاتی ڕودانی ئەم ڕەفتارەی کە بە شێوەیەکی دیار کارلیکردنو کۆمۆنیکەیشن-ئامێزە. لەوەش زیاتر، هەرچەندە ئەوە جەوهەری ڕەفتاری زمانە کە پێویستە، بە شێوەیەکی گشتی ئەگەر لە هەر یەکێك لە حاڵەتەکانیشدا نەبێت، کۆمۆنیکەیشن-ئامێز بێت، عادەتەن مومکینە تێبینیکەرانی دەرەکی ڕەفتاری زمان بناسنەوە کە ئەوە ڕەفتاری زمانە، ئەگەرچی ئەو زمانە دیاریکراوە نەزانن کە بەکار دەهێنرێتو نەتوانن ئەو گوتانە لێکبدەنەوە کە بەرهەمی ئەو ڕەفتارەیە کە ئەوان تێبینی دەکەن.

+کەواتە بە پێی پێویست ڕاستو ڕەوایە زمان لە گۆشەنیگایەکی سلوکیەوە (هەرچەند نەك بە زەرورەت لە گۆشەنیگایەکی تایبەت بە زانستی سلوکەوە) سەیر بکرێت، بەڵام دەکرێت زمان بە شێوەیەکی گشتی، هەروەها زمانە دیاریکراوەکانیش، لانی کەم لە دوو گۆشەنیگای تریشەوە سەیر بکرێن. یەکێك لەو دوانە پەیوەندیدارە بەو جیاوازیە زاراوەسازی(*terminological*)یەوە کە چۆمسکی کردوویەتی لە نێوان "توانست"و "ئەداو"دا؛ ئەوی تر، پەیوەندیارە بەو جیاوازییە کەمێك جیایەدا کە فردیناند دی سوسێر بە زمانی فەرەنسی کردوویەتی لە نێوان زمان(*langue*)و ئاخاوتن(*parole*)دا، لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا.

+کاتێك دەربارەی کەسێك دەڵێین بە زمانی ئینگلیزی قسەدەکات، پێدەچێت مەبەستمان یەکێك بێت لەم دوو شتە: یان (أ) ئەو کەسە وەکو عادەت یان جاروبار ئەکەوێتە ئەنجامدانی جۆرێکی دیاریکراو لە ڕەفتارکردن یان (ب) ئەو کەسە لە توانایدایە (جا چ مومارەسەی ئەو توانایە بکات یان نا) بکەوێتە ئەنجامدانی ئەو جۆرە دیاریکراوە لە ڕەفتارکردن. بە ئیشارەتکردن بەوەی یەکەمیان بە (ئەداء)، وە بەوەی دوەمیان بە (توانست)، ئەتوانین بڵێین ئەداء.پێشگریمانەی توانست ئەکات، لە کاتێکدا توانست پێشگریمانەی ئەداء ناکات. یان بە جۆرێکی تر دەری ببڕین، جیاوازی نێوان توانستو ئەداء نیسبیەن جێگەی مشتومڕ نیە. ئەو خاڵەی تری چۆمسکیش هەر وایە کە دەڵێت، هەرچەند بەر فراوانانە زاراوەی "توانستی زمانی" لێك بدەینەوە، پێویستە پێکەوە بنێین کە ڕەفتاری زمانی کەسێکی دیاریکراو لە حاڵەتێکی دیاریکراودا چەند فاکتەرێکی تر دیاری دەکات کە لە سەروو توانستی زمانی ئەو کەسەوەیە. بەشێکی زۆر هەیە لە داڕشتنەوە تیۆرو تەسەلترەکەی چۆمسکیدا سەبارەت چەمکی توانستی زمانی کە ئێجگار جێگەی مشتومڕە، بەڵام پێویست ناکات بۆ هەنوکە ئەمە ببێتە خەمێك بۆ ئێمە. لێرەدا ئەوە بەسە تێبینی ئەوە بکرێت، بە لای چۆمسکییەوە، ئەوەی زمانناسان وەسفی دەکەن لە کاتی وەسفکردنیاندا بۆ زمانێکی دیاریکراو، ئەداء نیە بەو مانایەی کە هەیەتی (واتە ڕەفتار)، بەڵکو توانستی ئەو کەسانەیە کە بەو زمانە قسەدەکەن، تا ئەو ڕادەیەی کە ئەمە شتێکی تەواو زمانیە، کە ئەمەش بناغەی ئەدائیان پێکدەهێنێتو ئەو ئەدائە مومکین دەکات. توانستی زمانی کەسێك مەعریفەی ئەو کەسەیە سەبارەت بە زمانێکی دیاریکراو. بەو پێیەی زمانناسی تایبەتە بە دەستنیشانکردنو پێدانی وەسفێکی تیۆرەیی کە مەبەست بپێکێت، بۆ فاکتەرە

دیاریکەرەکان(العوامل المحددە)ی توانستی زمانیی، ئەوا بە لای چۆمسکییەوە، دەبێت وەکو لقێك لە سایکۆلۆژیای ئیدراکی(*cognitive Psychology*) پۆلێن بکرێت.

+جیاوازیکردن لە نێوان "زمان*langue*"و "ئاخاوتن*parole*"دا، بەو شێوەیەی لە بنەڕەتدا لە لایەن سۆسێرەوە کراوە، ژمارەیەك جیاوازی لە ڕووی لۆژیکیەوە سەربەخۆ لەخۆ دەگرێت (واتە لە ژێر سەرناوی ئەو جیاوازیکردنەدا کاتیگریزەدەبن -و-). گرنگترینی ئەو جیاوازیکردنانە، جیاوازیکردنە لە نێوان ئەوەی شیمانە (محتمل)یەو ئەوەی فیعلیە لە لایەك و جیاوازیکردنە لە نێوان ئەوەی کۆمەڵایەتیەو ئەوەی فەردیە لە لایەکی ترەوە. ئەوەی سۆسێر بە "زمانی ئاخاوتن*langue*" ناوی دەبات مەبەستی هەر زمانێکی دیاریکراوە کە موڵکێکی گشتی هەموو ئەندامەکانی جڤادێکی زمانی (*language Community*) دیاریکراوە (واتە هی هەموو ئەو کەسانەی بەوە ناسراون کە بە هەمان زمان قسە دەکەن). زاراوەی (*langue*)ی فەرەنسی کە هەروەکو بینیمان، تەنها یەکێکە لەو وشە ئاساییانەی کە واتای "زمان" دەگەیەنن، عادەتەن بە وەرنەگێڕراوی دەهێڵرێتەوە لە زمانی ئینگلیزیدا کاتێك لە ڕووی تەکنیکیەوە (واتە تایبەت بەو بوارە -و-) بە واتا سۆسێرییەکەی بەکار دەبرێت. لە جێی ئەو زاراوەیە زاراوەی "سیستمی زمان" دەناسێنین، لە بەرامبەریشیدا زاراوەی "ڕەفتاری زمان" دادەنێین، لانی کەم وەکو سەرەتا، بەو شێوەیەی سۆسێر وشەی "*langue*"ی لە بەرامبەر "*parole*"دا داناوە. ***سیستمی زمان*** دیاردەیەك یاخود دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتیە کە لە خۆیدا تەواو ئەبستراکتە، ئەبستراکتە لەوەدا کە بوونێکی ماددی نیە، بەڵام لە حاڵەتی دیاریکراودا دەکرێتە واقیعێکی فیعلی لە ***ڕەفتاری زمانی*** تاکەکەسە ئەندامەکانی جڤادێکی زمانیدا. تا ڕادەیەك، دەکرێت ئەوەی چۆمسکی بە توانستی زمانی ناوی دەبات، بێ سێ و دوو تەماهی بکات لەگەڵ نە سیستمی زمان، بەڵکو لەگەڵ مەعریفەی قسەکەری نمونەیی بۆ سیستمی زمان، بەڵام سۆسێر جەختێکی تایبەت دەکات لەسەر کاراکتەری کۆمەڵایەتی و دامەزراوەیی سیستمی زمان. لێرەشەوە، سۆسێر پێی وایە زمانناسی نزیکترە لە سۆسیۆلۆژیاو سایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتیەوە زیاتر لە نزیکیەتی لە سایکۆلۆژیای ئیدراکیەوە. زۆر لە زمانناسانی تر هەمان تێڕوانینیان هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا زمانناسانی تر هەن، لەسەر ئەو ڕایەن کە دەکرێت سیستمی زمان، کە پێویستیشە وابێت، سەربەخۆ لە پەیوەندیە سایکۆلۆژیی و سۆسیۆلۆژیە ئاڵۆزەکانیەوە، دیراسە بکرێت. لە نەسکی دوەمدا دەگەڕێینەوە سەر ئەم خاڵە. با بۆ هەنوکە بە شێوەیەکی سادە تێبینی بەوە بدەین کاتێك دەڵێین زمانناس گرنگی بە

یەکێك لە هەرە سەرەکیترین پرەنسیپەکانی زمانناسی مۆدێرن ئەوەیە کە زمانی قسەکردن بنەڕەتیترە لە زمانی نوسین

**زمان دەدات، بە زمنی مەبەستمان ئەوەیە کە بە شێوەیەکی سەرەکی گرنگی بە بونیادی سیستمی زمان ئەدات.**

## زمانو ئاخاوتن (اللغەو الكلام)

**+ یەکێك لە هەرە سەرەکیترین پرەنسیپەکانی زمانناسی مۆدێرن ئەوەیە کە زمانی قسەکردن بنەڕەتیترە لە زمانی نوسین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێت زمان لەگەڵ ئاخاوتندا تەماهی بکات. پێویستە جیاوازیەك بکرێت لە نێوان ئیشارەتەکانی زمانو ئەو *ناوەندەی* کە تیایدا ئیشارەتەکان بەدی دەهێنرێن. بەمشێوەیە، شتێکی مومکینە ئەوەی نوسراوە بە دەنگی بەرز بخوێنرێتەوە، بە پێچەوانەشەوە، ئەوەی دەوترێت بنوسرێتەوە. قسەکەری خوێندەوار بە زمانی دایك (واتە قسەکردنەکەی بە زمانی دایك نەوەك خوێندەواریەکەی-و-) لە یەکێك لە زمانەکاندا، بە شێوەیەکی گشتی، ئەتوانێت بزانێت ئایا ئەو پرۆسەی گواستنەوەیەی ئیشارەتەکانی زمان لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر بە شێوەیەکی ڕاستو دروست ئەنجام دراوە یان نا. تا ئەو ڕادەیەی زمان سەربەخۆیە، بەم مانایە، لەو ناوەندەی کە ئیشارەتەکانی زمانی تێدا بەدی دەهێنرێت، ئەوا دەڵێین زمان خەسڵەتی قابلیەتی گواستنەوەی هەیە بە ناوەندا(*medium-transferability*). ئەمەش یەکێکە لە گرنگترین خەسڵەتەکان خەسڵەتێك کە گرنگیەکی ئێجگار کەمی پێ دراوە لەو گفتوگۆ گشتیانەدا کە لەسەر سروشتی زمان ئەنجام دراون. ئەم خەسڵەتە، هەروەکو دواتر دەیبینین، دەوەستێتە سەر خەسڵەتی تر کە لە گەڵیشیاندا بەشداری دەکات لە مرونەتو خۆگونجێنیی سیستمی زماندا.**

**+ کەواتە بە چ مانایەك زمانی قسەکردن بنەڕەتیترە لە زمانی نوسین؟ بۆچی زۆر لە زمانناسان بە لای ئەوەدا دەیشکێنن بیکەنە سیمایەکی پێناسەکەری (یان دیاریکەری-و-) زمانە سروشتیەکان، کە پێویستە ئەو زمانانە سیستمی ئیشارەتە دەنگییەکان بن.؟**

**+پێش هەموو شتێك، زمانناسان بە ئەرکی خۆیانی دەزانن کە لایەنگیری (تحیز)ی گرامەری تەقلیدیو وتنەوەی تەقلیدی زمان ڕاست بکەنەوە. هەتا ئەم دواییانە، تەقریبەن هەموو گرامەرناسان گرنگیان بە زمانی ئەدەب دەداو حسابێکی کەمیان بۆ ئاخاوتنی قسەکردنی عامی ڕۆژانە دەکرد. هەروەها هەموویان زۆرجار مامەڵەیان**

لەگەڵ نۆرمەکانی بەکارهێنانی ئەدەبیدا وەکو نۆرمی ڕاستو دروست بوونی زمان خۆی دەکردو بەکارهێنانی عامیان ڕیسوا دەکرد، ئەوەندەی ئەو بەکارهێنانە جیاوازە لە بەکارهێنانی ئەدەبی، لەوەدا کە گرامەری نیەو پیسو تەنانەت نالۆژیکیشە. لە ماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا، پێشڕەوەییەکی گەورە کرا لە بواری لێکۆڵینەوە لە پەرەسەندنی مێژوویی زمانەکان. لێکۆڵیاران بە شێوەیەکی ڕوونتر لەوەو پێش درکیان بەوە کرد کە دەکرێت گۆڕان لە زمانی دەقە نوسراوەکانی ماوە زەمەنیە جیاوازەکاندا– بۆ نمونە گۆڕانی لەو جۆرەی کە بە تێپەڕبونی سەدەکان زمانی لاتینیان کردە فەرەنسی یان ئیتالی یان ئیسپانی– لە ڕووی ئەو گۆڕانانەوە لێك بدرێنەوە کە لە زمانی قسەکردنە تەریبەکەدا ڕوویانداوە (واتە زمانی قسەکردنی بەرامبەر بە زمانی نوسینی دەقەکان و–). بەردەوامیو عمومیەتی گۆڕانی زمان تا ڕادەیەکی ئێجگار زۆر لە دەقە نوسراوەکانی ڕابردودا نا–ڕوونو شاراوەیە، ئەو دەقە نوسراوانەی کە لە ڕێگەی کۆنزێرڤاتیزم (محافزەکار لەسەر تەقلیدی کۆن و–)ی ترادیسیۆنە نوسراوەکاندا لە زۆر لە کلتورەکاندا بۆمان ماوەتەوەو گەشتوە بە دەستمان، وە لە ڕێگەی بەکارهێنانی بەردەوامەوە بە درێژایی ماوە زەمەنیە درێژەکان لە بەڵگەنامە یاساییو ئاینیەکانو لە ئەدەبێکدا کە بە شێوەیەکی ڕوولەزیادبوو ستایلێکی نوسینی موبتەزەلی لەخۆ گرتوە. هەموو زمانە ئەدەبیە مەزنەکانی جیهان، لە ئاکامدا، لە زمانی قسەکردنی جڤادی دیاریکراوەوە داتاشراون یان سەرچاوەیان گرتوە. لەوەش زیاتر، مەسەلەی ڕێکەوتی مێژوییە کە بەکارهێنانێکی ناوچە یان یەك چینی کۆمەڵایەتیی بوبێتە بناغەی سەرهەڵدانی زمانێکی ئەدەبی ستاندەر لە جڤادە دیاریکراوەکاندا. لە ئەنجامی ئەوەدا دایەلێکتەکانی ناوچەکانی ترو چینە کۆمەڵایەتیەکانی تر دەبێت ئێستا وەکو جۆری نزمترو غەیرە–ستاندەری زمان سەیر بکرێن، هەروەکو زۆرجار بەم شێوەیە سەیر دەکرێن. ئەمەش هێزی حوکمی ناهەقی(أجحاف) تەقلیدیە لە بەرژەوەندی زمانی ستاندەر لە شێوە نوسینەکەیدا، کە شتێکی زۆر زەحمەتە بۆ زمانناسان خەڵکی ئاسایی بێئاگا لە زمان قایل بکەن بەو ڕاستیەی کە دیالێکتە ناستاندەرەکان، بە شێوەیەکی گشتی، لە ڕێکوپێکیو سیستیماتیکیدا لە زمانە ئەدەبیە ستاندەرەکان کەمتر نینو نۆرمی تایبەت بە خۆیان هەیە بۆ ڕاستو دروستی کە ئەمەش لە بەکارهێنانی قسەپێکەرە ئەسڵیەکانیدا بە شێوەیەکی بەرچاو بەدەر دەکەوێت. یەکێك لە یەکەمینو قورسترین ئەرکەکانی قوتابی زمانناسی ئەوەیە ئەو توانایە بەدەست بهێنێت کە زمانی قسەکردن بەپێی تێرمەکانی خۆی (واتە تێرمەکانی ئەو زمانە–و–)

لەبەرچاو بگرێت، یان با بڵێین، بەبێ بیرکردنەوە لەوەی کە شێوازی گۆکردن (*pronunciation*)ی وشەیەك یان گوزارەیەك دەبێت یان پێویستە ڕێنوسەکەی ئەو شێوازی گۆکردنە دیاری بکات.

+حەزکردن بە گێڕانەوەی هاوسەنگی لە بەرژەوەندی لێکۆڵینەوەیەکی هەقخوازی ئاخاوتن‌و زمانی قسەکردن، بێگومان پاساوی هەڵگرتنی ئەو پرەنسیپە نادات کە زمانی قسەکردن بنەڕەتیترە-و هەروەها ئەوەش نا کە کەمتر بنەڕەتی نیە- لە زمانی نوسین. (واتە حەزکردن بە گێڕانەوەی هاوسەنگی لە بەرژەوەندی ئاخاوتن پاساوی بنەڕەتیبون یان بنەڕەتی نەبونی نادات -و-). ئەی باشە "بنەڕەتی" چ مانایەك دەگەیەنێت؟ ***پرایۆریتی مێژوویی*** ئاخاوتن بەسەر زماندا گومانێکی کەمی لەسەرە. هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆیی ناسراو نیەو نەبوە لە هیچ کاتێکدا لە ڕابردودا بەبێ هەبوونی توانای ئاخاوتن. هەرچەندە زمانەکان، بەو پێیەی کە لەمڕۆدا پێیان دەزانین، لە زۆربەی بەشەکانی جیهاندا، دەکرێت یان زمانی نوسین بن یان زمانی قسەکردن، زۆرینەی هەرە زۆری کۆمەڵگەکان هەتا ئەم دواییانە یان تەواو یان تا ڕادەیەکی ئێجگار زۆر نەخوێندەوار بوون. سەربارى ئەوەی پرایۆریتی مێژوویی گرنگیەکی زۆر کەمتری هەیە لەو جۆرانەی تری پرایۆریتی کە وشەی "بنەڕەتی" بە شێوەیەکی زمنی دەیگەیەنێت لەم سیاقەدا: وەکو پرایۆریتی بونیادی‌و وەزیفی‌و بایۆلۆژی کە ئەمەیان جێگەی قسە لەسەر کردنە.

+دەکرێت پرایۆریتی بونیادیی زمانی قسەکردن بەم شێوەیە لێك بدرێتەوە. ئەگەر بۆ هەنوکە هەر جیاوازیەکی ستایل پشتگوێ بخەین کە لەوانەیە لە نێوان زمانی نوسین‌و زمانی قسەکردنی تەریبدا هەبێت‌و گریمانەی ئەوە بکەین کە دەکرێت هەر ڕستەیەکی وتراوی شیاو (مقبول) بگۆڕرێت بۆ ڕستەیەکی نوسراوی شیاو، بە پێچەوانەشەوە، ئەوە هیچ هۆیەکمان بە دەستەوە نامێنێت بیر لەوە بکەینەوە کە یەکێکیان لەوی دیکەوە داتاشرابێت یان سەرچاوەی گرتبێت، بێجگە لەو حاڵەتەی کە مەسەلەکە مەسەلەی هەقیقەتی مێژوویی بێت. بونیادی ڕستەی نوسراو پشت بە جیاوازی دیارو بەرچاو لە شکڵدا دەبەستێت؛ بونیادی ڕستەی وتراویش پشت بە جیاوازی دیارو بەرچاوی لە دەنگدا دەبەستێت. لە حاڵەتە تیۆرەیی ئایدیاڵدا کە تیایدا تەریببونێکیەك-بۆ-یەك لە نێوان ڕستەی وتراوو نوسراوی زمانێکدا هەبێت، هەر ڕستەیەکی نوسراو هاوشێوە(*isomorphic*) دەبێت (واتە هەمان بونیادی ناوەکی

دەبێت) لەگەڵ ڕستە وتراوە تەریبەکەیدا. بۆ نمونە، ئەگەر لە ڕستە نوسراوەکاندا سیستمێکی نوسینی ئەلفوبایی بەکار هێنرابێت، ئەوا پیتی دیاریکراو تەریب دەبن لەگەڵ دەنگی دیاریکراوداو کۆبونەوەی دیاریکراو لە پیت بە شێوەیەکیەك بۆ-یەك تەریب دەبن بە کۆبونەوەی دیاریکراو لە دەنگ، وەکو وشەو گوزارە. هەموو کۆبونەوەیەکی پیتەکان کۆبونەوەیەکی شیاو(مقبول) نیە؛ وە هەموو کۆبونەوەیەکی دەنگەکانیش کۆبونەوەیەکی شیاو(مقبول) نیە، بەلاّم لەم ڕووەوە جیاوازیەکی گرنگ هەیە لە نێوان پیتەکان‌و دەنگەکاندا. ئەو ئیمکانیەتەی ئەو دەنگانە هەیانە کە لە زمانێکی دیاریکراودا بەکار دەهێنرێن بۆ کۆبونەوە لەگەڵ یەکتردا، بەشێکی دەوەستێتە سەر خەسڵەتەکانی ناوەندەکە خۆی (چەند کۆبونەوەیەکی دیاریکراو لە دەنگەکان یان گۆ ناکرێن یاخود گۆ-کردنیان قورسە)و بەشێکی دەوەستێتە سەر ئەو کۆت‌وبەندە وردترانەی کە تایبەتە تەنها بەو زمانە. ئەو ئیمکانیەتەی ئەو پیتانە هەیانە بۆ کۆبونەوە لەگەڵ یەکتردا، تەواو پێشبینی پێنەکراوە لە ڕووی شکڵیانەوە[8] .

لەگەڵ ئەوەشدا پێشبینی پێکراوە، تا ڕادەیەکی کەم تا زۆر، لە هەموو ئەو زمانەنادا کە سیستمێکی نوسینی ئەلفوبایی بەکاردەهێنن لە ڕووی پەیوەستبوونی شکڵی دیاریکراو لەگەڵ دەنگی دیاریکراوداو لە ڕووی ئەو ئیمکانیەتەی کە دەنگەکان هەیانە بۆ کۆبونەوە لەگەڵ یەکتردا لە ئاخاوتندا. کەواتە، لەسەر ئەم ئاستە، زمانی قسەکردن بنەڕەتیترە لە ڕووی بونیادیەوە لە زمانی نوسین، هەرچەند لەوانەیە هەردووکیان ئایزۆمۆرفیك بن (هاوشێوەبن و-)، لانی کەم لە حاڵەتی تیۆرەیی ئایدیالّدا، لەسەر ئاستیەکەی گەورەتری وەکو وشەو گوزارە. پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت کە ئەم خاڵە لەم ڕووەوە ڕاست دەرناچێت سەبارەت بەو زمانانەی ئەو سیستمی نوسینە بەکار دەهێنن کە تیایدا پەیوەست بوون نیە لە نێوان شکڵی دیاریکراوو دەنگی دیاریکراودا بەم شێوەیە، بەڵکو لەگەڵ وشەدا ئەو پەیوەستبوونە هەیە. بۆ نمونە، سەبارەت بە زمانی چینی کلاسیکی ڕاست دەرناچێت کە بە پیتی تەقلیدی دەنوسرێت، یان سەبارەت بە میسری کۆن کە بە پیتی هیرۆگلیفی ئەنوسرێت. لەبەر ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گشتی پرایۆریتی بونیادی زمانی قسەکردن بەسەر زمانی نوسیندا لە گۆڕێدا نیە، ئەوەندەی پەیوەندی بە زمانی چینیەوە هەبێت، کە تا ڕادەیەکی زۆر بە هەمان شێوە ئەکرێت زمانی نوسین تەریب بە دایلێکتە تەواو جیاوازو لێکتر نەگەیشتوەکان دابنرێت[9].

+ ***پرایۆریتی وەزیفی*** ڕوونکردنــەوەو تێگەیشــتنی ئاســانترە. تــەنانەت ئــەمڕۆ لــە خوێندەوارترین کۆمەڵگە پیشەسازیو بیرۆکراتیە مۆدێرنەکاندا، زمانی قسەکردن بۆ مەودایەکی فراوانتری مەبەستەکان بەکار دەهێنرێت، لە زمانی نوسینو نوسین ڕۆڵی بەدیلێکی وەزیفی دەبینێت بۆ ئاخاوتن تەنها لەو هەلومەرجانەدا کە کۆمۆنیکەیشنی دەنگی-بیستراو دەکاتە شتێکی مەحاڵو پشت پێنەبەستراوو ناکاریگەر. داهێنانی تەلەفونو تەسجیل، بەکارهێنانی زمانی قسەکردنی کردوەتە شتێکی مومکین لەو باروزروفانەدا کە زمانی نوسینی تێدا بەکار دەبرا لە ڕابردوودا. ئەوە بە مەبەستی ئەنجامدانی کۆمۆنیکەیشنی پشت پێبەستراو بوو لە دوورەوەو پاراستنی بەڵگەنامەی یاساییو ئایینیو بازرگانی بوو کە نوسین لە بنەڕەتدا داهێنرا. ئەو ڕاستیەی کە دەقە نوسراوەکان بە درێژایی مێژوو بۆ وەها مەبەستی گرنگ بەکار هێنراون، وە کە پشتیان زیاتر پێدەبەسترێتو بۆ ماوەیەکی زیاتر دەمێننەوە لە گوتە وتراوەکان (یان بەم شێوەیە بوون هەتا ئەوکاتەی میتۆدە مۆدێرنەکانی تۆمارکردنی دەنگ سەریان هەڵدا) ئەم ڕاستیە بەشداری کردوە لە فۆرماڵیتی (ڕەسمیەت -و-)و هەیبەتی زمانی نوسین لە زۆر لە کلتورەکاندا.

+ ئێستا دێینە سەر پرسی ***پرایۆریتی بایۆلۆژی*** کە ئەمەیان زیاتر جێگەی مشتومڕە. زۆر شت هەیە ئاماژە بەوە بکات کە مرۆڤ لە ڕووی جینیەوە پێشوەخت بەرنامە-ڕێژ کراوە، نە تەنها بۆ وەرگرتنی زمان، بەڵکو وەکو بەشێك لە هەمان پرۆسە، بۆ بەرهەمهێنانو ناسینەوەی دەنگەکانی ئاخاوتنیش. زۆرجار ئاماژە بەوە کراوە کە ئەوەی زماننـاس عادەتەن وەکو ئۆرگانەکانی ئاخاوتن (یان ئۆرگانە دەنگیەکان) ئیشارەتی پێ دەکات وەکو سیەکانو ژێیە دەنگیەکانو دانەکانو زمانو هتد، هەموویان وەزیفەیەکی بایۆلۆژی بنەڕەتیتر دەبینن لە وەزیفەی بەرهەمهێنانی ئیشارەتە دەنگیەکان. (مەبەست لەو وەزیفە بنەڕەتیترانە ئاشکرا دیارە چین وەکو هەناسەدانو نانخوارن ....هتد. ئەمەش ئیحایەکە بەوەی کە خۆیان لە بنەڕەتدا بۆ وەزیفەی بەرهەمهێنانی زمان دروست نەبون وئەمەش ئەو وەزیفەیە ئەکاتە وەزیفەیەکی لاوەکی ئەو ئۆرگانانە -و- )حاڵەتەکە بێ سێو دوو بەم شێوەیەیە: سیەکان لە هەناسەداندا بەکار دەهێنرێن، دانەکان لە جوینی خواردنداو بەم شێوەیەیە. سەرەڕای ئەوەش، هەموو ساوایەك کاتێك تەمەنی دەگاتە چەند مانگێکی کەم دەست دەکات بە گڕوگاڵ (ئەگەر توشی بێتواناییەکی عەقڵی یان جەستەیی

زۆر شت هەیە ئاماژە بەوە بکات کە مرۆڤ لە ڕووی جینیەوە پێشوەخت بەرنامە-ڕێژ کراوە، نە تەنها بۆ وەرگرتنی زمان، بەڵکو وەکو بەشێك لە هەمان پرۆسە، بۆ بەرهەمهێنانو ناسینەوەی دەنگەکانی ئاخاوتنیش

نەهاتبێت کە ڕێگەی لێبگرێت): گڕوگاڵ، کە بەرهەمهێنانی مەودایەکی زۆر فراوانتر لەو دەنگانە ئەگرێتەوە کە لەوانەیە لە ئاخاوتنی ئەو کەسانەدا هەبێت کە منداڵەکە ئەکەوێتە پەیوەندی لەگەڵیاندا، ناتوانرێت بە شێوەیەکی قایلکەرانە بە لاساییکردنەوەی توتی-ئاسای منداڵەکە بۆ ئەو دەنگانەی لە دەوروپشتیدا دەیبیستێت، لێك بدرێتەوە. لەوەش زیاتر، ئێستا بە تاقیکردنەوە ئەوە بە بەڵگەوە نیشاندراوە کە منداڵ دەتوانێت لە یەکەم هەفتەکانی ژیانیەوە دەنگەکانی ئاخاوتن لە دەنگی تر جیابکاتەوە کە ئامادەییەکی لەوەو پێشیان تێدایە بۆ، گەر بتوانین بڵێین، گرنگیدان بەو دەنگانە. نزیکترین گیانەوەرە پەیوەندیدارەکان بە مرۆڤەوە لەناو شیردەرە باڵاکاندا، هەرچەندە تا ڕادەیەکی زۆر هەمان دەزگای فزیۆلۆجیان هەیە، ئەو ئامادەییە لەوەوپێشەیان نیە بۆ بەرهەمهێنان و جیاکردنەوەی ئەو دەنگانەی سیفەتی جیاکەرەوەی ئاخاوتنی مرۆڤن. پێدەچێت ئەمە هۆی سەرەکی بێت بۆ شکستهێنانی ئەو هەوڵانەی دراوە بۆ فێرکردنی شەمپانزی بۆ زمانی قسەکردن، هەرچەندە ڕادەیەکی زۆر لە سەرکەوتن بەدەستهێنراوە بۆ فێرکردنیان بۆ زمان یان سیستمە زمانئاساکان، کە ئیشارەتەکانی بەدەست بەرهەم دەهێنرێن و لە ڕێگەی بینینەوە لێکدەدرێنەوە. (ئێستا ئەوە زانراوە کە شەمپانزی بەپێی عادەتی سروشتی خۆیان لەناو خۆیاندا لە ڕێگەی ئیمائەوە کۆمۆنیکەیشن ئەکەن هەروەها لە ڕێگەی ئیشارەتی دەنگیەوە. ئیشارەتە ئیمائەییەکانیان وا دەردەکەوێت زۆر زیاتر لەو دەنگانەی دەری دەکەن قابیلی جیاکردنەوە بن). دواجاریش ئەو ڕاستییە هەیە کە دوو نیوەگۆیەکەی مێشکی مرۆڤ، لەڕووی وەزیفییەوە، دوای منداڵیی هاوشێوە نین(لێك ناچن-و-) کە یەکێکیان باڵادەستە لە ڕووی ئەدائی کاری دیاری کراوەوە. لە زۆربەی خەڵکدا نیوەگۆی لای چەپە کە باڵادەستەو نیوە گۆی لای چەپ بەشی زۆری پرۆسەکردن (معالجە)ی ئیشارەتەکانی زمان ئەنجام دەدات و باشترە لە نیوەگۆی لای ڕاست لە پرۆسەکردنی دەنگەکانی ئاخاوتندا، هەرچەندە لە پرۆسەکردنی جۆرەکانی تری دەنگدا بەم شێوەیە نیە.

+بەڵگەی لەمجۆرە، هەرچەند یەکلاییکەرەوە نیە، زۆر شت دەوروژێنێت. بەپێی گریمانەیەك کە وا دیارە گریمانەیەکی شیاو بێت، زمانی مرۆڤ، لە قۆناغێکی پەرەسەندنی جۆرەکاندا، لە سیستمێکی ئیمائەیی کۆمۆنیکەیشنەوە، زیاتر لەوەی لە سیستمێکی دەنگیەوە، سەری هەڵداوە. زۆر بەڵگە هەیە بۆ ئەوەی کە بۆچی پێدەچێت ئەمە ڕووی دابێت. ئەم گریمانەیە ڕاست بێت یان نا، ئەو بەڵگەیەی لە پەرەگرافەکەی

پێشوەوە سەرەنجام کراوە ئاماژە بەو دەرەنجامە دەکات کە مرۆڤ لە باری ئێستای پێشکەوتنی پەرەسەندنیدا، دەنگ، بە شێوەیەکی دیاریکراوتر مەودای ئەو دەنگە بیستراوەی کە ئۆرگانە دەنگیەکانی مرۆڤ ئەتوانێت بەرهەمی بهێنێت، ئەو ناوەندە سروشتیو لە ڕووی بایۆلۆژیەوە بنەڕەتیەیە کە زمانی تێدا بەدی دەهێنرێت. ئەگەر ئەمە وا بێت، ئەوا زماننناسان پاساویان هەیە نە تەنها لە بەکارهێنانیاندا بۆ زاراوەی "ئۆرگانەکانی ئاخاوتن" بەڵکو بۆ ئیقراریان بەوەی پەیوەندیەك هەیە لە نێوان زمانەکانو ئاخاوتندا کە پەیوەندیەکی عەرەزی نیە.

+لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕاسنیە دەمێنێتەوە کە جیاوازیەك هەیە لە نێوان پرایۆریتی بایۆلۆژیو پرایۆریتی لۆژیکیدا. هەروەکو ئەمێستا جەختی لێ کرایەوە، زمان تا ڕادەیەکی ئێجگار زۆر خەسڵەتی قابلیەتی گواستنەوی هەیە بە ناوەندا(*medium-transferability*). لە ڕەوتی ئاسایی ڕووداوەکاندا، منداڵ بە شێوەیەکی سروشتی (واتە بە فەزڵی ئەو بەهرە بایۆلۆژیەی پێیان بەخشراوەو بەبێ ڕاهێنانی تایبەتی) توانای زمانی قسەکردن بەدەست دەهێنن، لە کاتێکدا خوێندنەوەو نوسین چەند شارەزاییەکی تایبەتیە کە منداڵ تیایدا ڕێنمایی تایبەتی پێ دەدرێت لەسەر بناغەی ئەو زانینە لەوەوپێشەی هەیانە دەربارەی زمانێکی قسەکردن. لەگەڵ ئەوەشدا، نە تەنها منداڵان، بەڵکو گەورەش ئەتوانێت فێری نوسینو خوێندنەوە ببێت بەبێ قورسیەکی لەڕادەبەدەر؛ زۆر مومکینیشە، هەرچەند نائاساییە، کە زمانێکی نوسین فێر ببیت بەبێ ئەوەی توانایەکی لەوەوبەرت هەبێت بۆ قسەکردن بە زمانی قسەکردنە پەیوەندیدارەکەی. هەروەها ئەوەش مومکینە کە بتوانیت سیستمی ئیمائەی کۆمۆنیکەیشن فێر ببیت کە پشت نە بە زمانێکی نوسین نە بە زمانێکی قسەکردن دەبەستێت، هەر وەکو هەندێك لەو سیستمانەی لە لایەن کەڕولاڵەکانەوە بەکاردەهێنرێت. ئەگەر هاتو کۆمەڵگەیەکمان بینیەوە کە سیستمێکی نوسراو یان ئیمائەیی کۆمۆنیکەیشن بەکار بهێنێت کە هەموو خەسڵەتە جیاکەرەوەکانی زمانی هەبێت، بەڵام هەرگیز لە ناوەندی قسەکردندا بەدی نەهاتبێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە وەکو زمان ئیشارەت بەم سیستمی کۆمۆنیکەیشنە ئەکەین. کەواتە نابێت تەئکیدێکی زۆر زۆر بخرێتە سەر پرایۆریتی بایۆلۆژی ئاخاوتن.

+لەوەش زیاتر، کاتێك مەسەلە دێتە سەر کێشەی وەسفکردنی زمانی دیاریکراو، هۆیەکی باش هەیە وا لە زماننناس بکات کە کەمتازۆر، نەوەك بە شێوەیەکی ڕەها،

وەکو ئایزۆمۆرف مامەڵە لەگەڵ زمانی نوسین و قسەکردنی تەریب بەیەکدا بکات (واتە کەمتازۆر ئایزۆمۆرف بێت نەوەك بە شێوەیەکی ڕەها ئایزۆمۆرف بێت-و-). هەروەکو پێشتر وتم، تەنها لە حاڵەتی ئایدیاڵی تیۆرەییدایە کە ئایزۆمۆرفیەکی تەواو لە گۆڕێدایە. هێشتا سیستمێکی نوسین دانەهێنراوە (بێجگە لەو سیستمانەی نوسبەندکردن (*transcription*)کە لە لایەن فینیقیەکانەوە بۆ ئا ئەم مەبەستە دانراون) کە هەموو جیاوازیە گرنگەکانی ئاخاوتنی تێدا بنوێنرێت. لێرەشەوە دەگەینە ئەوەی کە بە شێوەیەکی گشتی چەند ڕێگەیەکی ناهاوتا هەیە بۆ گۆکردنی هەمان ڕستەی نوسراو، کە لە دانپیانان (نبرە)و ئینتۆنەیشن (تنغیم) و هتد دا لێك جیاوازن. نیشانەکانی خاڵبەندی‌و بەکار هێنانی پیتی خوار (ئیتالیك)و گەورە(کەپیتەڵ) تا ڕادەیەکی زۆر هەمان مەبەست ئەدەن بەدەستەوە لە زمانی نوسیندا وەکو ئەو مەبەستەی دانپیانان‌و ئینتۆنەیشن لە زمانی قسەکردندا دەیدەن بە دەستەوە، بەڵام ئەوەی پێشوویان هەرگیز ناتوانێت بەپێی پێویست تەمسیلی ئەمەی دواییان بکات (واتە خاڵبەندی ناتوانێت تەمسیلی نبرەو ئینتۆنەیشن‌و هتد بکات -و-). ڕاستیەك هەیە دەبێت هەقی خۆی بدرێتێ لە ڕووی پێلێنان‌و دانپیانانیەوە ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە جیاوازی وەزیفی‌و بونیادی هەردوکیان لە نێوان زمانە تەریبەکانی قسەکردن‌و نوسیندا هەیە. مەودای ئەو جیاوازییەش بەحوکمی هۆیە مێژوویی‌و کلتوریەکانەوە، لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، دەگۆڕێت. بۆ نمونە لە زمانی عەرەبی‌و تامیل دا جیاوازی لە گرامەرو موفرەداتدا جیاوازیەکی ئێجگار زۆرە. لە زمانی ئینگلیزیدا، ئەم جیاوازیە کەمتر جێگەی سەرنجە. بەڵام تەنانەت لە زمانی ئینگلیزیشدا، چەند وشەو گوزارەو پێکهاتەی گرامەریی(ترکیب نحوی) هەیە کە هەست ئەکرێت زۆر عامی بێت بۆ زمانی نوسین(بۆ نمونە،

(*load of old cobblers*)[10]

یان بە پێچەوانەوە زۆر ئەدەبی بن بۆ زمانی قسەکردن (بۆ نمونە

.(*any arrangements made heretofore notwithstanding*[11]

+زاراوەکانی "عامی"و "ئەدەبی" مەسەلەی گرنگیان لێوە ئاشکرا دەبێت. لە ڕووی پرەنسیپەوە، جیاکردنەوەیەکی ڕوون هەیە کە دەبێت بکرێت لە نێوان "عامی"و "قسەکردن" لە لایەك‌و لە نێوان "ئەدەبی"و "نوسین" لە لایەکی ترەوە. زەحمەتە ئەو جیاکردنەوەیە بە عەمەلی پارێزگاری پێوەبکرێت. سەبارەت بە هەندێك زمان جیاکردنەوەی جیاوازیەکان لە ناوەندا ("قسەکردن" لەبەرامبەر "نوسین")و

زمانە سروشتیەکان کۆدن، وە دەکرێت بە هەموو جۆرە ڕێگەیەك بە کۆدی تر بەراورد بکرێن

جیاوازیەکان لە ستایلدا ("عامی" لە بەرامبەر "ئەدەبی") مانایەکی ئەوتۆی نیە. هەروەها جیاکردنەوەی جیاوازیەکان لە ناوەنداو جیاوازیەکان لە دیالێکتدا ("ستاندەر" لەبەرامبەر "غەیرە ستاندەر"، هتد) ئەویش مانایەکی ئەوتۆی نیە. دانانی تیۆرەیی (*theoretical postulate*) هەبونی ئایزۆمۆرفیزم لە نێوان زمانی نوسین و قسەکردندا بەشێکی بنەڕەتیە لەوەی لای خوارەوە وەکو وەهمی هاوچەشنێتی (وهم التجانس) ئیشارەتی پێکراوە.

## گۆشەنیگای ئاماژەناسی

+ ئاماژەناسی بە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆر وەکو؛ زانستی ئاماژەکان (نیشانەکان)، زانستی سلوکی هێماگەرایی یان زانستی سیستەمەکانی کۆمۆنیکەیشن پێناسەکراوە. گفتوگۆی زۆر ڕوویداوە، لە چوارچێوەی ئاماژەناسیدا، لەسەر جیاوازی نێوان ئاماژەو هێماو ئیشارەت، هەروەها لەسەر مەودای زاراوەی "کۆمۆنیکەیشن". بۆ مەبەستەکانی ئێستا، وەها بیر لە ئاماژەناسی دەکەینەوە کە پەیوەندی هەبێت بە سیستەمەکانی کۆمۆنیکەیشنەوە، وە "کۆمۆنیکەیشن"، بەپێی پێویست بەرفراوانانە، وا لێکدەدەینەوە کە مەرج نیە بە زمنی دەلالەت لە نیەتی ئاگادارکردن یان گەیاندن (أعلام، أبلاغ) بکات. تەنها کاتێك زاراوەکە بەمشێوەیە لێکدرایەوە ئەتوانین قسە لەسەر کۆمۆنیکەیشنی گیانەوەران بکەین بەبێ ئەوەی هەر لەخۆمانەوە راستی هەندێك پرسیاری فەلسەفی پڕ مشتومڕ گریمانە بکەین.

+ چەند تێگەیەکی دیاریکراو هەن پەیوەندیدارن بە لێکۆڵینەوەی هەموو سیستەمەکانی کۆمۆنیکەیشنەوە، مرۆیی بن یان نامرۆیی، سروشتی بن یان دەستکرد. ***ئیشارەت*** لە ***نێرەرەوە*** ڕەوانەی ***وەرگر***(یان گروپێك لە وەرگران) دەکرێت لە ڕێگەی ***کەناڵێکی*** کۆمۆنیکەیشنەوە. ئیشارەتەکە فۆرمێکی دیاریکراوی دەبێت و مانایەك (یان پەیامێك)ی دیاریکراو دەگوازێتەوە(یان هەڵدەگرێت -و-). پەیوەستی نێوان فۆرمی ئیشارەت و ماناکەی لە ڕێگەی ئەوشتەوە دادەمەزرێت (لە مانایەکی تاڕادەیەك گشتی زاراوەکەدا)کە بە شێوەیەکی باو لە ئاماژەناسیدا بە ***کۆد*** ئاماژەی بۆ دەکرێت: پەیامەکە لە لایەن نێرەرەوە کۆد دەکرێت و لە لایەن وەرگریشەوە کۆدەکە دەکرێتەوە.

+ بە سەیرکردنیان لەم گۆشەنیگایەوە، زمانە سروشتیەکان کۆدن، وە دەکرێت بە هەموو جۆرە ڕێگەیەك بە کۆدی تر بەراورد بکرێن: لە ڕووی ئەو کەناڵەی کە

ئیشارەتەکانی لێوە ڕەوانە دەکرێت؛ لە ڕووی فۆرم یان بونیادی ئیشارەتەکانەوە؛ لە ڕووی جۆرو مەودای ئەو پەیامانەی کە دەکرێت کۆد بکرێن؛ وە بەم شێوەیە. کێشەکە لە بڕیارداندایە لەسەر ئەوەی چ خەسڵەتێکی کۆدەکان یان سیستەمەکانی کۆمۆنیکەیشن کە لە ڕێگەیەوە ئەو کۆدانەو ئەو سیستمانەی کۆمۆنیکەیشن ئیشدەکەن، گرنگە بۆ مەبەستی بەراوردکردن و چ خەسڵەتێك گرنگ نیە یان گرنگیەکی کەمتری هەیە. ئەوەی کێشەکە قەیراناوی دەکات ئەو ڕاستیەیە کە زۆر لەو خەسڵەتانەی پێدەچێت وەکو پێودانگ (مقیاس) هەڵیبژێرین، قابیلی پلەبەند کردنن (واتە تا ڕادە یان پلەیەکی دیاریکراو حوزوریان هەیە -و-)، کەواتە ئەوە گرنگترە کۆدەکان لە ڕووی ڕادەی هەبوونی خەسڵەتێکی دیاریکراو تیایاندا بەراوورد بکرێن، زیاترلەوەی تەنها لە ڕووی هەبوون یان نەبونی ئەو خەسڵەتەوە. هەندێك بەراوردی تا ڕادەیەك نابەجێ لە نێوان زمان و ئەو سیستمانەی کۆمۆنیکەیشن کە لە لایەن چەند جۆرێکی دیاریکراو لە باڵندەو گیانەوەرەوە بەکاردەهێنرێن، ئەنجامدراوە لەسەر بناغەی هەڵبژاردنی چەند خەسڵەتێکی دیاریکراوو وەدەرنانی چەندێکی ترو شکستهێنان لە بایەخدان بە پلەبەندێتی خەسڵەتەکان.

+ئەوەندەی پەیوەندی بە کەناڵی کۆمۆنیکەیشنەوە هەبێت، شتێکی کەم هەیە پێویست بکات بوترێت بێجگە لەوەی زمان تا ڕادەیەکی زۆر خەسڵەتی گواستننەوەی هەیە بە ناوەندا، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو کۆدانەی کە لە لایەن زۆری گیانەوەرانەوە، ئەگەر هەمووشیان نەبێت، بەکار دەهێنرێن. ئەم خاڵە لە بەشەکەی پێشودا ئاماژەی پێ درا. چەمکەکانی ناوەندو کەناڵ بە دڵنیاییەوە لە جەوهەردا پێکەوەپەیوەستن، لەوەدا کە خەسڵەتەکانی ناوەند لە خەسڵەتەکانی کەناڵی ئاسایی ڕەوانەکردنەوە داتاشراون و سەرچاوەیان گرتوە، بەڵام ئەوەش گرنگە دو چەمکەکە ئەوەندەی پەیوەندی بە زمانەوە هەبێت لێك جیا بکرێنەوە. هەردوو زمانی نوسین و قسەکردن دەکرێت لە ڕێگەی چەند کەناڵێکی جۆراوجۆرەوە ڕەوانە بکرێن. کاتێك زاراوەی "ناوەند" بەکار دەهێنین زیاتر لە زاراوەی "کەناڵ"، مەبەستمان ڕەوانەکردنی فیعلی ئیشارەتەکان نیە لە چەند بۆنەیەکی تایبەتیدا، بەڵکو مەبەستمان جیاوازیی وەزیفی و بونیادی سیستماتیکییە لە نێوان ئەو شتەی وەکو سیفەتێکی جیاکەرەوەی خۆی نوسراوە (نوسینە--و--) و ئەوەی وەکو سیفەتێکی جیاکەرەوەی خۆی وتراوە (قسەکردنە--و-). هەرچەندە لە یەکەم سەیرکردنەوە وەکو موفارەقە دەردەکەوێت، دەکرێت ئینگلیزی نوسراو لە ڕێگەی کەناڵی دەنگی-بیستراوەوە ڕەوانە بکرێت (واتە

لە ڕێگەی ئاخاوتنەوە)و دەكرێت ئینگلیزی قسەكردن لە ڕێگەی نوسینەوە ڕەوانە بكرێت (هەرچەند بە شێوەیەكی زۆر ڕەزا-بەخشیش نەبێت لە سیستمی نوسینی ئۆرتۆگرافی ئاساییدا)[12].

+پێدەچێت سەرنجڕاكێشترین سیفەتی جیاكەرەوەی زمان بە بەراوردكردن لەگەڵ كۆدەكان یان سیستمەكانی تری كۆمۆنیكەیشندا، مرونەتەكەیی و سیفەتی فرە-بەكارهێنانی(*versatility*)یەكەی بێت. ئەتوانین زمان بەكار بهێنین وەكو مەنفەزێك بۆ هەست و سۆزمان، بۆ داواكردنی هاوكاری لە برادەرانمان، بۆ هەڕەشەكردن و بەڵێندان، بۆ دەركردنی فەرمان و پرسیار كردن و بەیانكردن. ئەتوانین ئیشارەت بۆ ڕابردوو ئێستا و داهاتوو بكەین، بۆ وەها شتێك كە تەواو لە بارودۆخی قسەكردنكەوە دوورە- - تەنانەت بۆ وەها شتێك كە پێویست نیە بونی هەبێت و مومكین نیە هەشبێت. پێناچێت هیچ سیستمێكی تری كۆمۆنیكەیشن هەبێت، مرۆیی بێت یان نامرۆیی، كە هەمان ڕادە لە مرونەت و فرەبەكارهێنانی هەبێت. لە ناو ئەو خەسڵەتە وردترانەدا كە بەشداری دەكەن لە مرونەت و فرە-بەكارهێنانی زمان (واتە مرونەت و فرە بەكارهێنانی هەر سیستمێكی زمان ) چوار خەسڵەت هەن كە چەندبارە هەڵبژێردراون بۆ باسكردن، ئەوانیش: هەڕەمەكێتی و دولانەیی و لێكپساویی و بەرهەم-دارێتین.

زاراوەی "هەڕەمەكی" لێرەدا بە مانایەكی تا ڕادەیەك تایبەت بەكار هێنراوە، كە مانای شتێك بگەیەنێت لەم بابەتە: "شتێك قابیلی لێكدانەوە نەبێت بەپێی پرەنسیپێكی تری گشتیتر". دیارترین حاڵەتی ***هەڕەمەكێتی*** لە زماندا- و كە ئەمەش حاڵەتێكە لە هەموو حاڵەتێك زیاتر دوبارەو چەندبارە باسی لێوە دەكرێت- تایبەتە بە پەیوەندی نێوان فۆرم و ماناوەو نێوان ئیشارەت و پەیامەكەی. چەند حاڵەتێكی تاك و تەرا (لێرەو لەوێ -و-) لە هەموو زمانەكاندا كە وەكو تەقلید بە ئۆنۆماتۆپیا (داڕشتنی وشە بەپێی شێوەی گۆكردنەكەی، واتە بەكارهێنانی بە جۆرێك كە شێوەی گۆكردنەكەی ئاماژە بە واتاكەی بدات -و-) ئاماژەی بۆ دەكرێت: وەك ئەو پەیوەندیە ناهەڕەمەكیەی كە لە نێوان فۆرم و مانای وەها وشەی ئۆنۆماتۆپیدا هەیە وەكو "*cuckoo*"، "*peewit*"، "*crash*"، لە زمانی ئینگلیزیدا[13]. بەڵام زۆرینەی هەرە زۆری وشەكان لە هەموو زمانەكاندا نائۆنۆماتۆپۆیین: واتە پەیوەندی نێوان فۆرم و مانایان هەڕەمەكیە لەوەدا كە بە هەبوونی فۆرمەكە مەحاڵە پێشبینی بە ماناكەی بكرێت و بە هەبوونی ماناكەی مەحاڵە پێشبینی بە فۆرمەكەی بكرێت.

+ئاشکرایە هەڕەمەکێتی بەم مانایە مرونەت و فرەبەکارهێنانی سیستمی کۆمۆنیکەیشن زیاد دەکات لەوەدا کە پێویستی تەبابونی نێوان فۆرم و مانا کۆت وبەند ناخاتە سەر درێژبونەوەو فراوانبونی موفرەدات لە ڕوی پرەنسیپێکی گشتیترەوە. لەلایەکی ترەوە ئەو ڕاستییەی کە پەیوەندی نێوان فۆرم و مانا لەسەر ئاستیەکەکانی موفرەدات لە سیستمەکانی زماندا پەیوەندیەکی، بە شێوەیەکی گشتی، هەڕەمەکیە، ئەو کاریگەریەی هەیە کە بارێکی ئێجگار قورس دەکەوێتە سەر یادەوەری (ژاکرە) لە پرۆسەی وەرگرتنی زماندا. کەواتە دەبێت بەستنەوەی هەر فۆرمێکی دیاریکراو لەگەڵ مانایەکی دیاریکراودا، بۆ هەر موفرەدەیەك بە شێوەیەکی سەربەخۆ فێر ببین. ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی ئاماژەناسیانەوە سەیری بکەین، ئەوا هەڕەمەکێتی لەم جۆرە، لایەنی باش و لایەنی خراپیشی هەیە: مرونەت و خۆ گونجێنی سیستمەکە زیاتر ئەکات، بەڵام هەروەها فێربوونی قورسترو بە ئەرکتر دەکات. خاڵێکی تریش هەیە ئەوەیە کە هەڕەمەکێتی لە سیستمێکی ئاماژەناسیدا لێکدانەوەی ئیشارەتەکان قورستر ئەکات بۆ هەرکەسێك بێتە ڕێی و سیستمەکە نەزانێت. هەروەها ئەمەش لایەنی باش و لایەنی خراپی هەیە بۆ بەکارهێنەرانی ئاسایی سیستمەکە. وا گریمانە دەکرێت کە دەبێت لایەنە باشەکان لە بایەخ و بەهادا لە لایەنە خراپەکان باشتر بوبن لە پەرەسەندنی زماندا. لە زۆربەی سیستمەکانی کۆمۆنیکەیشنی گیانەوەراندا پەیوەندیەکی ناهەڕەمەکی هەیە لە نێوان فۆرمی ئیشارەت و ماناکەیدا.

+بەشبەحاڵی زمان، هەڕەمەکێتی ناوەستێتە سەر پەیوەندی نێوان فۆرم و مانا. بەڵکو ئەو هەڕەمەکێتیە تا ڕادەیەکی زۆر بە نیسبەت زۆری بونیادە گرامەرییەکانی زمانە دیاریکراوەکانەوە هەیە، ئەوەندەی زمانەکان لە ڕووی گرامەریەوە یەك لەوی دی جیاوازە. ئەگەر واش نەبوایە ئەوا فێربونی زمانە بیانیەکان زۆر لەوە ئاسانتر ئەبوو کە هەیە.

+لەوەش پڕ مشتومڕتر تێزەکەی چۆمسکیە کە بەشێکی زۆر لەو شتانەی باو و گشتین لە بونیادی گرامەری هەموو زمانە مرۆییەکاندا، لەوانە ئیشکردنی جۆرێکی تەواو دیاریکراو لە پاشکۆیەتی–بونیاد، ئەویش هەڕەمەکیە بەو واتایەی ناتوانرێت لە ڕووی وەزیفەکانی زمانەوە، لە ڕووی ئەو هەلومەرجە ژینگەییەی کە زمانی تێدا وەردەگیرێت و بەکار دەهێنرێت، لە ڕووی سروشتی پرۆسە ئیدراکیەکانی مرۆڤەوە بە شێوەیەکی گشتی، لە ڕووی هەر فاکتەرێکی تری لەوجۆرەوە، لێك بدرێتەوەو پێشبینی پێ بکرێت. ئەوە بۆچوونی چۆمسکیە کە مرۆڤەکان بە شێوەیەکی

جێنێتیکی (بۆماوەیی-و-) وەکو بەهرە زانینی چەند پرەنسیپێکی گشتی گوایە هەرەمەکیان پێ بەخشراوە کە بونیادی گرامەری هەموو زمانەکان دیاری دەکەن. هەموو ئەوەی پێویستە لەسەر ئەم گریمانەیە بوترێت لێرەدا ئەوەیە کە هەموو زمانناسەکان لەسەر ئەوە کۆك نین کە وەها پرەنسیپ گەلێکی گشتی کە بتوانرێت بونیان جەختی لێ بکرێت، هەرەمەکین بەو مانایەی کە مەبەستەو کە زۆری ئەو لێکۆڵینەوانەی ئێستا ئەنجام دەدرێن لە بواری زمانناسی تیۆرەییدا تەرخانکراوە بۆ هەوڵی نیشاندانی ئەوەی کە هەرەمەکی نین. لە نەسکی هەشتەمدا دەگەڕێینەوە سەر ئەم خاڵە.

مەبەست لە دوولانەیی (*duality*) خەسڵەتی هەبونی دوو ئاستی بونیادە، بەجۆرێك ***یەکەکانی*** ئاستی سەرەکی لە ***ئێلیمێنتەکانی*** ئاستی لاوەکی پێکدێن، وە هەریەك لە دوو ئاستەکە پرەنسیپی ئۆرگانیزەبونی تایبەت بە خۆی هەیە. تێبینی ئەوە دەکرێت لێرەدا جیاکردنەوەیەکی زاراوەسازیم هێناوەتە کایەوە لەنێوان "ئێلیمێنت"و "یەکە". ئەمە جیاکردنەوەیەکی ستاندەری زاراوەسازی زمانناسی نیە. لەگەڵ ئەوەشدا بەرژەوەندیەکی ڕوونکردنەوە ئامێزی تێدایەو بە درێژایی ئەم کتێبە بەوشێوەیە دەهێڵرێتەوە.

+بۆ ئێستا دەتوانین دەنگەکان (*sounds*) وەکو ئێلیمێنتەکانی زمانی قسەکردن سەیر بکەین (یان وردتر بڵێین ئەوەی لە نەسکی سێیەمدا وەکو فۆنیم دەستنیشان ئەکرێت). دەنگەکان بۆ خۆیان هەڵگری مانا نین. تەنها وەزیفەیان ئەوەیە پێکەوە کۆببنەوە بۆ دروستکردنیەکە، کە بە شێوەیەکی گشتی، مانایەکی دیاریکراویان هەیە. لەبەرئەوەی ئێلیمێنتە پچوکترو ئاست نزمەکان بێواتان، لە کاتێکدا یەکە گەورەترو ئاست بەرزەکان بە شێوەیەکی گشتی، ئەگەر بە شێوەیەکی جێگیرو نەگۆڕیش نەبێت، واتایەکی ڕونو دەستنیشان-کراویان هەیە، لەبەرئەوەیە کە ئێلیمێنتەکان بە لاوەکیو یەکەکان بە سەرەکی وەسفکراون. هەموو سیستەمەکانی کۆمۆنیکەیشن وەها یەکەگەلێکی سەرەکیان هەیە: بەڵام ئەم یەکانە بە زەرورەت لە ئێلیمێنت پێك نەهاتوون. سیستم تەنها کاتێك خەسڵەتی دوولانەیی دەبێت کە یەکەو ئێلیمێنت هەردوکیانی تێدابێت. وا دیارە زۆربەی سیستەمەکانی کۆمۆنیکەیشنی گیانەوەران ئەم خەسڵەتەیان نیە، وە ئەو سیستمانەشی کە هەیانە بە شێوەیەکن کە یەکەکان تیایاندا

لەگەڵ یەکدی بەو جۆرە کۆ نەبونەتەوە کە وشەکان لەگەڵ یەکدی پێی کۆدەبنەوە بۆ پیکهێنانی گوزارەو ڕستە لە هەموو زمانە مرۆییەکاندا.

+کەڵکی دوولانەیی ئاشکرایە چیە: ئەتوانرێت ژمارەیەکی زۆر لە یەکەی جیاواز لە ژمارەیەکی پچوك لە ئێلیمێنت دروست بکرێت بۆ نمونە دروستکردنی چەندین هەزار وشە لە سی چل دەنگ. ئەگەر بتوانرێت ئەم یەکە سەرەکیانە بە شێوەیەکی سیستماتیکی، بە ڕێگەی جیاواز پێکەوە ببەسترێن، ئەوا ژمارەی ئەو ئیشارەتە جیاوازانەی (لێکجیایانەی-و-) کە ئەتوانرێت ڕەوانە بکرێن-و لە ئاکامدا ژمارەی پەیامە جیاوازەکانیش- بەشێوەیەکی ئێجگار زۆر زیاد دەکات. هەروەکو تاوێکی تر دەبینین هیچ سنورێك بۆ ژمارەی ئەو ئیشارەتە جیاوازانەی زمان نیە کە ئەتوانرێت لە زمانە دیاریکراوەکاندا دروستبکرێن.

لێکپساویی(*discreteness*) پێچەوانەی لێکنەپساوی یان هەمەجۆربونی بەردەوامە. لە حاڵەتی زماندا، لێکپساویی خەسڵەتێکی ئێلیمێنتە لاوەکییەکانە. بۆ ڕونکردنەوەی ئەمە: هەردوو وشەی "*bit*"و "*bet*" لە فۆرمدا جیاوازن، چ لە ڕووی زمانی نوسینەوە چ لە ڕووی زمانی قسەکردنەوە. تەواو مومکینە دەنگێکی بزوێن بەرهەم بهێنرێت کە بکەوێتە نێوان ئەو دوو بزوێنەی کە عادەتەن لە شێوازی گۆکردنی ئەو دوو وشەیەدا هەیە. (واتە دەنگێك کە گۆکردنی لە نێوان ئەو دوو بزوێنەدا بێت کە لەو دوو وشەیەدا هەیە-و-)، بەڵام ئەگەر ئێمە ئەم دەنگە مامناوەندە لە باتی بزوێنی ناو وشەی "*bit*" یان "*bet*" دابنێین لە هەمان سیاقدا، ئەوا بەو کارەمان وشەیەکی سێیەممان گۆنەکردوە کە جیاواز بێت لە هەردوو وشەکە یان سیفاتە جیاکەرەوەکانی هەردووکیانی تێدابێت. بەڵکو شتێکمان گۆکردوە کە بە هیچ جۆرێك وەکو وشە ناناسرێت، یان لە باتی ئەوە، شتێکمان گۆکردوە کە وەکو شێوازێکی خراپ گۆکراوییەکێك لە وشەکان دەستنیشان دەکرێت. شوناس (*identity*) لە زماندا، بە شێوەیەکی گشتی، مەسەلەی هەموو یان هیچ شتێکە، مەسەلەی زیاترو کەمتر نیە.

+هەرچەندە لێکپساویی بە شێوەیەکی لۆژیکی پشت بە هەرەمەکێتی نابەستێت، بەڵام کارلێکی لەگەڵ دەکات بۆ زیادکردنی مرونەت و کارایەتی سیستمی زمان. بۆ نمونە لە ڕووی پرەنسیپەوە مومکینە بۆ دوو وشە کە بە ئاستەم جیاوازیان لە نێوانیاندا هەبێت لە فۆرمدا، بەڵام لێکپساوبن، زۆر لەیەك بچن لە ڕووی ماناوە. بە شێوەیەکی گشتی قسەبکەین لەسەری، ئەمە ڕوونادات: لێکچوونی هەردوو وشەی "*bit*" و"*bet*" لە ڕووی ماناوە لە هەر جووتە وشەیەکی تری ئینگلیزی کە کۆێرانە

هەڵبژێررابن زیاتر نیە. ڕاستی ئەوەی ئەو وشانەی کە بە ئاستەم لێکجیاوازن لە فۆرمدا، عادەتەن زۆر لێکجیاواز دەبن لە مانادا، زیاتر لەوەی بە ئاستەم لێکجیاوازبن، ئەم ڕاستیە ئەو کاریگەریەی دەبێت کە لێکپساویی جیاوازی زاراوەیی یان عورفی(*formal*) نێوانیان سەقامگیر دەکات. لە زۆربەی سیاقەکاندا ڕودانی یەکێکیان ئەگەری زۆر زیاتر دەبێت لە ڕودانی ئەوی تریان، ئەمە ئەگەری بەدحاڵیبونی کەم دەکاتەوە لە هەلومەرجە خراپەکانی ناردن‌و ڕەوانەکردنی ئیشارەتدا (مەبەستی نوسەر لە ڕودان، وتن‌و بەکارهێنانە-و-). لە سیستمەکانی کۆمۆنیکەیشنی گیانەوەراندا لێکنەپساویی (واتە گۆڕان یان جیاوازبونی بەردەوام) زیاتر دەبەسترێتەوە بە ناهەڕەمەکێتیەوە.

بەرهەمدارێتی(*productivity*) سیستمی کۆمۆنیکەیشن ئەو خەسڵەتەیە کە بیناکردن‌و ڕاڤەکردنی ئیشارەتی نویٚ مومکین دەکات: واتە بیناکردن‌و ڕاڤەکردنی ئەو ئیشارەتانەی کە پێشتر نەهاتونەتە ڕیٚ وە لە هیچ لیستێکی ئیشارەتی پێشتر داتاشراوەوە- ئەو لیستە چەند گەورەش بێت- نابینرێنەوە، کە بەکارهێنەر دەستی پێی ڕادەگات. زۆربەی سیستمەکانی کۆمۆنیکەیشنی گیانەوەران تا ڕادەیەکی زۆر سنوردارن لە ڕووی ژمارەی ئەو ئیشارەتە جیاوازانەی کە بەکارهێنەرەکانیان ئەینێرن‌و وەریان دەگرن. لە لایەکی ترەوە، هەموو سیستمەکانی زمان، بەکارهێنەرانی بەتوانا دەکات کە بێسنور گوتەی زۆر بینابکەن‌و تێبگەن کە هەرگیز لەوەوپیش نە بیستبێتیان‌و نە خوێندبێتیانەوە.

+گرنگیی بەرهەمدارێتی لە ئەدەبی زماننناسی ئەم دواییەدا پێی لیٚ داگیراوە، بە تایبەتی لە لایەن چۆمسکیەوە، لەگەڵ ئیشارەتکردنێکی تایبەت بە کێشەی حسابکردن بۆ وەرگرتنی زمان لە لایەن منداڵەوە. ئەو ڕاستیەی کە منالاٚن لە تەمەنێکی تەواو کەمدا ئەتوانن وەها گوتەگەلێك بەرهەم بهێنن کە هەرگیز لەوەوبەر نەیانبیستوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ ناتوانێت تەنها لە ڕێگەی لاسایی-کردنەوەو لەبەرکردنەوە زمان فێر ببێت.

+لەمیانەی گفتوگۆکردن لەسەر بەرهەمدارێتیی پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکرێت توانای بیناکردنی گوتەگەلی تازە نیە کە گرنگیەکی یەکلایی-کەرەوەی هەیە لە هەڵسەنگاندنی زماندا. بۆ نمونە، گەر بڵێین ئەو سیستمی کۆمۆنیکەیشنەی لە لایەن مێشهەنگەوە بەکار دەهێنرێت بۆ دەستنیشان کردنی سەرچاوەی شیلە خەسڵەتی

بەرهەمداریێتی هەیە، ئەوا ئەم قسەیە تەواو چەواشەکەرە ئەگەر مەبەست لێی ئەوەبێت سیستمەکە لەم ڕووەوە لە زمانەکانی مرۆڤ دەچێت. هەنگ بێسنور بڕێکی زۆر ئیشارەتی جیاواز بەرهەم دەهێنێت(کە بەپێی لەرەلەری لەشی و ئەو گۆشەیەی کە لەگەڵ خۆردا دروستی دەکات دەگۆڕێت)، بەڵام جیاواز بوونێکی(جۆراو جۆریەکی-و) بەردەوام هەیە لە ئیشارەتەکانداو پەیوەندیەکی ناهەڕەمەکی هەیە لە نێوان ئیشارەتەکەو پەیامەکەداو سیستمەکە ناتوانرێت لە لایەن هەنگەکەوە بەکار بهێنرێت بۆ گواستنەوەی زانیاری دەربارەی هەرشتێك جگە لە دووریو ئاڕاستەی سەرچاوەی شیلەکە.

+ئەوەی جێگەی سەرنجە سەبارەت بەرهەمداریێتی زمانە سروشتیەکان ، ئەوەندەی لە بونیادی گرامەریاندا بە ئاشکرا بەدەر دەکەوێت، ئاڵۆزییو هەمەچەشنێتی لەڕادەبەدەری ئەو پرەنسیپانەیە کە ئەو بەرهەمداریێتیە مسۆگەر دەکەنو دای دەمەزرێنن، بەڵام هەروەکو چۆمسکی لەهەر کەسێکی تر زیاتر پێی لەسەر داگرتوە، ئەم ئاڵۆزیو هەمەچەشنێتیە بێ کۆتوبەند نیە: بەڵکو ڕێسا ڕکێفی دەکات. لە چوارچێوەی ئەو سنورانەی ڕێساکانی گرامەر دەستنیشانی کردون، کە پێدەچێت بەشێکی یونیڤێرسالی بنو بەشێکیشی تایبەت بن بە چەند زمانێکی دیاریکراو، قسەکەرانی ئەسڵی بە زمانێك سەربەستن ئیبداعیانە هەڵسوکەوت بکەن کە چۆمسکی دەڵێت شێوازێکی جیاکەرەوەو دیاری مرۆڤانەیە- بۆ دروستکردنی بێشومار گوتەگەلی زۆر. ئەم چەمکە: چەمکی ئیبداعی بەڕێسا ڕکێفکراو، لە نزیکەوە پەیوەستە بە چەمکی بەرهەمداریێتیەوەو گرنگیەکی مەزنی هەبوە لە سەرهەڵدانی زایەندگەرایی(*generativism*)دا[14].

+ئەو چوار خەسڵەتە گشتیەی کە لە سەرەوە لیست کرانو بە کورتی گفتوگۆیان لەسەر کرا هەڕەمەکێتی، دوولانەیی، لێکپساویو بەرهەمداریێتی- هەموویان بە چەند ڕێگەیەکی جیاواز پێکەوە پەیوەستن. نە تەنها، ئەوەندەی پێ بزانین، ئامادەییان لە هەموو زمانەکاندا هەیە، بەڵکو تا ڕادەیەکی ئێجگار زۆر ئامادەییان هەیە، بەڵام مەسەلەی ئەوەی ئایا لە سیستمی تری کۆمۆنیکەیشنی جگە لە زماندا هەن، مەسەلەیەکە جێگەی گومانە، بەڵام ئەگەر هەبن، وا دیار نیە کە بە هەمان ڕادە ئامادەییان هەبێت، یان بە هەمان ڕێگە پێکەوە پەیوەست بن.

+هەروەها شایانی ئاماژە بۆکردنە کە ئەو چوار خەسڵەتە، کە بە تەواوەتی چ لە کەناڵو چ لە ناوەند سەربەخۆن، کەمتر سیفەتی جیاکەرەوەی بەشی نازارەکی

(نالەفزی*non-verbal*) ئیشارەتەکانی زمانن. گوتەکان تەنها زنجیرەی یەکبەدوایەکی وشەکان نین. دوو جۆری تر لە دیاردەی دەنگی کەمتازۆر دیارو بەرچاو، بەسەر زنجیرەی وشەکانەوەن (واتە بەشی زارەکی) لە هەر گوتەیەکی قسەکردندا: دیاردەی تایبەت بە زانستی عەروزو دیاردەی پارا-زمانی. سیما عەروزیەکان شتەکانی وەکو دان-پیانانو ئینتۆنەیشن(النبرەو التنغیم) دەگرێتەوە: پارا-زمانیش ئەو دیاردانەی وەکو خێرایی(*tempo*)و بەرزونزمی دەنگ...و هتد، دەگرێتەوە. هەروەها چەند دیاردەیەکی نادەنگی جۆراوجۆر پەیوەندیدار دەبن بە گوتەی قسەکردنەوە (وەکو جوڵەی چاوو سەر ڕاوەشاندنو گوزاشتی دەموچاوو ئیمائەو باری وەستانی لەشو هتد) کە زیاتر بونیادو مانای گوتەکە دیاری دەکەنو دەشتوانرێت بە پارازمانیی وەسف بکرێن. تەنها دیاردە عەروزیەکانن کە عادەتەن زمانەوان بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، لەگەڵ سیما دەنگیەکاندا، کە زمان وەکو سیستمی زمان دیاریانی کردبێت. لەگەڵ ئەوەشدا دیاردەی عەروزیو پارازمانی هەردوکیان، بەشێکی تەواوکەری(کامڵکەری-و-) هەموو سلوکی زمانین لە ناوەندی وتراو (قسەکردن)دا. ئەوەندەی کە چوار خەسڵەتەکەی هەڕەمەکێتیو دوولانەییو لێکپساوەییو بەرهەمداریێتیان تێدا نیە - یان لانی کەم بە هەمان ڕادە ئاشکرا پێیاندا دەرناکەوێت وەکو ئەوەی بەشە زارەکیەکەی زمان تیایدا دەردەکەوێت --- سیما عەروزییو پارازمانیەکانی سلوکی زمانی زیاتر لە نزیکەوە هاوشێوەی سیماکانی جۆرە جیاوازەکانی کۆمۆنیکەیشنی گیانەوەرانن.

+ کەواتە، زمان خەسڵەتێکی بێوێنەو بێهاوتای مرۆڤە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، وەکو وەڵامدانەوەی پرسیاری "ئایا مرۆڤ بێوێنەو بێهاوتایە لە نێو گیانەوەراندا؟"، تاڕادەیەکی زۆر دەوەستێتە سەر ئەوەی بڕیار دەدەین تەرکیز بکەینە سەر کام خەسڵەتانەو بیانکەینە پێوەر بۆ پێناسەکردنی زمان. بە هەمان ڕادە ڕاستو ڕەوایە، یان پێ لەسەر جیاوازییە جێسەرنجەکان دابگرین، مەبەستم جیاوازی لە ڕادەو جۆریشدا، لە نێوان زمانو نازماندا، یان لەسەر لێکچونەکان کە لە جیاوازیەکان کەمتر جێی سەرنج نین. پێدەچێت زماننناسو دەروونناسو فەیلەسوف حەز بکەن جەخت لەوەی پێشوویان بکەن: لەوانەیە زانای بواری ڕەفتاری ئاژەڵانو گیانەوەرناسو ئاماژەناس پێ لەسەر ئەمەی دواییان دابگرن.

## وەهمی هاوچەشنێتی

+ هەتا ئێستا ئیش لەسەر ئەو شتە دەکەین کە من بە وەهمی هاوچەشنێتی ئیشارەتی بۆ دەکەم: ئەویش ئەو بڕوا یان گریمانەیەیە کە هەموو ئەندامەکانی هەمان جڤادی زمانی کتومت هەمان زمان قسەدەکەن. بێگومان مومکینە پێناسەی زاراوەی "جڤادی زمانی" بە جۆرێك بکرێت کە مەسەلەی ئەوەی نابێت جیاوازی سیستماتیکی لە گۆکردن و گرامەرو موفرەداتدا هەبێت لە ئاخاوتنی ئەندامەکانی ئەو جڤادەدا، بکرێتە مەسەلەی پێناسە کردن (واتە ئەگەر مەسەلەکە هەر پێناسەکردن بێت ئەکرێت بڵێین نابێت ئەو جیاوازیانە هەبێت -و-). بەڵام ئەگەر زاراوەکە بە جۆرێك لێك بدرێتەوە کە ئیشارەت بە هەر گروپێك لە خەڵك بکات گوایە عادەتەن هەمان زمان قسەدەکەن، بۆ نمونە ئینگلیزی، فەرەنسی، ڕوسی، ئەوا مەسەلەکە دەبێتە مەسەلەی دۆزینەوەی ئێمپریکی (الاکتشاف التجریبی) ئایا هەموو ئەندامەکانی ئەو جڤادە زمانیە دیاری کراوە لە هەموو ڕویەکەوە وەکو یەك قسەدەکەن یان نا.

+لە هەموو جڤادە زمانیەکاندا لە سەرتاسەری جیهاندا، بێجگە لە پچوکترینی ئەو جڤادانە، کەمتازۆر جیاوازی ئاشکرا هەیە لە ***شێوەزارو دیالێکت***دا. لە هەردوو زاراوەی "شێوەزار" و "دیالێکت" ئەوەی پێشوویان سنوردارترە لەوەی دواییان: شێوەزار تەنها ئاماژە بەو شێوازە دەکات کە زمانی پێ گۆ دەکرێت و هەڵگری هیچ تێگەیەکی زمنی نیە سەبارەت بە گرامەرو موفرەدات. بۆ نمونە، شتێکی مومکینەو بە هیچ شێوەیەك نائاسایی نیە کە بیانیەك یەکسەر بە شێوە زارەکەیدا بناسرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە جۆرێك قسە بەو زمانە بکات، ئەوەندەی پەیوەندی بە گرامەرو موفرەداتەوە هەبێت، لە قسەپێکەرانی ئەسڵی ئەو زمانە جیانەکرێتەوە. هەروەها دەکرێت دوو قسەپێکەری ئەسڵی، هەمان دیالێکت بە دوو شێوەزاری بە شێوەیەکی بەرچاو لێك جیاواز قسە بکەن، کە دوو شێوە زارەکە خۆی هەمان دیالێکتە. ئەمە بە شێوەیەکی تایبەت کاتێك باوە کە دایەلێکتی لەمەڕباس لەبەر چەند هۆیەکی مێژوویی، پلەو پایەی زمانی ***ستاندەری*** نەتەوەیی (نیشتمانی -و-) یان ناوچەیی وەرگرتبێت. بۆ نمونە زۆربەی دانیشتوانی ڕوناکبیریی لەدایکبوی ئینگلتەرە دیالێکتێکی ئینگلیزی قسەئەکەن کە کەمتازۆر نزیکە لە جۆرێکی دیاریکراو لە ئینگلیزی ستاندەرەوە، بەڵام بە شێوەزارێك قسەی پێدەکەن کە زێدە(*provenance*)ی جوگرافی و کۆمەڵایەتیان ئاشکرا ئەکات. جیاوازیەك هەیە دەبێت بکرێت لە نێوان

"شێوەزار"و "دیالێکت" دا، لانی کەم لە بەکارهێنانی ڕۆژانەدا. زۆر لە زماننا‌سان جیاوازیگەلێك لە شێوەزاردا لە ژێر جیاوازیگەلێك لەدیالێکتدا تۆمار دەکەن. ئەم خاڵە کە خاڵێکی زاراوەسازی پەتیە، خۆی لەخۆیدا، هیچ ئاکامێکی لێ ناکەوێتەوە. بەڵام گرنگە درك بەوە بکەین هەمان دیالێکت ئەتوانرێت بە شێوەگەلێکی تاڕادەی سەرسوڕمان لێکجیاواز گۆ بکرێت، کە ئەگەر وا نەبێت هەر هەمان دیالێکتیشە. هەروەها گرنگی ئەوەش لەوە کەمتر نیە کە درك بەوە بکەین کاتێك ستاندەرێکی دانپیانراوی لەمێژجێگیربووی نەتەوەیی یان ناوچەیی لە گۆڕێدا نەبێت، جیاوازیەکان لە دیالێکتدا، نە تەنها لە گۆکردندا بەڵکو لە گرامەرو موفرەداتدیشدا، بەرەو ئەوە ئەچێت زۆر زیاتر جێگەی سەرنج بێت لەوەی کە ئێستا جێگەی سەرنجە لە زۆربەی جڤادە ئینگلیزی زمانەکان لەمڕۆماندا.

+هەرچەندە زمانناس زاراوەی "دیالێکت" بەکار دەهێنێت، وە هەروەکو مرۆڤی ئاسایی (عەوام -و-) دەیبەستێتەوە بە زاراوەی "زمان"ەوە، بەوەی کە دەڵێت ڕەنگە زمان لە چەند دیالێکتێکی جیاواز پێکهاتبێت، بەڵام ئەو تێگە زمنیانە قەبوڵ ناکات کە عادەتەن پەیوەندی بە زاراوەی "دیالێکت"ەوە هەیە لە بەکارهێنانی ڕۆژانەدا. لە هەمووی گرنگتر، زمانناس قەبوڵی ئەوە ناکات کە دیالێکتی ناوچەیەکی دیاریکراو یان چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو ڤێرژنێکی کەمبەهاو گەندەڵی دیالێکتی ستاندەرە بێت: ئەو دەزانێت کە لە گۆشەنیگایەکی مێژووییەوە، دیالێکتی ستاندەر-- ئەوەی کە خەڵکی عەوام وای بەباش دەزانن زاراوەی "زمان"ی بۆ بەکار بهێنن، زیاتر لە دیالێکت-- لە ئەسڵدا، هەرچەند لە پەرەسەندنی دواتریشیدا نەبێت، وەکو جۆر لە دیالێکتە ناستاندەرەکان جیاواز نیە. هەروەها ئەوەش دەزانن کە مادامەکی مەودایەکی فراوان لە وەزیفە بەجێ دەهێنن لە ژیانی ڕۆژانەی ئەو شوێنەدا یان ژیانی ڕۆژانەی ئەو چینە کۆمەڵایەتییەی کە تیایدا بەکاردەهێنرێن، دیالێکتە ناستاندەرەکان کەمتر سیستماتیکی نین لە ستاندەری ناوچەیی یان نەتەوەیی. ئەم خالانە پێشتر وروژێنران. دەگەڕێینەوە سەریان بۆ ئەوەی پەرەیان پێبدەینو بە نمونە ڕوونیان بکەینەوە جاروباریش بۆ ناساندنی چەند سنوردانانێك لە نەسکەکانی دواتری ئەم کتێبەدا: بە سەیرکردنی لە گۆشەنیگایەکی کۆمەڵایەتیو کلتوری هاوچەرخەوە، ستاندەری ناوچەیی یان نەتەوەیی وەکو ستاندەرێکی بەهەق، زۆر جیاواز لە

کاراکتەردا لەو دیالێکتە ناستاندەرە پەیوەندیدارانە سەیر دەکرێت کە لە ڕووی مێژووییەوە پەیوەندیدارە پێیانەوە.

+زۆرجار لە بەکارهێنانی ڕۆژانەی زاراوەکانی "دیالێکت"و "زمان"دا، جیاوازیکردن لە نێوانیاندا تا ڕادەیەکی ئێجگار زۆر لەسەر ئیعتیباراتی سیاسیو کلتوری دامەزراوە. بۆ نمونە، مەندارینو کانتۆنیز بە دیالێکتیکی زمانی چینی ناو دەبرێن، بەڵام زیاترە لە لێکجیاوازی زمانی دانیمارکیو نەرویژی، یان لەوەش سەیرتر، زمانی هۆڵەندی، فلیمەنکی[15] و زمانی ئەفریقانی (*Afrikans*)[16] لێک جیاوازن، کە زۆرجار وەکو زمانی جیاواز وەسف دەکرێن. ڕەنگە بۆچوون وابێت کە پێوەری لێکتر گەیشتن(*intercomprehensibility*) بەس بێت بۆ کێشانی هێڵێکی تەرسیمەی سیاسیانەو کلتوریانەی بێلایەن لە نێوان زمانەکاندا. لە ڕاستیدا ئەمە پێوەرێکی سەرەکیە زماناسێکی سەرقاڵ بە پراکتیزە کردنەوە پیادەی دەکات لە دیاریکردنو جێگیر کردنی سنورەکانی جڤادێکی زمانیدا. بەڵام لێرەدا کێشەگەلێك لە گۆڕێدایە. زۆرجار وا ڕێ دەکەوێت کە جۆراوجۆری (جیاوازی) دیالێکت بەرە بەرەیەو کەمتازۆر بەردەوامە لە ڕوبەرێکی فراواندا. بەم پێیەش پێدەچێت قسەکەرانی دوو ناوچە کە ڕوبەرێکی فراوان لێکیان جیا بکاتەوە نەتوانن لەیەکتر تێبگەن، بەڵام لەوانەیە هیچ خاڵێك لە نێوان دوو دیالێکتی تەنیشت یەکدا نەبێت کە لەو خاڵەدا لێکتر گەیشتن هەرەس بهێنێت. (واتە ناگەنە ئاستێك کە تیایدا لێك گەیشتن هەرەس بهێنێت و—). بەڵام گرفتێکی تر هەیە کە جێگەی نیگەرانیە، ئەویش ئەوەیە کە قابلیەتی تێگەیشتن(مفهومیەت) هەمیشە هاوڕێژە نیە؛ هەروەها مەسەلەی هەموو یان هیچ شتێك نیە. زۆر مومکینەو لە واقیعدا زۆر باویشە کە (س) لەزۆری ئەوەی (ص) دەیڵێت تێبگات، وە (ص) کەمێك یان هیچ لەوەی (س) دەیڵێت تێبگات، کاتێك هەریەکەیان بە دیالێکتی خۆی قسە لەگەڵ ئەوی دی دەکات. کەواتە، لەبەر هۆگەلێکی جۆراو جۆر، گەلێك جار زۆر زەحمەتە جیاوازیەکی زەق لە نێوان زمانە جیاوازەکانو دیالێکتە جیاوازەکانی هەمان زماندا بکرێت.

+لە ڕاستیدا، زۆرجار حاڵەتەکە وایە کە ناتوانرێت جیاکردنەوەیەکی زەق بکرێت لە نێوان دیالێکتی ناوچەیەكو دیالێکتی ناوچەیەکی تردا، عادەتەن ناوچەیەکی هاوسێی. هەرچەندێك بە وردیو بەرتەسکانە سنوری ناوچەی دیالێکتیك لە ڕێگەی پێوەرە کۆمەڵایەتیەکانو هەروەها جوگرافیەکانیشەوە دیاری بکەین، ئەوا گەر لە مەسەلەکە بکۆڵینەوە، هەمیشە بڕێکی دیاریکراو لە گۆڕانی سیستماتیکی دەبینینەوە

زۆرجار لە بەکارهێنانی ڕۆژانەی زاراوەکانی "دیالێکت" و "زمان"دا، جیاوازیکردن لە نێوانیاندا تا ڕادەیەکی
ئێجگار زۆر لەسەر ئیعتیباراتی سیاسیو کلتوری دامەزراوە

لە ئاخاوتنی ئەو کەسانەی کە بەو پێیە وەکو قسەکەرانی هەمان دیالێکت دەستنیشان کراون. دوا ڕێگە ئەوەیە کە دەبێت پێ لەوە بنێین کە هەرکەسەو دیالێکتی فەردی تایبەت بە خۆی هەیە؛ واتە ئایدیۆلێکت(*ideolect*)ی خۆی هەیە، هەروەکو زمانناسان بەم شێوەیە گوزارشتی لێدەکەن. (ئایدیۆلێکت واتە دیالێکتی تاکەکەس –و –). هەر ئایدیۆلێکتێك لە هەر ئایدیۆلێکتێکی تر جیاوازە، بە دڵنیاییەوە لە ڕووی موفرەدات و گۆکردنەوەو لەوانەیە تا ڕادەیەکی کەمتر لە ڕووی گرامەریشەوە. لەوەش زیاتر، لە کۆتایی ئەو ماوە زەمەنیەی کە ئێمە عادەتەن بە ماوەی وەرگرتنی زمان لە قەڵەمی دەدەین، ئایدیۆلێکتی کەسێك بۆ یەکجارو بۆ ئەبەد جێگیر نابێت؛ ئایدیۆلێکت بە درێژایی ژیان ئاوالآیە بۆ گۆڕان و فراوانبون.

+سەرباری ئەو ڕەهەندەی کە دەکرێت بە پێی پێوەری: زمان دیالێکت ئایدیۆلێکت حسابی بۆ بکرێت، ڕەهەندێکی دی هەیە ئەویش جیاوازبونی سیستماتیکیە لە گوتەکانی ئەندامانی جڤادێگی زمانیدا: واتە ڕەهەندی ستایڵ(أسلوب). ئەمێستا جیاوازیە ستایلیستیەکان (الاختلافات الاسلوبیە) بە پەیوەندی لەگەڵ جیاوازی نێوان ئەدەبی و عامیدا ئیشارەتیان پێدرا ئەو جیاوازیەی کە لە جیاوازی نێوان زمانی نوسین و زمانی قسەکردنەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەك تەریب نیە لە گەڵیدا، زۆر لەمەش زیاتر هەیە سەبارەت جیاوازی ستایلیستی. هەر کاتێك ئێمە بە زمانی دایکمان قسەئەکەین یان ئەنوسین، ئەو کاری قسەکردن و نوسینەمان بە ستایڵێك زیاتر لە ستایلێکی دی ئەنجام دەدەین، بەپێی بارودۆخەکەو پەیوەندیمان بەو کەسەوە کە قسەی لەگەڵ دەکەین یان بۆی دەنوسین و مەبەست و سروشتی ئەو شتەی ئەبێت بیگەیەنین و چەند فاکتەرێکی دی. ئەو پشکە (خیار) ستایلیستیانەی پێیان هەڵدەسین، چ ئاگایانە پێیان هەڵسین چ نائاگایانە، هەر سیستماتیکی و بەرچاو ودیارن: هەستان بە پشکی ستایلیستی شیاو بەشێکی پڕبایەخە لە بەکارهێنانی زمانێك بە شێوەیەکی ڕاست ودروست و کاریگەرانە. کەواتە مانایەك هەیە لەوەدا کە هەموو قسەکەرێکی ئەسڵی زمانێك (قسەکەر بە زمانی دایك –و–) لە ڕووی ستایلەوە فرە–زمانن. هەروەکو چۆن لە ڕووی پرەنسیپەوە مومکینە هەر ئایدیۆلێکتێك وەکو سیستمێکی زمانی جیاواز سەیر بکرێت، ئاواش مومکینە– کەمتریش بەجێ نیە– کە هەر ستایلێکی قابیلی جیاکردنەوە لەوانی دی وەکو سیستمێکی زمانی جیاواز سەیر بکرێت.

## زمانی سەرەتایی لە گۆڕێدا نیە

+شتێکی تەواو ئاساییە گوێمان لە خەڵکی ئاسایی بێت باس لە زمانە سەرەتاییەکان بکەنو تەنانەت باس لەو ئەفسانە جێگومانەش بکەن کە دەڵێت خەڵکانێك هەن زمانەکەیان لە چەند-سەد وشەیەك پێکدێت کە ئیمائە-گەلێکی بۆ زیاد کراوە. هەقیقەتەکە ئەوەیە هەر زمانێك لەو زمانانەی تا ئێستا دیراسە کراون، هەرچەندێك ئەو کۆمەڵگەیەی بەکاری دەهێنێت سەرەتایی و ناشارستانی بێتە پێش-چاومان لە ڕووەکانی ترەوە، بە لێکۆڵینەوە ساغ بۆتەوە کە سیستمێکی کۆمۆنیکەیشنی ئاڵۆزو زۆر پێشکەوتوە. بێگومان چەمکی پەرەسەندنی کلتوری لە بەربەریەتەوە بۆ شارستانیەت، ئەم چەمکە وەکو گشتێك، خۆی لە خۆیدا تارادەیەکی زۆر جێگەی پرسیارە. ئیشی زمانناس نیە ڕاستو ڕەوایەتی ئەم مەسەلەیە ڕابگەیەنێت. ئەوەی ئەو ئەتوانێت بیڵێت ئەوەیە کە هەتا ئێستا نەتوانراوە پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕ بدۆزرێتەوە لە نێوان ئەو قۆناغە جیاوازانەی پەرەسەندنی کلتوری کە کۆمەڵگەکانی پێدا تێپەڕیوەو جۆری ئەو زمانەی لەو قۆناغانەی پەرەسەندنی کلتوریدا قسەی پێکراوە. بۆ نمونە شتێك نیە پێی بوترێت تایپێکی چاخی بەردین لە زمان؛ یان ئەوەندەی پەیوەندی بە بونیادی گراماتیکی گشتیەوە هەبێت، جۆرە زمانێك هەبوبێت کە سیفەتی جیاکەرەوەی کۆمەڵگای خۆراك کۆکەرەوە یان ئاژەڵ بەخێوکەر بوبێت لە لایەك، یان نیشانەی جیاکەرەوەی کۆمەڵگە پیشەسازیە مۆدێرنەکان بێت، لە لایەکی ترەوە.

+لە سەدەی نۆزدەیەمدا بڕێکی باش لە مەزەنەکردن(تێفکرین -و-) ئەنجام درا سەبارەت بە پەرەسەندنی زمانەکان لە ئاڵۆزی بونیادیەوە بۆ سادەیی، یان لەباتی ئەوە، لە سادەییەوە بۆ ئاڵۆزی. زۆربەی زمانناسان لەمڕۆماندا خۆ بەدوور دەگرن لە مەزەنەکردن سەبارەت بە پێشکەوتنی پەرەسەندن ئامێزی زمانەکان بە بە شێوەیەکی وەها گشتیانە. ئەوان دەزانن ئەگەر هەر ئاڕاستەگەراییەك هەبوایە لە پەرەسەندنی زمانەکاندا لە بنەچە (ئەسڵ)کانیانەوە لە سەردەمانی پێش مێژووی مرۆڤەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان، ئەوا هیچ بەڵگەیەك لە ئارادا نیە سەبارەت وەها ئاڕاستەگەراییەك کە بتوانرێت لە ئەنجامی دیراسەکردنی زمانی قسەکردنی هاوچەرخ یان دیراسەکردنی ئەو زمانانەی ڕابردوو کە هەر زانیاریەکمان هەبێت دەربارەیان، بهێنرێتەوە. زۆر لە مەزەنە-کردنەکانی پێشتری زانایان (لێکۆڵیاران -و-) سەبارەت پەرەسەندنی

زمانەكان لایەنگیربون بە لای ئەو زمانانەی بە زمانە ئیعرابیەكان نـاو دەبرێـن وەكـو زمانی لاتینی و گریكی.

+ئالێرەدا، پێویستە شتێك بوترێت سەبارەت بنەچەی زمان كە كێشـەیەكە هـزرو ئەندێشەی مرۆڤی لە سـەردەمانێكی زۆر دێرینـەوە جـەنجاڵ كـردوە. ئـەم كێشـەیە، بـە تێرمی عەلمانی، جیاواز لە تێرمی ئایینی یـان سـەرو–سروشـتی، بـە چڕی مشتومڕی لەسەر كراوە لە لایەن فەیلەسوفەكانی گریكەوەو لەو كاتـەوەو لـە چەند كاتێكی تـردا، بـە تایبـەتی لـە سـەدەی هەژدەیـەمدا، لـە ڕوانگـەیەكی هاوشـێوەو فراوانـەوە مشـتومڕی لەسەر كراوە. مشتومڕەكانی پێشتر ڕۆڵێكی گرنگیـان بینـی لـە سـەرهەڵدانی گرامـەری تـەقلیدیدا. گفتوگۆیـەكانی كۆندیلاكـی فەیلەسـوفی فەرەنسـی و هـێردەری فەیلەسـوفی ئەڵمانی لـە دواییـەكانی سـەدەی هەژدەیـەمدا، یارمـەتی زەمینـە خۆشـكردنیان دا بـۆ تێگەیشـتنێكی باشتر لـە پشتپێكبەستن(*interdependence*)ی زمان و فیكـرو كلتـور. لـە سەدەی نۆزدەیەمەوە، زۆربەی زماننـاسان، بێجگـە لـە كـەمێكیان، بـەرەو ئـەوە دەچـوون كە سەرجەم پرسیاری ئەسڵ و بنەچەی زمان وە لانێن بـەو پێیـەی كـە پرسـیارێكە بـۆ هەتایـە لـەودیو مـەودای لێكۆڵینـەوەی زانسـتیەوەیە. هۆیەكـەش ئەوەیـە، هــەروەكو ئەمێستا بینیمان، لە ماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا زماننـاسان گەیشتنە ئـەو قەناعەتـەی، هەرچەندێك دوور مێژووی زمانێكی دیاریكراومان گەڕاندەوە دواوە لەو تێكستانەدا كە بۆمان ماوەتـەوەو گەیشـتوون بـە دەسـتمان، مەحاڵـە هـیچ نیشـانەیەكی پێشـكەوتنی پەرەســەندن ئامێزیــان لــە بــارێكی ســەرەتایی تــرەوە بــۆ بــارێكی پێشكەوتوتر، تێدا جیا بكرێتەوە.

+بەڵگەی تر هەن كە هەندێكیان نوێن. ئەسڵی زمان بۆ جارێكی تر دەبێتـە بابـەتی مشـتومڕی زانسـتی، ڕەنگـە كـاتی ئـەوە نـەهاتبێت بـاس لـە ڕێگـەچارە بكرێـت. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەوەی ئـەتوانرێت بوترێت ئەوەیە ئێستا وا دیارە ئەو بۆچونە زۆر بـەجێتر دیـار بێـت لـە چـەند سـاڵێك لەمەوبـەر، كـە زمـان لـە سیسـتمێكی كۆمۆنیكەیشـنی ئیمائیەوە، زیاتر لەوەی لە سیستمێكی كۆمۆنیكەیشنی دەنگیەوە، سەرچاوەی گرتوە. یەكێك لەو بەڵگانەی بەدەستەوەن ئەو سەركەوتنەیە كە سایكۆلۆژیستەكان بەدەستیان هێنـا لـە فـێركردنی شـەمپانزیدا بـۆ تێگەیشـتن و بـەكارهێنانی چـەند سیسـتمێكی ئیمائەیی تاڕادەیەك ئاڵۆزو لە ئاستێكیشدا زمانئاسا. ئێستا وا دیارە ئەو شكستەی

ئەوەی ئەتوانرێت بوترێت ئەوەیە ئێستا وا دیارە ئەو بۆچونە زۆر بەجێتر دیار بێت لە چەند ساڵێك لەمەوبەر، كە زمان لە سیستمێكی كۆمۆنیكەیشنی ئیمائیەوە، زیاتر لەوەی لە سیستمێكی كۆمۆنیكەیشنی دەنگیەوە، سەرچاوەی گرتوە

شەمپانزی هێنای بۆ فێربونی ئاخاوتن لە چەند تاقیکردنەوەیەکی هاوشێوەدا لە ڕابردودا، ئەتوانرێت لانی کەم بەشێکی بەوە لێك بدرێتەوە کە جیاوازی پچوك، بەڵام گرنگ هەن لە نێوان ئۆرگانەکانی دەنگ لای شەمپانزی‌و مرۆڤ. هەروەها لەو دیراسانەوە کە لەسەر پاشماوە بەبەردبوەکان کراون دەردەکەوێت کە ئۆرگانە دەنگیەکانی مرۆڤی نیاندەرتاڵ زیاتر لەوانەی ئێمە لە ئۆرگانە دەنگیەکانی شەمپانزی‌و شیردەرە باڵاکان دەچن، کە مەودایەکی سنورداریان هەیە لە هاوارکردنی دەنگی، بەڵام لەگەڵ یەکدی کۆمۆنیکەیشن لە ڕێگەی ئیمائەوە لە هەرددا بە شێوەیەکی تەواو چڕوپڕ ئەنجام ئەدەن. ئەوەی ئەم بەڵگەیەو بەڵگەی تریش ئاماژەی پێدەکات ئەوەیە کە لەوانەیە زمان یەکەمجار وەکو سیستمێکی ئیمائەیی سەری هەڵدا بێت لە کاتێکدا باوو باپیرانی مرۆڤ لە وەستاندا بارێکی ڕەپیان وەرگرتوەو بەمەش دەستیان ئازاد بوە لە جوڵەداو مێشکیش لە قەبارەدا لە زیادکردندا بوەو ئیمکانیەتی تایبەتمەندبونی وەرگرتوە لە پرۆسەکردنی وەزیفە ئاڵۆزەکانی نیوە گۆی باڵا-دەستی مێشکدا. لە ئاستێکداو لەبەر هۆی بایۆلۆژی بەجێ، دەبێت سیستمە ئیمائەییەکە گۆڕابێت بۆ سیستمێکی دەنگی‌و لە ئاکامدا خەسڵەتی دوولانەیی وەرگرتوەکە هەروەکو بینیمان ئەم خەسڵەتە ڕێگە ئەدات بە زیادبونێکی ئێجگار زۆر لە موفرەداتدا. ئەمەش ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە پێناچێت هەموو ئەو خەسڵەتانەی کە سیفەتی جیاکەرەوەی زمان‌و دەیانزانین، لە سەرەتاوە ئامادە بوبن وە کە زمان لە ڕاستیدا لە نازمانەوە پەرەی سەندوە.

+ئەو ڕاستیە دەمێنێتەوە کە نە تەنها لە هەموو زمانە ناسراوەکاندا، کەناڵی دەنگی -- بیستنە کە بە شێوەیەکی سەرەکی‌و سروشتی بەکار دەهێنرێت بۆ ڕەوانەکردن‌و ناردنیان، بەڵکو هەموو زمانە ناسراوەکان تەقریبەن یەکسانن لە ئاڵۆزیدا ئەوەندەی پەیوەندی بە بونیادی گرامەرییەوە هەبێت.

+تەنها هەڵبواردنێك کە پێویستە بکرێت بۆ ئەم تەعمیمەی دوایی ئەو هەڵبواردنەیە کە پەیوەندی بە زمانەکانی پیدجن(*pidgin*)ەوە هەیە. ئەم زمانانە زمانی تایبەتمەند کراون بەکار دەهێنرێن بۆ مەبەستی بازرگانی‌و مەبەستی تری لەو جۆرە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە زمانێکی تری هاوبەشیان نیە. سیفەتی جیاکەرەوەی زمانەکانی پیدجنە کە گرامەرێکی سادەکراویان هەیەو موفرەداتێکی ئێجگار سنورداریان هەیە بە بەراوورد لەگەڵ ئەو زمانەی، یان ئەو زمانانەی کە لەسەری دامەزراون. بەڵام ئەم زمانانە بۆ مەبەستیس زۆر سنوردار بەکار دەهێنرێن، کاتێکیش کە ئەمە زۆرجار

رووی داوە، ئەو زمانەی کە وەکو زمانی پیدجن سەری هەڵداوە، وای لێ دێت وەکو زمانی دایکی جڤادێکی زمانی بەکار بهێنرێت، ئەو کاتە نە تەنها موفرەداتی چڕوپڕ بۆ خۆی دابین دەکات بەڵکو ئاڵۆزی گراماتیکی تایبەت بە خۆی پەرە پێدەدات. لەم ڕووەوەیە، زیاتر لەوەی لە ڕوی ئەسڵەکەیانەوە بێت، کە زمانەکانی پیدجن لە لایەن زماننناسانەوە لەو زمانانە جیا دەکرێنەوە کە بە کریۆل (*creole*) ناو دەبرێن[17]. پێدەچێت زمانەکانی پیدجن زۆر لە زمانەکانی کریۆل بچن یان واش دەرکەوتبن، بەڵام لەو هەرزارەها زمانە سروشتیەی تر نزیکتر نین لە سەرەتایی بونەوە-- واتە کە بونیادێکی ناپەرەسەندوو دواکەوتویان هەبێت-- کە ئەوەندەی پێ بزانین وەکو زمانەکانی پیدجن سەریان هەڵنەداوە.

+بێگومان جیاوازی ئێجگار زۆر هەیە لە نێوان موفرەداتی زمانە جیاوازەکاندا. کەواتە لەوانەیە پێویست بێت زمانێکی دی فێر ببین، یان لانی کەم موفرەداتێکی تایبەتمەندکراو، بۆ ئەوەی دیراسەی بابەتێکی دیاریکراو بکەین یان بە شێوەیەکی ڕەزابەخشانە قسەی لەسەر بکەین. بەم مانایە، پێدەچێت زمانێك باشتر لە زمانێکی تر بگونجێنرێت بۆ مەبەستی دیاریکراو. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە زمانێك خۆی لە جەوهەردا دەوڵەمەندتر یان هەژارترە لە زمانێکی دی. ڕەنگە گریمانەی ئەوە بکرێت کە هەموو زمانە زیندوەکان لە سروشتی تایبەت بە خۆیاندا سیستمی کارای کۆمۆنیکەیشنن. لەگەڵ گۆڕانی پێداویستیە کۆمۆنیکەیشن-ئامێزەکانی کۆمەڵگەیەکدا، زمانەکەشیان دەگۆڕێت بۆ تێرکردنی ئەو پێویستیە نوێیانە. موفرەدات فراوان دەکرێت، یان بە وەرگرتنی لە زمانەکانی ترەوە، یان لە ڕێگەی دروستکردنیانەوە لەو وشانەی کە هەن. ئەو ڕاستیەی کە زۆر زمان هەن قسەیان پێدەکرێت لەو وڵاتانەدا کە هەندێك جار بە وڵاتە دواکەوتوەکان ئاماژەی بۆ دەکرێت، وشەیان کەمە بۆ بۆچوون (تێگە--و--)و بەرهەمی ماددی زانستو تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ، ئەم ڕاستیە ئەو مانایە هەڵناگرێت کە ئەو زمانانە سەرەتاییترن لەو زمانانەی کە ئەو وشانەیان هەیە. ئەمە تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە چەند زمانێکی دیاریکراو هەن بەکار نەهێنراون، لانی کەم تا ئێستا، لە لایەن ئەو کەسانەوە کە بەشدارن لە پەرەپێدانی زانستو تەکنۆلۆژیادا.

+سەرەنجام پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکرێت ئەو پرەنسیپەی کە زمانی سەرەتایی لە گۆڕێدا نیە، هێندەی گریمانەیەکی یاریدەدەرە ئەوەندە دۆزینەوەیەکی

ئیمپریکی لێکۆڵینەوەی زمانناسی نیە. پێویستە بوار بدەین بە ئەگەری ئەوەی کە زمانەکان بە ڕاستی لە ڕووی ئاڵۆزی گراماتیکیەوە جیاوازن، وە ئەو جیاوزازیانە هەتا ئێستا لە لایەن زمانناسانەوە ئاشکرا نەکراون. نکوڵیکردن لە بوونی ئەم ئەگەرە هێندەی لە قەڵەمدانی زمانی لاتینی بەوەی خۆی لە جەوهەردا زمانێکی پایەبەرزترو گوزارشتکەرترە لە زمانی هۆتێنتۆت[18] یان لە یەکێك لە زمانە ئەسڵیەکانی ئوسترالیا، هێندەی ئەم لەقەڵەمدانە نازانستیە.

---

*لە چاپەکانی پێشتردا (14 : 1964، 13 : 1971) ئەڵێت: "زمانەکان بە شێوەیەکی بێسنور قابیلی درێژبونەوەو گۆڕینن بە پێی پێویستیو هەلومەرجە گۆڕاوەکانی قسەکەرەکانیان. لە دواترین چاپیدا، وشەی "خۆگونجێن" لە جیاتی "بێسنور قابیلی فراوان بون" بەکار دەهێنێت.

## سەرچاوە

نەسکی یەکەم لە
*Language and Linguistics; An Introduction, by John Lyons, Cambridge University Press 1981-1987.*

## پەراویزەکاني وەرگێر

() ***Outline of Linguistic Analysis***

()مەبەست لە هەڕەمەکێتی لە زماندا نەبونی پەیوەندیەکی لۆژیکیە لە نێوان فۆرمی وشە (وشەکە چ وەکو دەنگ چ وەکو نوسین)و مانەکەیدا.

() ***Essay on Language***

() وشەی تەکنیکی واتە تایبەت بە بوارێکی دیاریکراو کە لێرەدا بواری دەرونناسیە.

() واتە لەباتی ئەوەی هاندەر–وەڵام بێت هاندەر–ڕەهایە کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هاندەر لە زمان دا وەڵامێکی دیاریکراوی نیە وەکو لە تیۆرەی هاندەر–وەڵامی سلوکیەکاندا هەیە لە ڕەفتاردا، لێرەدا ڕەها بە مانای سەربەست یان ئازاد بەکار هێنراوە واتە وەڵامی هاندەرەکە نەبەستراوەتەوەو پێشبینی پێناکرێت.

() مەبەستی نوسەر قابلیەتی درێژبونەوەو فراوانبونو گۆڕینی زمانە.

() پاشکۆیەتی بونیاد واتە پشتبەستنی ئێلیمێنتێك بە ئێلیمێنتێکی تر هەروەکو پشتبەستنی (صفه) بە (موصوف) لە زمانی عەرەبیدا (البنى النحويه جومسکی، ترجمه د. یوئیل یوسف عزیز دار الشوؤن الثقافیة العامة– بغداد، الطبعة الاولى 1987)

(*8*)، (*9*) نازانم ماناو مەبەستی نوسەر چیە لەو دوو ڕستەیەی هێڵم بە ژێریاندا هێناوە، لەبەر ئەوە وا لێرەدا دوو ڕستە تەریبە ئینگلیزیەکە وەکو خۆیان دەنوسمەوە. جێگەی تێبینی کردنە نوسەر خۆیشی لە پەرەگرافەکەی دوای ئەو پەرەگرافەی ئەو دوو ڕستەیەم تێدا دیاری کردوە، ناڕاستەوخۆ دان بە قورسیو ئاڵۆزی ئەو بابەتەدا دەنێت.

***The potentiality that the letters have for combining with one another is totally unpredictable in terms of their shape.*** .

***It is because there is, in general, no structural priority of spoken language over written language, as far as Chinese is concerned, that much the same written language can be put into correspondence with quite distinct and mutually incomprehensible spoken dialects.*** .

(*10*) واتە "قسەی قۆڕ"

(*11*) واتە "سەرباری ئەو تەرتیباتەی هەتا ئەم ساتەوەختە ئەنجام دراوە" کە لە ئینگلیزییەکەدا زۆر ئەدەبیە.

(*12*) ئۆرتۆگرافی واتە سیستمی حونجەکردن (نظام التهجئە) کە بە ئینگلیزی (***spelling system***)ە.

(*13*) لێرەدا وشەی یەکەمو دوەم هەر یەکەیان ناوی باڵندەیەکە کە ئەو دەنگە دەر دەکەنو بە ناوی دەنگەکەیانەوە ئەو ناوەیان لێ نراوە، سێیەمیشیان واتە "زرم" کە ئەمەش دەنگی کەوتنو بەریەککەوتنی شتە، کەواتە لێرەدا پەیوەندیەکە هەڕەمەکی نیە.

(*14*) مەبەستی نوسەر (***generative grammar***) واتە گرامەری زایەنگەرایی (النحو التولیدی) کە ئەو زانستی گرامەرەیە کە وەستاوەتە سەر ژمارەیەکی دیاریکراو لە ڕێسا کە کە هەموو تەرکیبەکانی زمانی پێ زەبت ئۆرگانیزە دەکرێت.

(*15*) مەبەستی لەو زمانە هۆڵەندیەیە کە گەلی فلیمینگ بەکاری دەهێنن کە گەلێکن لە باکوری بەلجیکاو بەشێکی بچوکی باکوری فەرەنسادا دەژین.

(*16*) زمانی ئەفریقانی ئەو زمانەیە کە لە هۆڵەندەی سەدەی حەڤدەیەمەوە پەرەی سەندوە کە زمانێکی ڕەسمی کۆماری ئەفریقای باشورە.

(*17*) کریۆل ئەو زمانەیە کە لەسەر بناغەی دوو زمان یان زیاتر دامەزراوەو بۆتە زمانی دایکی قسەپێکەرەکانی.

(*18*) هۆتینتۆت زمانی یەکێك لە گەلەکانی ئەفریقای باشورە کە گەلێکی کورتە باڵاو پێست زەردن.

## فەرهەنگۆك

| کوردی | ئینگلیزی | عەرەبی |
| --- | --- | --- |
| پێشگریمانە | ***Presupposition*** | أفتراض مسبق |
| مانای ناوەکی، مانای زمنی | ***Implications*** | معنی متضمن |
| ئامرازی نەناس | ***Indefinite article*** | أداة النکرة |
| زاراوەسازی | ***Terminology*** | |
| جڤادی زمانیی | ***language Community*** | المجتمع الکلامي |
| نۆرم | ***Norm*** | معیار |

| | | |
|---|---|---|
| الاولوية، الاسبقية | *Priority* | پرایۆریتی |
| تطابق | *Correspondence* | تەریب بوون |
| علاقة متبادلة | *Correlation* | پەیوەندی ئاڵوگۆڕ |
| لغة طبيعية | *Natural language* | زمانی سروشتی |
| نظام أتصال | *Communication system* | سیستمی کۆمۆنیکەیشن |
| أستعارة | *Metaphore* | میتافۆر |
| مجازي | *figurative* | مەجازی |
| عبارة | *Phrase* | گوزارە |
| أسبرانطو | *Esperanto* | ئێسپیرانتۆ |
| تصريح | *Statement* | بەیانکردن |
| خاصية | *Property* | خەسڵەت |
| طوعياً | *Voluntary* | خۆویستانە |
| رمز | *Symbol* | هێما |
| مصطلح | *Term* | زاراوە |
| شروط | *Terms* | تێرم |
| لغة الجسد | *Body language* | زمانی جەستە |
| أيماءة | *Gesture* | ئیمائە |
| وقفة، وضعة | *Posture* | باری وەستانی لەشولار |
| أعتباطي، كيفي : الأعتباطية، الكيفية | *Arbitrary, arbitrariness* | هەڕەمەکی ، هەڕەمەکێتی |
| رموز صوتية | *Vocal symbols* | هێمای دەنگیی |
| الكلام | *Speech* | ئاخاوتن |
| ربط | *Connection* | پەیوەست، پەیوەندی |
| شفهي-سمعي | *Oral-auditory* | زارەکی-بیستراو |
| ألفاظ اللغة | *Language Utterance* | گوتە یان لەبزەکانی زمان |
| توظيف | *Employment* | بەکاربردن |
| المثير الأستجابة | *Stimulus-response* | هاندەر وەڵام |
| أكتساب اللغة | *Language acquisition* | وەرگرتنی زمان |
| ألأشارة | *Signal* | ئیشارەت |
| أرسال | *Transmission* | ناردن، ڕەوانەکردن |
| عرف، اتفاق جمعي | *Convention* | عـــــورف ، پێکـــــهاتنی دەستەجەمعی |
| قابلية التكيف | *Adaptability* | خۆگونجێنی |
| عدم التوافق | *Incompatibility* | ڕێکنەکـەوتن لـە نێـوان دوو شتدا |
| قابلية التمدد | *Extensibility* | قابلیەتی درێژبونەوە |

| | | |
|---|---|---|
| قابلية التعديل | *Modifiability* | قابلیەتی گۆڕین |
| البنى القواعدية | *Grammatical constructions* | تـــەرکیب یـــان پێکهاتـــە گرامەریەکان |
| متناهي | *Finite* | سنوردار، کۆتا |
| لامتناه | *Infinite* | بێسنور، ناکۆتا، بێپایان |
| عنصر | *Element* | ئێلیمێنت |
| البنى النحوية | *Syntactic structures* | بونیادە سینتاکسیەکان |
| النحو التحويلي | *Transformational grammar* | گرامەری تەحویلی |
| لغة الكلام | *Spoken language* | زمانی قسەکردن |
| لغة الكتابة | *Written language* | زمانی نوسین |
| التجريبية | *Empricism* | ئەزمونگەرایی، ئیمپریسیزم |
| تبعية البنية | *Structure-dependence* | پاشکۆیەتی بونیاد |
| ميزة | *Feature* | سیما |
| علم العلامة (السيميائية) | *Semiotics* | ئاماژەناسی |
| فرع من المعرفة | *Discipline* | دیسپلین (لقێك لـە لقـەکانی زانست) |
| السلوك الرمزي | *Symbolic behaviour* | رفتاری هێماگەرایی |
| السلوك الايصالي | *Communicative behaviour* | ڕەفتـــــــــــــــــــــاری کۆمۆنیکەیشنئامێز |
| النظام السيميائي | *Semiotic system* | سیستمی ئاماژەناسی |
| الكفاءة اللغوية | *Linguistic competence* | توانستی زمانی |
| الاداء اللغوي | *Linguistic performance* | ئەدائی زمانی |
| براعة | *Facility* | لێزانیی |
| أكتساب اللغة | *Language acquisition* | وەرگرتنی زمان |
| متغاير الجنس | *Heterogeniety* | فرەچەشنێتی |
| التوليدية | *Generativism* | زایەندگەرایی |
| عروضى (خاص بعلم العروض) | *Prosodic* | عـــەروزیی (تایبـــەت بـــە عەروز) |
| لغة فوقية | *Paralinguistic* | پارازمانی |
| صحيح أو شرعي | *Legitimate* | راستورەوا |
| لهجة | *Accent* | شێوەزار |
| لهجة متفرعة من لغة أم | *Dialect* | دیالێکت |
| امكانية الفهم البيني | *Intercomprehensibility* | لێکتر گەیشتن |
| لهجة الفرد | *Ideolect* | ئـــایدیۆلێکت (دیـــالێکتی |

| | | |
|---|---|---|
| تاکەکەس) | | |
| ستایلْ | *Style* | أسلوب |
| فرەزمان | *Multilingual* | متعدد اللغات |
| ئاراستەگەرایی | *Directionality* | الاتجاهية |
| ئیعراب | *Inflection* | إعراب |
| پشت پێکبەستنی ئاڵوگۆڕ | *Interdependence* | الاتكال المتبادل |
| دوولانەیی | *Duality* | الثنائية |
| بەرهەمدارێتی | *Productivity* | الانتاجية |
| لێکیساویی | *Discreteness* | عدم التواصل |
| ئۆنۆماتۆپۆویی | *Onomatopoeia* | صوغ الكلمات على اساس اللفظ |
| فرەبەکارهێنانیی | *Versatility* | تعدد الاستعمالات |
| هاوشێوە | *Symmetrical* | متماثل |

جۆن لیۆنس

# هیچ زمانێك سەرەتایی نیە



لە ئینگلیزیەوە: عەتای مەلا کەریم

هێشتا شتێکی ئاساییە که گوێمان لێ بێت خەڵك دەربارەی زمانە سەرەتاییەکان بدوێن و تەنانەت ئەو ئەفسانە دوور لە باوەڕە دووبارە بکەنەوە کە گوایە هەندێ گەل هەن زمانەکانیان تەنها لە چەند سەد وشەیەك پێکهاتوە کە بە ئیشارەت پشتقایم کراون .

ڕاستیەکە ئەوەیە، هەر زمانێك ئەگەر توێژینەوەی وردی لەسەر بکرێت بە باسی زانستیانە سەلماوە کە ڕژێمێکی ئاڵۆزو پەرەسەندووی پەیوەندی کردنە، بێ گوێدانە

ئەوەی کە ئەو کۆمەڵەی بەکاری دەهێنن چەندە دواکەوتوو دوور لە شارستانی دەر بکەون لە لای ئێمە لە کاروباری تردا.

بێگومان تەواوی بیرۆکەی گەشەکردنی کولتووری لە بەربەریزمەوە تا شارستانیەت، هێشتا لەژێر پرسیاردایە، بەڵام خۆ ئەرکی زماننناس نیە ئەو ڕاستیە ئاشکرا بکات، ئەوەی ئەو ئەتوانێ بیڵێت ئەوەیە کە هەتا ئێستا پەیوەندیەکی دوولانە لە نێوان قۆناغە جیاوازەکانی پەرەسەندنی کولتووریدا ،کە کۆمەڵگەکان پیایدا تێپەڕیون و جۆری ئەو زمانەی کە لەو قۆناغانەدا قسەی پێکراوە نەدۆزراوەتەوە . بۆنمونە، بە هیچ جۆرێك زمانێك نیە بتوانین بڵێین لە جۆری زمانی چاخی بەردینە، یان کاتێك کە بناغە ڕێزمانیە گشتیەکەی لەبەرچاو بگرین بڵێین جۆرە زمانێکە سیمای گشتی کۆمەڵگەیەك دەردەخات کە تەنیا بە دوای خۆراکدا ئەگەڕێن ؛ واتە مرۆڤی سەرەتایین یان شوانکارەن لەلایەکەوەو یاخود کۆمەڵگەیەکی نوێی پیشەسازین لە لایەکی ترەوە.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا خۆش-هیواییەکی زۆر دەربارەی پەرەسەندنی زمانەکان هەبوو لە پێکهاتەی ئاڵۆزەوە بۆ سادە، یان بە پێچەوانەوە. زۆربەی زمانەوانەکانی ئەو سەردەمە لەو خۆش-هیواییە کشانەوە کە زمانەکان بەو شێوە گشتیانە پەرە بسێنن. ئەوان دەیانزانی کە ئەگەر هیچ ئاراستەکاریەك لە گەشەی زمانەکاندا هەبووبێت لە ڕەسەنیانەوە؛ واتە لە چاخەکانی پێش مێژووی مرۆڤەوە، تا ئەمڕۆ، ئەوا هیچ بەڵگەیەك نیە ئەو ئاراستەکاریە دەربخات لە توێژینەوەی ئەو زمانە هاوچەرخانەوە کە ئەمڕۆ قسەیان پێ دەکرێت تا ئەگاتە ئەو زمانە کۆنانەی کە شتێك دەربارەیان دەزانین. زۆر لەو خۆش-هیواییەی زووی زاناکان دەربارەی گەشەکردنی زمانەکان ناکام بۆوە لە بەرژەوەندی ئەو زمانانەی کە بە هەڵوەشاوە ناو دەبرێن وەکو زمانی لاتینیو گریکی.

لێرەدا پێویستە هەندێك شت دەربارەی بنەچەی زمان بوترێت، کە گیروگرفتێکە مێشك و ئەندێشەی مرۆڤ تاقی دەکاتەوە لە سەردەمە هەرە کۆنەکانەوە . فەیلەسوفە گریکەکان، وەکو بابەتێکی دنیایی ناڕەحەت بەدەست-هاتوو، بە شێوەیەکی ڕەسمی قسەیان لەسەر زمان ئەکردو جیایان کردبۆوە لە زاراوەکانی ئاین و سەرو سروشت . هەر لەو کاتەوە لە چەندەها سەردەمی تریشدا، بە تایبەتی لە سەدەی هەژدەهەمدا، هەر بە هەمان شێوە باسی کراوە.

قسەو باسەکانی زوو ڕۆڵێکی گرنگی لە پەرەسەندنی ڕێزمانی تەقلیدی*(Traditional grammar)*دا بینی. گفتوگۆکانی دوادوای سەدەی هەژدەهەم لە

لایەن فەیلەسوفی فەڕەنسی کۆندیلا (*Condillac*)و فەیلەسوفی ئەڵمانی هێردەر (*Herder*)ەوە ڕێگایان بۆ تێگەیشتنێکی باشتر خۆشکرد لە پشت بەیەک-بەستنی زمان و بیرو کولتووردا. لە سەدەی نۆزدەهەمەوە زۆربەی زمانەوانەکان، بە جیاوازیەکی کەمەوە، ڕایانگەیاند کە بە تەواوی واز لە پرسیاری بنەچەی زمان بهێنن، چونکە پرسیارێکە لە سەروو دەسەلاتی باس و لێکۆڵینەوەی زانستیەوەیە. هۆکەشی هەر ئەوەیە کە ئێستا دەیبینین : لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا زمانەوانەکان دەرکیان بەوە کرد کە هەرچەندە مێژووی چەند زمانێکی دیاریکراو دوور بگێڕینەوە بۆ دواوە، لەو دەقانەدا کە بە دەستمان گەیشتوون، شتێکی ستەمە هیچ نیشانەیەکیان دەربارەی گەشەکردنی پەرەسەندوانەی زمان لێ هەڵبهێنجرێت، لە بارێکی سەرەتاییەوە بۆ بارێکی پێشکەوتوو، بەلام بەڵگەی تریش هەن کە هەندێکیان نوێن و بنەچەی زمانیش بۆ جارێکی تر جێگای قسەو باس و مشتومڕی زانایانە. لەوانەیە هێشتا کاتی ئەوەش نەهاتبێت کە بە دوای چارەسەرکردنی کۆتاییدا بگەڕێین. ئەوەی ئەتوانرێ بوترێت ئەوەیە کە ئێستا، زیاتر لە چەند سالێکی کەم لەمەوپێش ، ئەوە لە ڕاست دەچێت کە زمان وەکو ڕژێمێکی ئیشارەتی پەیوەندیکردن دەستی پێکردبێت زیاتر لەوەی وەك ڕژێمێکی دەنگی. یەکێك لە بەڵگەکان سەرکەوتنی زانا دەرونیەکان بوو لە فێرکردنی شەمپازیدا بۆ تێگەیشتن و بەکارهێنانی ڕژێمێکی ئیشارەتی زۆر ئالۆز کە تا ڕادەیەك لە زمان ئەچوو.

ئێستا دەردەکەوێت، کە بۆچی شەمپانزی زوو لەژێر هەمان شێوە تاقیکردنەوەدا فێری زمان نەبوو. بە شێوەیەکی نیوەچڵ بە چەند جیاوازیەکی بچوك بەلام گرنگ لە نێوان ئەندامە دەنگیەکانی مرۆڤ و شەمپانزیدا ئەوە ڕوون بۆوە.

هەروەها لە ئەنجامی توێژینەوە لەسەر بەبەرد-بوەکان دەرکەوت کە ئەندامە دەنگیەکانی مرۆڤی نیاندەرتاڵ گەلێ زیاتر لەوەی ئێمە لە ئەندامە دەنگیەکانی شەمپانزی و گیانداره سەرەتاییەکانی تر چوون، کە زنجیرەیەکی دیاریکراو لە بانگەوازی دەنگیان هەبوەو لەگەڵ یەکتردا بە ناڕەحەت و بە شێوەی کێویانە بە هۆی ئیشارەتەوە پەیوەندیان بەیەکەوە کردوە.

ئەوەی ئەم بەڵگەیەو بەڵگەکانی تر ئەیخەنە بەرچاو، ئەوەیە کە زمان لەوانەیە لە سەرەتاوە وەك سیستەمێکی ئیشارەتی پەرەی سەندبێت، لە کاتێکدا باووباپیرانمان

باری بە پێوە ڕاوەستانیان بەخۆوە دەگرت (واتە کاتێك مرۆڤی کۆن هەستاوەتە سەرپێ‌و بەپێوە ڕاوەستاوە) بەمجۆرە دەستەکانیان ئازادبوون و مێشکیشیان هەم لە قەوارەدا زیادی کردو هەم توانای تایبەتمەندی وەرگرت لەو کاروبارە ئاڵۆزانەی کە لە پەرەسەندندا بوون لە دەوروبەرەکەیاندا. لە هەندێ خاڵدا، وەکو بینیمان بە هۆی بەڵگەی بەمتمانەی بایۆلۆژییەوە، ڕژێمی ئیشارەتی گۆڕاوە بە ڕژێمێکی دەنگی‌و دوای زەحمەتێکی زۆر بوە بە خاوەنی سیفەتی دوولانەیی (*duality*)و هەروەها زیاد بوونێکی بەرچاوی تاکە وشە (*vocabulary*)ی بەخۆوە بینیوە. ئەمەش بە دوای ئەوەدا دێت کە نەك هەر خاوەندارییە جیاکەرەوەکانی زمانەکان، ئەوانەی کە تا ئێستا ئەیانزانین کە لەوانەیە لە سەرەتاوە نەبووبن، بەڵکو ئەوە دەردەکەوێ کە زمان خودی خۆی لە نا–زمانەوە (*Non-Language*) گەشەی کردوە .

هەرچۆنێ بێت، ئەو ڕاستیەی کە ماوەتەوە ئەوەیە، کە کەناڵی {دەنگ–بیسٍتن} (*vocal-auditory*) نەك هەر لە هەموو زمانە ناسراوەکاندا بە شێوەیەکی سەرەتایی‌و سروشتی بۆ لێك–گەیشتن بەکار دێت، بەڵکو هەموو زمانە ناسراوەکان بە شێوەیەکی نزیکەیی لە ئاڵۆزیداو لە پەیوەندیدا لەگەڵ بینای ڕێزمانیاندا یەکسانن.

تاکە هەڵاواردنێك کە پێویستە لەو گشتگیریەی پێشوودا بکرێت، ئەوەیە کە پەیوەندی بەو زمانانەوە هەیە کە پێیان دەڵێن پیجن (pidgin)[1] ؛ ئەوانە زمانگەلێکی تایبەتن کە بۆ بازرگانی‌و مەبەستی لەو بابەتە بەکار دێن ، لە نێوان ئەوانەدا کە زمانێکی هاوبەشی تریان نیە. یەکێك لە جیاکەرەوەکانی پیجن(pidgin ) ئەوەیە، کە ڕێزمانێکی ئاسانیان هەیەو ڕادەی وشەیان بەشێوەیەکی توند دیاریکراوە بە بەراوردکردنیان بەو زمانە یان زمانانەی کە لەسەر بنچینەیان پێکهاتوون، بەڵام خۆ ئەوانە بۆ مەبەستی دیاریکراو بەکار دێن‌و کاتێکیش کە هەندێجار ڕوئەدات ، ئەوەی کە لە بنەڕەتدا پیجن بوە، وەکو زمانی دایك لە ناو کۆمەڵێکدا بەکار هات، ئەوا نەك هەر خۆی بە ژمارەیەکی هەرچی زیاتری وشە دەڕازێنێتەوە، بەڵکو ڕێزمانی ئاڵۆزی خۆیشی پەرە پێدەدات . لێرەدایە کە پیجن(pidgin ) لە لایەن زمانەوانەکانەوە لەو زمانانە جیا دەکرێتەوە کە پێیان دەڵێن کریۆڵ (Creole[2]) ، زیاتر لەوەی کە لە بنەچەدا جیاواز بن. کریۆڵەکان (Creole) لەوانەیە وەکو پیجن دیار بن‌و یان وا بنوێنن، بەڵام دوورن لەوەی کە بە زمانی سەرەتایی دابنرێن، لەوەدا کە پێکهاتەیەکی سەرەتاییان هەیە، زیاتر لەو هەزاران زمانە سروشتیەی کە لە بنەچەدا ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین لە پیجنەوە نەهاتوون.

بێگومان جیاوازی بەرچاو هەیە لە نێوان ڕادەی وشەی زمانە جیاوازەکاندا، لەبەر ئەوە لەوانەیە پێویست بێت کە زمانێکی تر فێر ببیت‌و یان کۆمەڵە وشەیەکی تایبەت فێر ببیت بۆئەوەی توێژینەوە لەسەر باسێکی دیاریکراو بکەیت‌و بە تێروتەسەلی لە

زۆر لەو زمانانەی کە لەو وڵاتانەدا قسەیان پێ دەکرێت کە بە تازەگەشەکردوو ناویان دەبەن، زۆر لەو وشانەیان نیە کە پەیوەندیان بە بەرهەمو دیاردەکانی زانستو تەکنۆلۆژیای نوێوە هەیە

بارەیەوە بدوێیت . بەم مانایە ، زمانێك لەوانەیە باشتر بەکاربێت لە زمانێکی تر بۆ مەبەستێکی دیاریکراو. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە زمانێك لە جەوهەردا هەژارترە یان دەوڵەمەندترە لە زمانێکی تر. ئەشێت باوەڕ بکەین کە هەموو زمانە زیندوەکان لە سروشتیاندا هۆکاری گونجاوی پەیوەندیکردنن. کاتێك پێویستیەکانی پەیوەندی- کردنی ناو کۆمەڵێك دەگۆڕێت، زمانەکەشیان دەبێت بگۆڕێت؛ بۆئەوەی ڕوبەڕوی ئەو پێویستیە نوێیانە بێتەوە. ژمارەی وشەکانی زیاد دەکات ؛ جا ئیتر بە وشە- خواستن بێت لە زمانەکانی تر، یان بە داتاشینیان بێت لە وشە زیندوەکانی خۆی.

زۆر لەو زمانانەی کە لەو وڵاتانەدا قسەیان پێ دەکرێت کە بە تازەگەشەکردوو ناویان دەبەن، زۆر لەو وشانەیان نیە کە پەیوەندیان بە بەرهەمو دیاردەکانی زانستو تەکنۆلۆژیای نوێوە هەیە، ئەم ڕاستیە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو زمانانەی باسمان کردن سەرەتایین لەچاو ئەو زمانانەدا کە ئەو وشانەیان هەیە. ئەوە تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە هەندێك زمان هەتا ئێستا لە لایەن ئەو کۆمەڵە خەڵکانەوە بەکار دێن کە سەرو ساختیان لەگەڵ پەرەسەندنی زانستو تەکنۆلۆژیادا پەیدا نەکردوە .

لە کۆتاییشدا پێویستە پێ لەسەر ئەوە دابگرین کە ئەو پرنسیپەی کە دەڵێت هیچ زمانێك سەرەتایی نیە دۆزینەوەیەکی پراکتیکی باسی زمانەوانی نیە وەك گریمانێکی پراکتیکی . ئێمە پێویستە ڕێ بەو ئەگەرە بدەین کە دەشێت زمانەکان لە ئاڵۆزی ڕێزمانیدا جیاواز بن و ئەو جیاوازیانە هێشتا لە لایەن زمانەوانەکانەوە نەدۆزرابنەوە. ئەوەش لەوانەیە کارێکی زانستیانە نەبێت کە بڵێین ئەم ئەگەرە نیە ، هەروەك چۆن زانستیانە نیە بڵێین زمانی لاتینی باش و بەڕێزتر یان پاراوترە لە زمانی هۆتینتۆت (Hottentot [3]) ، یان یەکێك لە زمانە ناوچەییە دابڕاوەکانی ئوستڕالیا.

## پەراوێز

1- پیجن (Pidgin) : ئەو زمانانەن کە لە ئەنجامی ڕوبەڕوبوونەوەی بازرگانە ئەوروپییەکانو خەڵکی ناوچەکانی تری وەك ڕۆژئاوای ئەفەریقاو ڕۆژهەلاتی دوردا پێکهاتون . ئەم زمانانە تایبەتمەندی زمانە ناوچەییەکانو زمانە ئەوروپییەکانی وەك ئینگلیزیو فەڕەنسیو ئیسپانیو هتد یان پێوەدیارە. ((وەرگێڕ))

2- کریۆڵ (Creole ) : زمانی ئەو کەسانەیە کە لە بنەچەدا ئەوروپیین، بەڵام لە کۆلۆنیەکان لەدایك بوون، یان تێکەڵاون لەگەڵ ئەفەریقیو هیندیو ئیسپانیو هتدو زمانەکەیان تایبەتمەندی هەردوو زمانەکەی پێوە دیارە. ئەم جۆرە زمانە لە ئەفەریقاو هیندستان و ئەمەریکای لاتین دەبینرێت. ((وەرگێڕ))

3- هۆتینتۆت ((Hottentot ) زمانی گەلێکە لە ئەفەریقای باشور. ((وەرگێڕ))

## سەرچاوە

*John Lyons, Language and Linguistics 27-31*


ئالان رۆب- گرییَ

ئالان رۆب- گرییَ*

# ژوورە نهێنییەکە

لە ئینگلیزیەوە: سەدرەدین عارف

لە سەرەتادا، وەکو پەڵەیەکی سوور دەبینرێت گەش و درەوشاوە، بەڵام سوورێکی تۆخ، سێبەرەکانیشی مەیلەو ڕەش. پەڵەکە لە شێوەی گوڵێکی ناڕێکەو سنوورەکانی بە باشی دیاریکراوەو بە زۆر لادا لە جۆگەلەی پانی، نایەکسان لە درێژیدا، بڵاودەبێتەوە. جۆگەلە خوێنەکان پاشان دابەش دەبن و بچووك دەبنەوە هەتا دەبنە چەند دڵۆپێکی ئاڵۆز. هەموو خوێنەکە لەسەر ڕووبەرێکی ڕەنگ بزرکاوی لووس و خڕەو، لە هەمان کاتیشدا مەیلەو زەردەو، بریتییە لە دوو نیوە گۆ، کە لە ڕێی دوو کەوانەی ناسکەوە دەگەنە یەك و هەمان ڕەنگی کاڵیان هەیە. تاریکایی شوێنەکە: کە ژوورێکی زیندانە، یان ژووری ژێر زەمینێکە، یان ژووری دێرێکە، خۆی تاریکەو ڕۆشناییەکی پرش و پڵاو ڕووناکی دەکاتەوەو سپێتیی لاشەکە کاڵتر دەکات، لە بۆشاییەکەی پشتەوەدا ڕیزێك ستوونی لوولەیی هەن کە هەتا بەرەو پشتەوە بڕۆن باریکترو نادیارتر دەبن. لەوێشەوە سەرەتای پلیکانەیەکی پان و پۆڕی لە بەرد دروستکراو بەدی دەکرێت، کە لە سەرکەوتندا تۆزێك پێچ دەکاتەوەو هەتا بەرز دەبێتەوەو تا دەگاتە گومەزەکە تەسکتر دەبێتەوەو لەوێشەوە ون دەبێت.

هەموو دیکۆرەکە، پلیکانەو ڕیزە ستوونەکە ڕووتن. لە پێشەوە بە تەنها لاشە درێژکراوەکە هەیە، کە لەبەر ڕووناکییەکی کزدایەو پەڵەیەکی سووری پێوەیە لەشێکی سپی، کە مرۆڤ وا هەست دەکات لە مادەیەکی نەرم و، بێگومان، ناسك دروست کرابێت کە بە خێرایی تێك بچێت لە هەمان گۆشەوەو بە تەنیشت کەوانە خوێناوییەکەوە، شتێکی خڕی دیکە دەبینرێت کە هەمان شێوەی هەیە، بەڵام ئەمیان نەشێوێنراوەو ئەو بازنەیەی کە بە سەرییەوەیەتی ڕەنگێکی تاریکتری هەیەو بە ئاسانی دەناسرێتەوەو وەکو ئەوەی یەکەم بە تەواوی نەشێوێنراوە، یان هیچ نەبێت، بە هۆی برینەوە دانەپۆشراوە.

لە پشتەوە، بەرەو سەرووی پلیکانەکە، سێبەرێکی ڕەش دێتە بەرچاو کە زەلامێکە خۆی لە عەبایەکی درێژی دامێن شەکاوە پێچاوەتەوەو بەسەر دوا پێی پلیکانەکەدا سەردەکەوێت، پاش ئەنجامدانی فرمانەکەی، بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە. ستوونێك دووکەڵی تەنك، بە پێچاوپێچ، لە جۆرە دار بخوردێکەوە کە لەسەر بنکەیەکی ئاسنی بە زیو ڕازاوە دانراوە بەرز دەبێتەوە. لەشە شیرییەکە زۆر لەوێوە نزیکەو جۆگەلە خوێنە پانەکان لە مەمکی چەپییەوە بە ناوقەدیداو بە تەنیشتیداو بەسەر سمتیدا دێنە خوارێ.

جەستەکە هی ژنێکە، ئەندام گۆشتن، بەڵام سووکەڵە، بە تەواوی ڕووتەو لەسەر پشت کەوتووە. سنگی بە هۆی هەندێك {پشتی}یەوە، کە لەسەر ئەو زەوییەی بە فەرشی نەخشی ڕۆژهەڵاتی داپۆشراوە، بەرز بوەتەوە. ناوقەدی زۆر باریکە، ملی، کە بە لایەکدا چەماوەتەوە، درێژو لاوازە، سەری بە پشتا، بەرەو ناوچەیەکی تاریکتر کەوتوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕوخساری بە باشی دەبینرێت. دەمی نیوە کراوەیەو، چاوە گەورەو کراوەکانی وەستاون و دەبریسکێنەوە. بارستی قژە ڕەشە درێژەکەی، بە شەپۆلی ڕێك و پێك، کە لەوانەیە قەیفە بێت، لە قەفی قورسدا پەخشبوونەتەوە، لەگەڵ شان و پەلە ڕاکشاوەکەیدا. ئەو شتە قەیفەیەکی لووسی مۆری تۆخە، یان لەو جۆرە ڕووناکییەدا وا دەردەکەوێت بەڵام لەوە دەچێت کە ڕەنگی مۆر و قاوەیی و شین لە پشتییەکاندا زاڵ بن– کە تەنها بەشێکی بە مادە قەیفەییەکە داپۆشراوەو ئەم ڕەنگانە لە بەشی خوارەوەدا، لەژێر سنگ و ناوقەدیدا زۆر دیارن، هەروەها ئەم ڕەنگانە لەو فەرشانەدا دیارن کە نەخشی ڕۆژهەڵاتیی لەسەر کێشراون و لەسەر زەوییەکە داخراون. لەولا تریشەوە، هەمان ئەم ڕەنگانە لە بەردی زەوییەکەو کەوانەی گومەزەکەو پلیکانەکەدا دیارن، هەروەها لەسەر ڕووی ئەو ناوچانەی کە کەمتر ڕوونن و لەو سەری ژوورەکەن. دەستنیشانکردنی پانی و درێژی ژوورەکە ئەستەمە، لەوە دەچێت ئەو ژنە گەنجەی کە تازە کراوە بە قوربانی شوێنێکی گرنگی تێدا داگیر بکات، بەڵام ڕێژەی پانیی ئەو پلیکانەیەی کە بەرەو ئەو شوێنە دەبێتەوە ئەوە دەردەخات کە، بە پێچەوانەوە، ئەمە هەموو ژوورەکە نییەو، مەودای ژوورەکە لەوانەیە بەرەو ڕاست و بەرەو چەپ و لە هەموو لایەکەوە بۆ پشتی ڕیزە ستوونەکان بکشێت، بەرەو ئەو ڕەنگە قاوەیی و شینانەو، لەوانەشە بەرەو قەنەفەی دیکەو فەرشی ئەستوور و کۆمەڵە پشتیو کەرەستەی دیکەو لاشەی ئەشکەنجەدراوی دیکەو داربخوردی دیکە. هەروەها

ئەستەمە بڵێین ڕووناکییەکە لە کوێوە دێت. هیچ نیشانەیەك لەسەر ستوونەکان و ئەرزەکەدا نییە کە ئاراستەی تیشکەکان پیشان بدات. سەرەڕای ئەوەش، نە پەنجەرەیەك دیارە، نە مەشخەڵێك. لەوە دەچێت کە لاشە شیرییەکە خۆی دیمەنەکە ڕووناك بکاتەوە، سنگەکەو مەمکە زلەکان و کەوانەی سمتەکان و ڕانەکان و لاقە کراوەو درێژبووەکان و موە ڕەشەکەی ئەندامە سێکسییەکەی، کە بەرەو ڕوو خراوەیەو هاندەر، بەلام بێ کەڵك.

پیاوەکە چەند هەنگاوێك دوورکەوتۆتەوە. ئێستا لەسەر یەکەم پلەی پلیکانەکەدایەو ئامادەیە بۆ سەرکەوتن پێیدا. پلیکانەکانی خوارەوە وەکو پلەی ئەو پلیکانانەی کە لە هەندێك ساختمان و شانۆو پەرستگادا هەن و، بەرەبەرە لە بەرزبوونەوەدا تەسکتر دەبنەوە، لە هەمان کاتدا جووڵەیەکی لوولەیی پان دەست پێدەکات و ئەوەندە کەمە کە پلیکانەکە تەنانەت نیو سووڕیش تەواو ناکات و بچووك دەبێتەوەو دەبێتە ڕاڕەوێکی تەسکی بێ دەستگرو تەنانەت پڕ مەترسی لە تاریکییە قووڵەکەدا، پاشان لە نزیك سەرووی گومەزەکەدا ون دەبێت.

بەلام پیاوەکە سەیری ئەو ئاراستەیە ناکات، هەرچەند کە قاچی بەرەو ئەوێی دەبەن. قاچی چەپی لەسەر پلەی دووەمەو قاچی ڕاستی تازە بەر سێیەم کەوتوە ئەژنۆی چەماوەتەوەو ئاوڕێکی بۆ پشتەوە داوە بۆ ئەوەی بۆ دواجار بیر لەو دیمەنە بکاتەوە. ئەو عەبا درێژە شەکاوەیەی، کە بە پەلە خستبوویە سەرشانی و لە ئاستی ناوقەدیدا بە دەستێکی گرتبووی، کەوتبوە دوای. سوورە خێراکەی لەشی سنگی و شانەکانی وەرگێڕابوو بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ئەو شوێنە بێت کە بۆی دەچوو، بەشێکی عەباکەشی سەر هەواکە کەوتبوو، دەتوت تەوژمێکی با کاری تێکردوە، چمکەکەشی کە دەخولایەوەو لەسەر شێوەی پیتی S پێچی دەخواردەوە، دامێنە ئاوریشمینییە سوورەکەی دەردەخست کە بە زێڕ ئاڵدووز کرابوو.

ڕوخساری پیاوەکە هێمن و بێ هەستە، بەلام جۆرە گرژییەکی تێدایە، وەکو بڵێیت چاوەڕوانیی یان مەترسیی- ڕوودانی شتێکی کتوپڕ بکات، یان، ڕاستتر، بەو سەیرکردنە، بیەوێت چاودێریی ئارامیی هەموو دیمەنەکە بکات. هەرچەند بەم جۆرە سەیری پشتەوەی خۆی دەکات، بەلام هەموو لەشی هێشتا بەرەو پێشەوە چەماوەتەوە، وەکو ئەوەی کە هەر بەردەوام بێت لە سەرکەوتندا. باڵی ڕاستی ئەوەی کە عەباکەی پێنەگرتوە- هەتا نیوە بەرەو چەپ درێژکراوە بۆ ئەو شوێنەی کە دەبوایە

دەستگری پلیکانەکەی تێدابوایە، ئەگەر هەیبوایە، جووڵەیەکی بێ ماناو بڕاوە، ئەگەر وەکو هەوڵێکی سروشتی بۆ خۆگرتنەوە سەیر نەکرێت بەو دەستگرەی کە لەوێ نییە.

لە بارەی بابەتی سەیرکردنەکەیشیەوە، گومان لەوەدا نییە کە لاشەی ئەو قوربانییەیە کە لەسەر پشتییەکان دەبینرێت و هەر چوار پەلی وەکو خاچ درێژکراوەو سنگی بەرزو سەری بۆ دواوە شۆڕبۆتەوە، بەڵام لەوانەیە ڕووی لاشەکە بە هۆی یەکێك لەو ستونانەی کە لە دامێنی پلیکانەکەوەن لەبەرچاوی پیاوەکە شاراوە بێت.

دەستی ڕاستی ژنەکە لەبەر پێی ئەم ستونەدا لەسەر زەوییەکە کەوتوە.. پێوەندێکی ئاسنی قورس دەوری مەچەکە ناسکەکەی دەستی ڕاستی داوە. قۆڵی ژنەکە لە تاریکیدایەو بە تەنیا دەستی نزیك ئەو شتە خڕەوە دەبینرێت کە بناغەی ستوونەکەیە. زنجیرێکی کانزایی دەوری ستوونەکەی داوەو بەناو بازنەیەکدا تێدەپەڕێت کە بە پێوەندەکەوە بەستراوە، بەم جۆرە مەچەکەکە بە توندی بەستوونەکەوە بەستراوە. لەو سەری قۆڵییەوە، شانێکی خڕ، کە پشتییەکان بەرزیان کردۆتەوە، لەبەر ڕووناکیدان، هەروەها ملی و قوڕکی و شانەکەی دیکەیی و چاڵی بنباڵی قۆڵی درێژکراوی بۆ پشتی سەری و، مەچەکەکەی دیکەی، کە ئەویش بە هەمان شێوە لە نزیك ستوونێکی دیکەدایەو زۆر نزیکە لە بەشی پێشەوەی دیمەنەکە، وردەکاری پێوەندو زنجیرەکە لەم بەشەدا بە ئاسانی و بە باشی بەدی دەکرێت.

دەتوانین هەمان شت بڵێین لە بارەی ئەو زنجیرەی کە لە بەشی پێشەوەدا دەبینرێت، کە هەمان شێوەی هەیە بەڵام باریکترەو دووجار بە دەوری پاژنەیدا بادراوەو بەستوویەتیەوەو لە جووڵەی خستوەو لە بازنەیەکی بەهێزدا بەستراوە کە لە زەوییەکە چەقیوە. لە دووری یاردەیەك یان زیاتر قاچی ڕاستی بە هەمان شێوە بەستراوەتەوە، بەڵام پاژنەی ڕاستی باشتر دەبینرێت، پێیەکە ناسك و ڕێکوپێکە. لە هەندێك شوێندا زنجیرەکە گۆشتەکەی بریندارو لە هەندێك شوێندا چاڵی کردبوو، هەرچەند کە شوێنێکی زۆری نەگرتبووەوە. ئەڵقەکانی هێلکەیی و ئەستوورن و هەندەی گەورەیی چاوێك دەبن.

ئەڵقەکان لەو جۆرەن کە بۆ بەستنەوەی ئەسپ بەکاردێن و ئەو ئەڵقەیەی کە بەو مێخە زلەوە بەستراوە کە لە بەردی بناغەکە داکوتراوە، تەختە. لە دووری نزیکەی ئینجێکەوە، لێواری فەرشێك دەبینرێت کە تۆزێك هەڵگەڕاوەتەوە، بێگومان، لە

ئــەنجامی جوڵــە هەژێنــەرە، بــەڵام ســنووردارەکەی، قوربانییەکــە لــە هــەوڵی بەرگریکرندایە لە خۆی.

پیاوەکە هێشتا لە دووری سێ پێوە ڕاوەستاوەو بە سەرییەوە نوشتاوەوتەوە. پیاوەکە لە سەرە بە پشتاکەوتوەکە ڕادەمێنێت، لە چاوە ڕەشەکەی کە مکیاج گەورەتری کردوەو لە دەمە کراوەکەی کە دەڵێیت لە ناوەڕاستی قیژەیەکدایە. هەڵوێستەکەی وای لێدەکات کە بە تەنها لایەکی ڕووی ببینرێت و ڕوخساری دەرنەکەوێت، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت بڵێت کە پڕە لە شادییەکی زۆر، سەرەڕای هەڵوێستە ڕەق و بێدەنگ و بێ جووڵەکەی. پشتی بە ئاستەم چەماوەتەوە. دەستی چەپی، کە تەنها دەستییەتی کە دیاربێت، پارچەیەك کەرەستەی دوور لە لەشی گرتوە کە بریتییە لە پارچە قوماشێکی ڕەنگ و تاریك چمکێکی دەگاتە سەر فەرشەکەو، دەبێت دامێنی ئاڵدووزکراوی عەباکەی بێت.

ئەم تارماییە زلە ئەو لەشە ڕووتە دەشارێتەوە کە پەڵەیەکی سووری پێوەیەو بەسەر کەوانەی پێچی مەمکیدا بڵاوبۆتەوەو بە شێوەی جۆگەلەیەك درێژبوەتەوەو بەرەبەرە لە دابەشبووندا جۆگەلەکان باریك دەبنەوەو بەسەر پشتی و هەموو لایەکی جەستەی ڕەنگ کاڵیدا بڵاو دەبنەوە. جۆگەلەیەکی باریك و ڕاستی خوێن دەگاتە بنباخەڵی و لەوێوە بە درێژایی قۆڵیدا دەکشێت، هەندێکیش دەگەنە دەوری سکی و سمتی و سەرووی ڕانی و ڕایەڵەیەکی ترسناك دورست دەکەن و خێرا دەمەیێن. چوار دەزوولە خوێنیش بەرەو قوولایی پێکەوە گەیشتنی هەردوو لاقی، کە بە شێوەی پیتی 7 کراونەتەوە، دەڕۆن و پاشان ون دەبن.

جەستەکە، بە موە ڕەشەکەو سکە سپییەکەی و پێچە نەرمەکەی سمتەکانی و ناوقەدە باریکەکەی و مەمکەکانی، بە هۆی هەناسە خێراکەیەوە بەرزو نزم دەبنەوە، هەناسەکەی وردە وردە زەحمەتتر دەبێت، هێشتا ساغە. پیاوەکە، کە زۆر لە ژنەکەوە نزیکە، ئەژنۆیەکی خستۆتە سەر زەوی و زیاتر لێی نزیك دەبێتەوە. بە تەنها سەرەکە، کە قژێکی درێژی لوولی پێوەیە، ئازادی جووڵەکردنی هەیەو خۆی بادەدات و هەوڵ دەدات. دەمی ژنەکە بە گرژییەکەوە کراوەیەو کاتێك کە لاشەکە دەمرێت، خوێن بەسەر جەستە ناسك و گرژەکەدا تەوژم دەکات، چاوە ڕەشەکان ئەبڵەق دەبن و دەمەکە زیاتر دەکرێتەوەو، سەرەکەش بە توندی لە ڕاستەوە بۆ چەپ خۆی بادەدات و پاشان بە شێوەیەکی هێواشترو لە کۆتاییدا بەرەو دواوە دەکشێت و لە جووڵە دەکەوێت، تۆپەڵە قژە ڕەشەکەش بەسەر قەیفەکەدا پەخش دەبێتەوە.

لە سەرووی پلیکانە بەردەکەوە دەرگایەك دەکرێتەوەو بوار بە تیشکێکی زەردی بەردەوام دەدات کە بێتە ژوورەوەو تیایدا تارماییە ڕەشەکەی پیاوە عەبا لەبەرەکە دەوەستێت. پیاوەکە تەنها چەند پلەیەکی ماوە بگاتە سەرووی پلیکانەکە.

پاشان، هەموو دیکۆرەکە بەتاڵ دەبێت، ستوونە بەردینەکانی ژوورە سێبەر قەیفەییەکە لە هەموو لایەکەوە زیاد دەکەن و پلیکانە بێ دەستگرەکە لە بەرزبوونەوەدا پێچ دەکاتەوەو بەرە بەرە تەسکترو نادیارتر دەبێت و بەرەو شاراوەیی دەڕوات هەتا دەگاتە گومەزەکەو لەوێدا ون دەبێت.

لە نزیك لاشەکەوە، کە برینەکانی ساڕێژ بوون و ڕووناکییەکەی بەرەو نەمان دەچێت، دوکەڵێکی سپی، پێچاو پێچ، لە بخوردەکەوە بەرز دەبێتەوە. دوکەڵەکە لە سەرەتادا بە شێوەیەکی ئاسۆیی لوول دەخوات و پاشان ڕاست دەبێتەوەو تۆزێك بەرەو سەرەوە دەکشێت، ئنجا دەگەڕێتەوە بۆ دواوەو بەرەو تەوەری ئەو خاڵەی کە لێی جیابۆتەوەو تەنانەت زیاتریش بەرەو ڕاست دەڕوات، ئنجا بە پێچەوانەوە دەڕوات و جارێکی دیکە دەگەڕێتەوەو پاشان شێوەی پێچێکی ناڕێك و وەردەگرێت و بە شێوەیەکی ڕاست بەرەو بەشی سەرەوەی تابلۆکە دەکشێت.

## پەراوێز

*{تێبینی: ئالان ڕۆب-گرێ ساڵی *1922* لە بریست لەدایك بوە. پێش ئەوەی ببێتە بەڕێوەبەری نووسینی وێژەیی لە دەزگای ***Les Edition de Minuit***، وەکو پسپۆڕێکی کشتوکاڵی بۆ پەیمانگای نیشتمانیی ئاماری فەرەنسا کاری کردوە. لە پەنجاکاندا، پاش بڵاوکردنەوەی ڕۆمانەکانی ***The Eraser***، ***The Voyeur*** و ***Jealousy***، هەروەها بە هۆی دەقی فیلمی (ساڵی پار لە مارینبادا) وەکو سەرکردەی بزووتنەوەی "ڕۆماننووسە نوێیەکان"، کە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی ئەدەبی بوو، ناسرا. ئەم چیرۆکەی، کە لە ساڵی *1961*دا بڵاوکراوەتەوە، نموونەیەکە لەو هەوڵە ئەدەبییانەی کە ناوی دەنا "بە شت بوون ***Thingness***" کە هەوڵێك بوو بۆ سەیرکردنی شتەکانی دنیا وەکو شتی دەرەکی و ڕووکەش و ڕووت. ڕۆب-گرێی لەو باوەڕەدا بوو کە "جیهان نە گرنگەو نە بێمانا، بەڵکو، زۆر بە سادەیی، هەیە"}.

## سەرچاوە

***Alain Robbe- Grillet,***
***The Secret Room***
***French Short Stories,***
***Penguin Books, 1968***

# لە شیعری فارسییەوە

لە فارسییەوە: ئەمین گەردیگلانی

## فەرەیدون موشیری

### تاریك

مانگەشەو هیچ
خۆ تەنانەت تۆزە شۆقی لەنتەرێکیش
لەم ئەنگوستەچاوە هەتا هەتاییەدا
سۆڵەی نایە!
دەنگدانەوەی ترپەترپی هەنگاونانی حەسحەسێکی
سەرخۆش نەبێ،

### دەنگی پێی کەس

بێ دەنگیی لەرزۆکی ئەم شارە ناشکێنێ.
دەنگی قاقای سەرخۆشانە
بە بەژنی هیچ کوچەو گەڕەکێك ناهاڵێ.
–باری ئەو خەمەی بە کۆڵمدا دراوە،
لە کوێ دانێم؟
چرای مەیخانەی هەتاو کووژاوەتەوە.

### رنوو

تۆ لەبەر پەنجەرەکەدا دانیشتووی و
خەمباری ئەو درەختانەی
کە شان و ملی ڕووتەڵیان
لە ژێر لاقی بەفردا چەماوەتەوە.

من لەنێو تنۆکەی گەرمی فرمێسکدا،
-کە دادەڕژێ بەسەر دێڕی بێ ئۆقرەی ڕۆژنامەکاندا-
من لە ترۆپکی کێوە سەرسپییەکان و
کوێرە ڕێگا پیوارەکان،
چاوم دەکەوێ بە لەت و کوتی جەستەو
لەتکە جەرگ و خوێنی مەیو،
کە لە قووڵایی دەربەندە کڕوکپەکاندا
خەوتوون!
دارە شەکەتەکان گوێیان
بۆ قیژەو ناڵەناڵی "با" ڕاگرتوە.
-کەوا لە دەست تووڕەیی سووری بەفر هاوارێ دەکا-
من و تۆش زۆر بە کوڵ دەگرین،
لە ناخی دڵماندا
بەجێی قسەکردن.

# بێدەنگی نەماوە

شیعری: حەمید موسەدق

لێگەڕێ باران ببارێ
بارانی ڕازو خەیاڵان
لە قووڵایی شەوی ڕەشا،
ئەم شەوە بێ بڕانەوەیە.
لێگەڕێ باران ببارێ

ئێستا وەرە تەماشاکە
بارانە لەودیوی پێڵووی پەنجێرەوە

گویێ ڕادێرە
بۆ ویرە ویڕی دووپات بوونەوە
گویێ ڕادێرە لە شەویشدا
ئیتر بێ دەنگی نەماوە.

گویێ ڕادێرە بۆ سروودی نەرمی باران
کەوا ئەمشەو بە یادی تۆ
دەڵێی خرمەی پێی سوارانە.

ئەمشەو سەفای گریانی من
لێشاوی هەوری بەهارە
گریان نییە
ئەوە ڕەهێڵەی بارانە.

هاوار دەکەم:
"ئەرێ کەس بانگی نەکردم.
لە ڕۆخی کازیوەی شەوڕا؟!"
لە پشت پێڵووی پەنجێرەوە
چاوم کەوت بە شەوەزەنگ و کەوا قەترانییەکەی
چاوم لێبوو سروەی بەیان
ئەو بسکە ڕەش و قەترانەی شەوی سپی دەکردەوە.
لووتکەی گەردن کەشی کوێستانیش
لەو دوورانەوە،
لە شنینەوەی ڕووناکی خۆرەتاودا پێدەکەنی.

لە دوورە دەستەکانەوە
بارانێك دایکردبوو،
گۆپاڵ بارانێکی بە سام؛
کەنگێ دەستی دۆعای من دەبێتە لەمپەر

لەبەر ئەو لێمشتە قورس و سامناکەدا؟

ئەو لێمشتە
دواپین کۆڵەکەی ڕاگری ڕۆحم هەتا
کۆتایی شەوگاری ڕەش و ئەنگوستەچاو
ڕادەماڵێ.
"بەڵێ کەس بانگی نەکردم
لە ڕۆخی کازیوەی شەوڕا".

**سەرچاوە**

کتێبی (تا رزگاری) چاپی پێنجەم *1376*
بلاوکەرەوەی سیمرغ- تاران

# شیعری ئینگلیزی

## ویلیام باتلێر یەیتس




**وەرگێڕان: ئومێد وەرزەندە- بەختیار سەجادی**

### ویلیام باتلێر یەیتس (1939– 1865)[1]

ویلیام باتلێر یەیتس ساڵی *1865* لە شاری دابلین–ی ئیرلەندا چاوی بە ژیان هەڵێنا. سەرەتا لە قوتابخانەی هونەری[2] ئەو شارەدا وەکو قوتابیی بەشی شێوەکاری دەستی کرد بە خوێندن و، پاش ماوەیەك ئەوێی بەجێ هێشت و ڕووی هێنایە شیعرو ئەدەب. لە تافی لاوێتیدا هاتوچۆی یانەی سەروازانەکان[3]ی دەکرد، بەڵام خێرا خۆی لەو جۆرە شیعرە پارناسییە دەرباز کرد و دەستی کرد بە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە دەربارەی نەتەوەکەی و ڕەگەزو کولتوور و ئەفسانەکانی. سەرگەردانیی ئۆیسین

(1889)[4]، وەکـو یەکـەمین دیوانـە شـیعری گرنگـی یـەیتس نـاوی لێ ئـەبرێ، کـە لـە شـیعرێکی درێـژو گێڕانـەوەیی لەسـەر ئەفسـانەیەکی ئیرلـەندی و چـەند شـیعری تـر پێکـهاتوە. سـاڵی 1896 چـوە ڕیــزی سـوپای ڕاپەڕینـەوەو وەکـو پێشـڕەوی بزاڤـی ژیانەوەی ئیرلەندا و بە هاوکاریی خاتوون گرێگۆری[5] تیاتری ئەدەبیی ئیرلـەندی[6]ی پێك هێنا، کە دواتر ناوەکەی گۆڕاو بوو بە ئەدەبی تیاتر[7]. لەم ماوەیە بەدوا هونەر، هەستی بە هێزی نیشتمانپەرستی و لێکۆڵینەوەی زانستە ڕەمـزاوی و ناوەکییـەکان تێکرا تێمی ناوەندی سـەرەکیی بەرهەمـەکانی پێك دەهێنن. لـە سـاڵی 1892دا شـانۆی کۆنتس کاتلین[8]ی لە دابلین نوێنرا، کە بە یەکێ لە شانۆنامە سەرەکییەکانی دادەنرێ. عەشقی بێ کۆتـایی یـەیتس بۆ مادگـان[9]، کـە ئـافرەتێکی جـوان و شۆڕشـگێڕ بـوو، بێئاکام مایەوەو، ئەمەش یەکێکی دیکە لە مۆتیفەکانی شیعری پێك دێنێ. یەیتس کە سەرەتا وەکو دوا شاعیری مەزنی ڕۆمانتیکی دادەنرا، بەرهەمە گرنگەکانی لە قۆناخی سێیەم و چوارەمـی ژیـانی ئـەدەبی خۆیدا خولقاند، ئەو قۆناخـەی کـە ڕەنـگ و بۆنـی مۆدێرنـیزم، هێمـاخوازی[10] و میتافیزیکیـان پێـوە دیــارە. لــە سـاڵی 1922 تـا 1928 سێناتۆری حکومـەتی ئـازادی ئیرلـەندا[11] بوو و، ساڵی 1923 خـەڵاتی نۆبێلـی ئـەدەبی پێی بەخشرا.

یەیتس خاوەنی چەندین دیوانە شیعرو شـانۆنامەو لێکۆڵینـەوە دەربـارەی ڕەگـەزو شارستانێتی و ئەفسانەکانی ئیرلەندایەو بەرهەمە سـەرەکییەکانی بریتین لـە: تیشـکی سێلتی (1893)[12] دەربارەی شارستانێتیی سێلتی، کە لە کۆمەڵە چیرۆکێك پێکهاتوەو باسی بڕوای مرۆڤی ئیرلەندی بە سیحرو ڕۆح و ئەفسانە دەکات. بـای نێـوان زەلـەکان (1899)[13] چـەندین شیعری بزوێنـەرو قووڵـی لـەخۆ گرتوە. ڕوانینێـك (1925)[14]، قـەڵا (1929)[15]، مانگی تەواوی مارس (1935)[16] و شیعری مۆدێرن (1936)[17] بە پێشنیاری زانکۆی ئاکسفورد بە بەرهەمە سەرەکییەکانی یەیتس دادەنرێن.

## سەفەر بۆ بیزانس

*1*

هیچ وڵاتێك بۆ پیرەپیاوان نییە.
گەنجەکان دەست لە ناو دەست، باڵندەکان بە درەختەوە،
-جیلی سەرەمەرگ- لەگۆرانی دان،
ماسییە سلمۆنەکان، زەریاکانی پڕ لە ماسیی خاڵ خاڵ، قەوزە،

هەموو لە سەرانسەری هاویندا ستایشی ئەوە ئەکەن
کە دێتەدی، لە دایك ئەبێ، یاخود ئەمرێ.
ئەمانە کە ئەم مووزیکە هەستئاسایە داگیری کردوون
کەڵەپیاوانی ئاوەزی هەتا هەتاییان لە بیر چۆتەوە.

*2*

مرۆڤی بە ساڵاچوو هیچ نییە جگە لە پارچە زبڵێك،
قاتێکی شڕ لەسەر گۆچانێك،
مەگەر ئەوەی ڕۆح بێتە چەپڵەو گۆرانی بڵێ،
بەرزتر بیڵێتەوە، بۆ درزەکانی ناو جلە ناهەتاییەکەی،
گەرچی ئەم گۆرانییە ناچێتە نێو هیچ قوتابخانەیەکەوەو،
هەر تەنیا یادمانی شکۆکەی خۆی ئەخوێنێتەوە،
کەواتە، زەریاکانم پێواوەو هاتووم
بۆ شارە پیرۆزەکەی بیزانس.

*3*

ئەی زانایانی نێو ئاگری پیرۆزی خوا
کە لە موازیکە دێرینەکانی دیوارەکاندا جێ نشینن،
ئەی پیاوە پیرۆزەکانی سەردەمەکان،
لەنێو ئاگری پیرۆزەوە وەرن و،
ببنە مامۆستای سترانبێژی ڕۆحی من،
دڵم بەرەو لای خۆتان بەرن، ئەو دڵەی نەخۆشی ئاواتەو،
بە حەیوانێکی سەرەمەرگەوە بەستراوەتەوە کە نازانێ چییەو چلۆنە،
کۆم کەنەوەو بمهاوێژنە نێو ئەو هونەرمەندییە نەمرو تاهەتاییەوە.

*4*

کە لە سروشت دابڕام،
ئەم شێوە جەستەییەم لە هیچ شتێکی سروشتی تر وەرناگرمەوە،
جگە لەو ڕوخسارەی کە ئاسنگەرە یۆنانییەکان
لە زێڕی چەکوش خواردو چێیان کرد
تاکو ئەمپراتوری خەواڵوو بێدار کەنەوە؛

یان لەسەر لقێکی زێڕین دادەنیشم و
بۆ لۆردو خاتوونەکانی بیزانس گۆرانی ئەڵێمەوە،
گۆرانیی ئەوەی ڕابوردو ئەوەی ڕادەبرێو، یاخود دێت.

## Sailing to Byzantium

*1*

*That is no country for old men. The young*

*Fish, flesh, or fowl, commend all summer long*
*Whatever is begotten, born, and dies.*
*Caught in that sensual music all neglect*
*Monuments of unageing intellect.*

*2*

*An aged man is but a paltry thing,*
*A tattered coat upon a stick, unless*
*Soul clap its hands and sing, and louder sing*
*For every tatter in its mortal dress,*
*Nor is there singing school but studying*
*Monuments of its own magnificence;*
*And therefore I have sailed the seas and come*
*To the holy city of Byzantium.*

*3*

*As in the gold mosaic of a wall,*
*Come from the holy fire, perne in a gyre,*
*And be*

*Consume my heart away; sick with desire*

*And fastened to a dying animal*

*It knows not what it is; and gather me*

*Into the artifice of eternity.*

*4*

*Once out of nature I shall never take*

*My bodily form from any natural thing,*

*But such a form as Grecian goldsmiths make*

*Of hammered gold and gold enamelling*

*To keep a drowsy Emperor awake;*

*Or set upon a golden bough to sing*

*To lords and ladies of Byzantium*

*Of what is past or passing, or to come.*

## لیداو قوو

**زرمەیەك لە ناكاو: باڵەمەزنەكان بەسەر سەری كچە پەرێشانەكەوە**
**بەردەوام لە كوتاندا بوون؛ شلكەڕانی نغرۆی نازی پەڕە ڕەشەكان بوو؛**
**گەردنی گیرۆدەی دەنووكی بوو؛**
**سنگی لە سەر سنگی نائومدێی كچە نا.**
**قامكە نادیارو ترساوەكانی**
**چلۆن ئەو شكۆ پەڕئاژنە لە ڕانە سستەكانی دەرباز ئەكەن؟**
**لەشی چلۆن ئەتوان ئەو دڵە نامۆیە هەست پێ بكا كە لێ ئەدا؟**
**هەر ئەو لەشەی بەر هێرشی سپی كەوتووە!**

**لەرزینی ناوقەد لەوێ**
**دیواری ڕووخاندو، سرمیچ و قەڵای سووتاوی لێكەوتەوە.**
**پاشان ئاگامێمنۆن مرد.**
**لە گیرۆدە بوونێكی وەهادا،**
**لە ئاوەها بن دەستە بوونێكدا، بن دەستی خوێنی حەیوانیی هەوا،**

ئاخۆ ژنە زانیاری و هێزی پێکەوە لەبەر کردبێ
پێش ئەوەی ئەو دەنووکە بێ بەزەییە بیخاتە خوارێ؟

## *Leda and the Swan*

*A sndden blow: the great wings beating still*
*Above the staggering girl, her thighs caressed*
*By the dark webs, her nape caught in his bill,*
*Lie holds her helpless breast upon his breast.*
*How can those terrified vague fingers push*
*The feathered glory from her loosening thighs?*
*And how can body, laid in that white rush,*
*But feel the strange heart beating where it lies?*

*A shudder in the loins engenders there*
*The broken wall, the burning roof and tower*
*And Agamemnon dead.*
*Being so caught up.*
*So mastered by the brute blood of the air,*
*Did she put on his knowledge with his power*
*Before the indifferent beak could let her drop?*

## لەنێو منداڵانی قوتابخانەدا

*1*

بە دەم پرسیارەوە ڕێڕەوە درێژەکەی قوتابخانە ئەپێوم،
ڕاهیبەیەکی بە ساڵاچووی میهرەبان بە ڕووبەندێکی سپییەوە وەڵام ئەداتەوە؛
منداڵان لێرە فێری حسێب کردن و سروود ئەبن،
فێری کتێب خوێندنەوەو مێژوو،
بە نوێترین شێوە فێر ئەبن بڕین و بدروون و،

لە هەموو شتێكدا ڕێك و پێك بن– چاوانی منداڵان،
بە سەرسوورمانێكی سەرپێییەوە، زەق ئەڕواننە
پیرە مێردێكی شەست ساڵەی ناسراو و دەم بە بزەوە.

*2*

لە خەونی جەستەیەكی لیدایی دام،
چەماوە بەسەر ئاگرێكی ڕووەو كوژانەوە،
ئەو چیرۆكەی دەربارەی سەركۆنەیەكی توند گێڕایەوە،
یان ئەو ڕووداوە بێبایەخەی سەردەمی منداڵێتی گۆڕی و كردیە تراژیدیا–
گێڕایەوە، دەتگوت بە هۆی هاودڵیی لاویتێییەوە
سروشتی هەردوكمان لە گۆیەكدا كۆ بۆتەوەو،
یان تەمسیلەكەی ئەفلاتوون بگۆڕین و بیكەینە
زەردێنەو سپێنەی یەك هێلكەیەك.

*3*

كە بیر لەو خەم و تووڕەییە دەكەمەوە،
سەیری یەك دوو منداڵێ دەكەم و ڕادەمێنم،
بڵێی ئەویش لەو تەمەنەدا ئاوەها بووبێت–
چونكە تەنانەت كچانی قووش
ئەتوانن لە میراتی هەر دۆمێك خاوەن بەش بن–
بڵێی ئەویش هەر هەمان ڕەنگی لەسەر گۆناو قژ بووبێت،
ئەو شوێنەی دڵم شەیداو بێقەرار دەكات:
بە وێنەی منداڵێكی شاداب لە بەرامبەردا ڕادەوەستێ.

*4*

وێنەی ئێستای لە مێشكم دا شەپۆلان دەدا–
ئاخۆ قامكی كواترۆ چنتۆ[18] توانیبێتی قووڵیی گۆنای بنەخشێنێ؟
ئەو گۆنایەی چما بای سەرخۆش كردووەو،
یان، لە باتیی گۆشت سێبەری خواردوە؟
گەرچی من لە ڕەگەزی لیدایی نەبووم،
بەڵام سەردەمانێك پەڕو باڵێكی جوانم هەبوو ئیتر بەسیەتی،
باشتر وایە پێبكەنم بە هەر شتێ كە پێ ئەكەنێ و،

پیشان بدەم داهۆڵێکی پیریش ئەتوانێ ئاسوودە بێ.

*5*

چ گەنجە دایکێك، ئەو پارچە گۆشتەی لە داوێنی دایە
هەنگوینی نەوە خەیانەتی دەرهەق کردووەو،
(منداڵ) دەبێ بخەوێ، بقیژێنێ، هەوڵی هەڵاتن بدات،
بەو شێوەیەی کە بیرەوەری یان دەوا بڕیاردەدات،
لەو کاتەدا کە بیر لە کوڕەکەی ئەکاتەوە،
ئەو کوڕەی شەست و بگرە زۆر زستانی دیکەش بە سەریەوە ڕواوە،
قەرەبووکردنەوەی ئێشی لە دایك بوونەکەیەتی؟
یان، دڵنیا نەبوونە لە داهاتووەکەی؟

*6*

ئەفلاتون سروشتی تەنیا وەکوو دەرکەوتەیەك ئەبینی
کە لەسەر واقیعی مۆتەکە ئاسای چشتەکان گەمە ئەکا؛
ئەرەستوش، بە بڕوایەکی پتەوترەوە،
لەسەر خۆڵەمێشی شای شاکان کەلاێن ئەکا،
فیساغورسی ڕان زێڕین و بەناوبانگ
قامکی نایە سەر ژێ و ئارشەی ڤیۆلۆن و
ئەستێرەکان چڕییان و پەرییە کەمتەرخەمەکانی شیعر بیستیان:
جلی شڕ لە سەر گۆچانی پڕتووکاو بۆ ترساندنی باڵندەیەك.

*7*

ڕاهیبەکان و دایکەکان وێنەی خەیاڵی پەرستشت ئەکەن،
بەڵام ئەو وێنانەی تیشکی مۆم ڕوونیان ئەکاتەوە
ئەوانەی نین گیان ئەبەخشنە یادەوەرییەکانی دایکێك؛
جگە لە مەزارێکی مەڕمەڕین یان برۆنزین هیچیان دەست ناکەوێ.
سەرەڕای ئەمانەشن دیسانەوە، دڵشکێنی ئەکەن–
ئەی ئەو حوزوورانەی کە میهرو، بەزەیی و خۆشەویستی دەیناسن و،
ئەو هەموو شکۆ ئاسمانییەش ئاماژەی بۆ دەکا–
ئای، گاڵتەکەرە خۆ لەدایك بووەکانی ئاکاری مرۆڤ.

*8*

ئازار لەوێدا چرۆ ئەبەستێ و دێتە سەما
کە لەش بۆ شادکردنی ڕۆح زامدار نەبێت؛
نە جوانی لە نائومێدییەکەی خۆی لە دایك ئەبێت و،
نە زانایی چاو لێڵیش لە مۆمی نیوە شەو؛
ئەی داربەڕو، ئەی چرۆ بەخشی ڕیشە ئەستوور،
تۆ گەڵای، شکۆفەی، یان ناوقەدی؟
ئەی ئەو جەستەیەی لەگەڵ مۆسیقا دەشنێیتەوە، ئەی نیگای ڕووناکی بەخش،
چلۆن ئەتوانین سەماکەر لە سەما جیابکەینەوە؟

## *Among School Children*

*1*

*I walk through the long schoolroom questioning;*
*A kind old nun in a white hood replies;*
*The children learn to cipher and to sing,*

*To cut and sew, be neat in everything*

*In momentary wonder stare upon*
*iling public man.*

*2*

*I dream of a Ledean body, bent*
*Above a sinking fire, a tale that she*
*Told of a harsh reproof, or trivial event*

*Told, and it seemed that our two natures blent*
*Into a sphere from youthful sympathy,*
*Or else, to alter plato*

*Into the yolk and white of the one shell.*

*3*

*And thinking of that fit of grief or rage*

*For even daughterd of the swan can share*

*Something*

*And had that colour upon cheek or hair,*

*And thereupon my heart is driven wild:*

*She stands before me as a living child.*

*4*

*Did quattrocento linger fashion it*

*Hollow of cheek as though it drank the wind*

*And took a mess of shadows for its meat?*

*And I though never of Ledaean kind*

*Better to smile on all that smile, and show*

*There is a comfortable kind of old scarecrow.*

*5*

*What youthful mother, a shape upon her lap*

*Honey of generation had betrayed,*

*And that must sleep, shriek, struggle to escape*

*As recollection or the drug decide,*

*Would think her son, did she see that shape*

*With sixty or more winters on its head,*

*A compensation for the pang of his birth,*

*Or the uncertainty of his setting forth?*

*6*

***Plato thought nature bitt a spume that plays***
***Upon a ghostly paradigm of things;***
***Solider Aristotle played the taws***
***Upon the bottom of a king of kings;***

***Fingered upon a fiddl***
***What a star sang and careless Muses heard:***
***Old clothes upon old sticks to scare a bird.***

*7*

***Both nuns and mothers worship images,***
***But thotus the candles light are not as those***
***That animate***
***But keep a marble or a bronze repose.***
***And yet they too break hearts O Presences***
***That passion, piety or affection knows,***
***And that all heavenly glory symbolise-***
***o***

*8*

***Labour is blossoming or dancing where***
***The body is not bruised to pleasure soul,***
***Nor beauty born out of its own despair,***

***O***
***Are you the leaf, the blossom, or the bole?***
***o body swayed to music, O brightening glance,***
***How can we know the dancer from the dance?***

## پەراویزەکان

*1-William Botler Yeats (1865 - 1939).*

*2-School of Art.*

*3-Rhymers Club.*

*4-The Wandering of Oisin (1889).*

*5-.Lady Gregory (1852 - 1932).*

*6-Irish Literary Theater.*

*7-Abbey Theater.*

*8-The Countess Cathleen (1892).*

*9-Maude Gonne*

*10- Symbolism*

*11-Irish Free State.*

*12. The Celtic Twilight (1893)*

*13-The Wind among the Reeds (1899).*

*14- A Vision (1925).*

*15- Tower (1929).*

*16- A full Moon in March (1935).*

*17-The Oxford Book of Mode in Verse (1936).*

18–هێمایە بۆ هونەرمەندانی شێوەکاری سەدەی پانزدەی ئیتالیا.


کۆپەر نیکۆس

د. بەهرام میقدادی

# ئینسایکلۆپیدیای زاراوەی ڕەخنەی ئەدەبی

له فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

## شۆڕشی کۆپەرنیکی

**ف: انقلاب کوپرنیکی**

**ع: الثورة الكوبرنيكية** *Copernican Revolution*

نکیۆلاس کۆپەرنیکی ئەستێرەناسی لەهستانی، لە سەرەتای سەدەی شانزەدەهەمدا، به خستنەڕووی تیۆرەکەی خۆی سەبارەت بە دۆخی ئەستێرەکان و هەسارەکان لە فەزاداو جووڵانەوەیان، شۆڕشێکی لە بواری گەردووناسیدا هێنایە گۆڕێ. ئەو بە پێچەوانەی بیروباوەڕی باوی سەردەمەکەیەوە؛ ڕایگەیاند کە هۆی بزووتنەوەی خۆرو ئەستێرەکان؛ سوورانەوەیان نیە بە دەوری زەویدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە؛ خۆرو ئەستێرەکان جێگیرن و ئەوە زەوی و هەسارەکانە کە لە خولگەی جیاوازدا بە دەوری خۆردا دەسووڕێنەوە.

بەم جۆرە ئەو سەنتەرێتیی جیهانی لە زەوییەوە گۆڕی بە خۆرو ئەمەش پێچەوانەی تیۆرە باوەکانی ئەو سەردەمە بوون سەبارەت بە ئەستێرەکان و بیروباوەڕی خەڵکی ئەوکاتە کە زەوییان بە سەنتەری نەگۆڕی دونیا ئەژمارد.

ئەم شۆڕشە کە بە گۆڕانکارییەك لە سیستمی فیکریدا لە قەڵەمدەدرا، دواتر لە لایەن فەیلەسووفانی ترەوەو لە بواری دیکەی زانست و فەلسەفە، یان بە دەربڕینێکی دی لە سیستمی فیکریدا بەکاربرا. لەو فەیلەسووفانەش ئیمانۆییل کانت. ئەو لە تۆژینەوە خودگەراییەکانی مرۆڤداو لە بینینی دیاردەکاندا ئەوەی خستەڕوو کە هیچ گوتە (مقولە)یەك نیە کە چەند ڕوویەکی بینینی نەبێت.

لێرەشدا هەروەکو تیۆرەی کۆپەرنیك ئەوە بینەرە کە دەسووڕێتەوەو بینراو جێگیرە، هەروەکو ئەستێرەکان، کەواتە دەرکەوتە بەش بەشەکانی دیاردەیەك، لە کات و شوێنی جیاوازدا، لە ڕێی ئەم خودە چەند ڕووەوە وەکو ڕاستییەکی بابەتیانەی

دیاردەکە پێکدێن و دەیخولقێنن. کانت وای دادەنا کە بونیادێکی جیهانی لە خودی مرۆییدا هەیە، کە لە پشت ئەو خودگەراییە جیهانیەوە، خودگەرایی کەلتووری هەیە کە شتێکە بە دەست دەهێنرێ و هەر کەسێك دەتوانێت بە دەستی بهێنێت.

بە گۆڕانی کەلتوور و دۆخیش، ئەم خودگەراییە دەگۆڕێن؛ بێگومان بە ڕەچاوکردنی توانای خەیاڵی ئادەمیزاد، دەتوانێ لە کاتی خوێندنەوەی دەقێکدا ئەم کارە لە هۆشی خۆیدا ئەنجام بدات.

تەواوی ئەم باس و لێکۆڵینەوانە لە کۆتاییدا دەگاتە چەمکی ڕێژەگەرایی (ڕێژەگەرایی کەلتووری، مێژوویی و بەکاربردن) و پێرسپێکتیڤیزم *Perspectivism*. لێرەدا لێکدانەوەی هەر ڕاستییەك، بەندە بە پێگەی بینەرو هەروەها بەهاو پێشینەکانی هۆشیاریی بینەر سەبارەت بە ڕاستییەکان، هەڵبەت ئەمەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی دەگۆڕێت. بەم پێیە، تەنها توانای ڕەخنەو لێکۆڵینەوە دروستی و نادروستیی لێکدانەوەیە، چونکە کەسە جیاوازەکان لەسەر بناغەی پێش هۆشیارییەکانی خۆیان لێکدانەوەی جیاوازیان بۆ مانای یەك دیاردە هەیە. ئەم خاڵە سەبارەت بە ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی "نووسراو"یش دروستە. "مانا" پێشتر لە دەقدا دیاری نەکراوە، بەڵکو مانا لە هۆشی بە ئاگادا دروست دەبێ. هەر لەبەر ئەمە، کەسە جیاوازەکان لە کات و شوێنە جیاوازەکاندا، لێکدانەوەی جیاوازیان بۆ یەك دەق دەبێت. کەواتە "نووسراو" وەکو خۆر وایە لە شۆڕشی کۆپەرنیکیداو خوێنەریش لە لێکدانەوەو شیکردنەوەی ماناداا؛ وەکو زەوی وایە. بە دوای ئەم باسانەدا؛ بۆچوونی وەکو مەرگی نووسەرو ڕۆڵی خوێندنەوە لە شیکردنەوەی ماناداا دێنە پێشێ. هەڵبەت ڕیشەی ئەم بۆچوونانە دەچێتەوە سەر تیۆرەکانی فرۆیدو لاکان. هەروەکو کۆپەرنیك سەلماندی کە زەوی سەنتەری جیهان نیە، کەواتە "نەست"یش لەم قەڵەمڕەوی فەرمانڕەواییەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ زۆر کاریگەرەو ئەم "نەست"ەش لەژێر کاریگەری ڕابردوو، ئەزموون، کەلتوورو منالێیدایە. لاکانیش لە ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی دەروونشیکاریی فرۆیددا دەڵێت: "خودی نائاگا"ش وەکو "زمان" بونیادی خۆی هەیەو لە پێکهێنانی خودگەراییشدا؛ زمان ماڵی سەرەکیی مرۆڤە، بەڵام "زمان" بە تەنها گوتراو یان نووسراو نیە، بەڵکو بە گوێرەی تیۆرەکانی فۆکۆ، زمان مێژوو و کەلتوورو سیاسەت و.. ئەگرێتە خۆی. زمان بریتیە لە کۆمەڵێك جیهانبینیی جیاواز. فۆکۆ ئاماژە بۆ "ئەپستیم" دەکات کە بەیانکەری تەواوی پەیوەندی و


فرۆید

یاساکانی گۆڕانی شێوەی یەکەی بەکارهێنانەکانی گوتارە لەهەر ساتێکی زەمەنیدا. بە گۆڕانی "ئەپستیم" بەهاکانیش لە کۆمەڵگەدا دەگۆڕێن لە ژێر کاریگەریی پێش هوشیارییەکان و بەهاو تواناکانی خوێنەرو ڕەخنە نووسدان. کەواتە بە گۆڕانی مۆدێلەکانی ڕەخنە، شیکردنەوەی ماناش دەگۆڕێت. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە؛ شۆڕشی کۆپەرنیکی لە کارەکانی کانت و فرۆیدو لاکان و تەنانەت سۆسۆریشدا لە گوزارشتکردن و بیانووهێنانەوە بۆ تیۆرەکانی خۆیاندا دەبینرێ، کە هەموویان لە ڕەخنەی ئەدەبی و شیکردنەوەی مانایی کاری ئەدەبیدا بەکاربراون.

دواجار دەبینین کە لە ڕەخنەی ئەدەبیدا؛ بە پەیدابوونی سۆسۆر چاخی میتافیزیکی ئامادەبوون کۆتایی دێت و بە دوایدا تەواوی میتۆدەکانی شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەو لێکدانەوە، کە لەسەر بناغەی یەك سەنتەری دامەزراون؛ دەگۆڕێن، بە تایبەتیش دەق یا "نووسراو" کە چیدی سەرچاوەو سەنتەری مانا نیەو، شیکردنەوەی مانایی دەق لە سەنتەرێتیی جێگیرو هەروەها لە جێگیرە خودناسیەکان جیادەبێتەوەو کۆمەڵێك فاکتەری جۆراوجۆر لە شیکردنەوەی مانادا بەشدار دەبن. ئەمەش هەمان سەنتەرێتی نەمانی شۆڕشی کۆپەرنیکیە لە ڕەخنەی ئەدەبیدا.

## پیاچوونەوە

**ف: بازنگری** *Revisionism*

**ع: التعدیلیة**

هارۆڵد بلۆم لە تیۆرەکەی خۆیدا کە پیاچوونەوەیە (یان دەشکرێ بڵێین ڕاستکردنەوە) دەڵێت: ئافراندنی شیعر ئەنجامی ململانێیەکە کە لە نێوان شاعیری هاوچەرخ و پێشڕەوەکەیدا ڕوودەدات. پێشڕەویش کەسێکە کە زووتر یاساکانی شیعرو شاعیریی دۆزیوەتەوە. ئەو دەڵێت: شاعیری بەهێز کەسێکە کە بۆ دۆزینەوەی شێوازو شێوەی خۆی؛ پەنا ناباتە بەر پێشڕەو. بلۆم دەڵێت کە بیرۆکەی ئەم تیۆرەیەی لە کتێبی "تەوتەم و تابوو"ی فرۆیدەوە وەرگرتوە. فرۆید لەم کتێبەیدا سەرچاوەی کەلتووری مرۆڤایەتی لە ڕێورەسمێکدا دەبینێتەوە کە ناوی جەژنی تەوتەمەو تیایدا منالان باوکانیان لەتوپەت دەکەن و دەیانخۆن. بلۆم ئەم بەشە بە گرنگترین کاری نووسراوی فرۆید دەزانێت، ئەمەش لە شاعیری هاوچەرخ و پێشڕەو دەچێت، کە تیایدا شاعیری هاوچەرخ بە شێوەیەکی سیمبۆلیك پێشڕەوەکەی خۆی لەناو دەبات؛ تا کارێکی نوێ بخولقێنێت.

ئەم ململانێیە لە نێوان شاعیری هاوچەرخ و پێشڕەودا دەشێ هەم لە شێوەی میكانیزمەكانی بەرگریی دەروونیدا بێت و هەم لە شێوەی وشەسازیدا. ئەم ڕێگایانەش بە تەنها بۆ ڕزگاربوونە لە دەسەڵاتی پێشڕەو. لەبەر ئەوەی شاعیری هاوچەرخ هەرگیز ناتوانێ خۆی بە ئازاد لەو كاتە درەنگە بزانێت كە تیایەتی، چونكە شاعیری پێشڕەو زۆر بەر لەو، شتە گرنگەكانی وتوەو شتێكی ئەوتۆی بۆ شاعیری هاوچەرخ نەهێشتۆتەوەو، ئەوەی شاعیری هاوچەرخ دەتوانی بیكات هەر ئەوەیە كە خوێندنەوەی هەڵە بۆ شیعری شاعیرە پێشڕەوەكە بكات تا بتوانێ فەزای پێویست بۆ خولقاندنی كارەكانی خۆی بەدەست بهێنێت. بلۆم شیعر بە كۆمەڵە وشەیەك دەزانێت كە ئاماژەن بۆ كۆمەڵێك وشەی دی و، هەر شیعرێك بە دەروونێكی شیعرو هەر خوێندنەوەیەكیش بە دەروونێكی خوێندنەوە دەزانێت. ئەو دەڵێت شیعر بەر لە زەمەن هاتۆتە ئاراوەو شیعرێك بە شیعر دادەنێت كە لە ڕۆحەوە وەرگیرابێت. هەر لەبەرئەمەشە كە نرخێكی تایبەتی بۆ شاعیرانی ڕۆمانتیك دادەنێت. شێوازی هەڵسوكەوتی بلۆم لەگەڵ شیعری "بەهەشتی لە دەست چوو"ی میلتۆندا زۆر سەرنجڕاكێشە. ئەو شەیتان بە جۆرە شاعیرێكی هاوچەرخ لە قەڵەم دەدات كە بەسەر پێشڕەوەكەی خۆیدا كە یەزدانە یاخی بوە؛ لەبەرئەوەی یەزدان بەر لە شەیتان بنەماكانی دۆزیوەتەوەو، هیچ شتێك لە بەردەم شەیتاندا نەماوە بیكات تەنها ئەوە نەبێت كە لاسایی یەزدان بكاتەوە.

ئەم تیۆریەیەی بلۆم لە ڕەخنەی نوێدا، بایەخێكی تایبەتی هەیەو كەسانێكی زۆریشی بەلای خۆیدا ڕاكێشاوە.

## تانوپۆی لێكترازاوی ئەدەب
## لە چاخی نوێدا

**ف/ بافت گسیختەی ادبیات در عصر حاضر**

***Frgmentary Nature of Literature in Modern Era***

**ع/ النسیج المفكّك للأدب في العصر الحاضر**

كەمتر هونەرمەندێكمان بەرچاو دەكەوێ كە سكاڵا لە هەژاریی زمان نەكات و، بۆ لەناوبردنی ئەم هەژارییە دەبێ چی بكرێ و دەبێ بایەخ بە چ ژانرێكی ئەدەبی بدرێ؟ ئایا هۆیەكەی ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە هەست و سۆزو هزرەكان پەرتن و وشە


هارۆلد پینتەر

ناتوانێ دەرکیان بکات و گوزارشتیان لێ بکات؟ کەواتە چ جۆرە نووسینێك دەتوانی ئێمە بەرەو کەنارەکانی ئەم جۆرە هەست و سۆزانە بەرێت تا دەرك و تێگەیشتنێکی رێژەیمان دەست بکەوێ؟

ئاشکرایە کە دۆزینەوەی وەلامێکی لەم جۆرە پەیوەستە بە چاوپیاخشانەوەیەکی خێرا بە دوو فاکتەری تری گرنگداو ئاخۆ کامیان پێش ئەوی تریان دێت، واتە شێوە یا ناوەرۆك (یان مانا) و ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنی "فاکتەری سنوور"، بەو مانایەی کە کامیان بێ کۆتایی و بێ سنوورە؟ دەرەنجامی ئەم بێ سنوورییەش چیە؟

بە چاوخشاندنێك بە کارە ئەدەبیەکاندا؛ هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا، لە نووسینەکانی نووسەرە گومناوەکانەوە تا ئاسەوارەکانی ئەم سەردەمە، بە تایبەتیش (بۆ نموونە) لە شانۆنامەکانی هارۆلد پینتەردا، ئەو خالە روون دەبێتەوە کە هێندەی پەیوەندی بە ماناوە هەبێت؛ ئەم کارانە لە گەوهەردا لە سەروو ئەم دوو بابەتە گشتییەوە؛ واتە چاکەو خراپە یان جەستەو رۆحەوەن.

ئایا ناکرێ بلێین مانا سنووردار دەبێت لەو دوو بابەتەداو، ئەم سنووردارێتییەش دەبێتە هۆی لاوازیی مانا؟ هەربۆیە تاقە مەیدانی شایان بە رامان و خوردبوونەوە شێوەیەکە لەو لاوازییە دوورە، لەبەرئەوەی جۆری دەربرین و مامەلەکردنی تازە لەگەڵ بابەتێکی لەوەوبەر زانراودا، کرانەوەو روانینێکی نوێ دەوروژێنێت و بەدەستهێنانی ئەم روانین و تێگەیشتنەش، کە بە لای هەستدا دەشکێتەوە نەك مەزەنە، دەبێتە مایەی چێژ، نەك فێرکردن. جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە جۆری مامەلەکردنەکە لەگەڵ شتێکدا کە ئاشنایە یان پێشتر زانراوە، گۆرینی ئەو شتەیە؛ نەك دۆزینەوەی شتێکی تازە، بەلکو داهێنانە لە جۆری تێگەیشتن و بینینی ئەو شتەدا کە سەیر کراوە بەلام (نەبینراوە). هەر بۆیە وتنەوەی دووبارەو چەندبارەی "شتە زانراوەکان" کارێکی بێهودەیەو نەك هەر نابێتە مایەی فێرکردن، بەلکو دەبێتە مایەی تەمەلی و بێزاربوونیش.

لە سەرێکی ترەوە، هونەر پەیرەوی لە پرنسیپی فرەمانایی دەکات و ئەگەر فێرکردن ببێتە ئامانج و مەبەست، ئەم پرنسیپە لەق دەبێ و ئەو روانینە چەند رەهەندی و چەند ماناییە دەبێتە روانینێکی سنووردارو تاکرەهەندو تاکماناو سەرەنجامیش دەبێتە مایەی نەهێشتنی ئەدەبیەتی ئەدەب، بە مانایەکی دی دەبێتە شتێکی تر نەك ئەدەب. لە کاتێکا ئەوەی وەکو ئامانج بۆ هونەر دادەنرێ ئامانجێکە کە نەك لە ماناوە، بەلکو لە شێوەوە پەیدا دەبێت و خاوەنی فرەماناییەو هۆکارێکە کە دەبێتە مایەی چێژی ئەدەبیش.

بەڵام ئاخۆ ئەو چێژە ئەدەبیە چیە؟ ئایا هەمان ئەو چێژە هەمەپەسەندەیە کە لە نێو خەڵکدا بوە بە نەریتێك؟ یان شتێکی ترە؟

ئاشکرایە کە چێژی ئەدەبی شتێك نیە کە نەریت بێت، بەڵکو شتێکە کە لە ئەنجامی خوێندنەوەی دروست و مامەڵەکردنەوە پەیدا دەبێت. بەو مانایەی کە هونەری ڕاستەقینە هۆشی سست و تەوەزەل بێدارو چالاك دەکات و بۆ بیرکردنەوەو بزاوت هانی دەدات. ئەمەش دەبێتە هۆی ڕۆشنکردنەوەو ڕوانینێکی وەها کە مایەی دەرك و تێگەیشتنی مەسەلەکانە.

لەو جۆرە ئەدەبییانەی کە لە ئەدەبی هاوچەرخدا بەرچاو دەکەوێ، کاری نووسەرانێکی دیاری وەکو تی. ئێس. ئێلیوت و فۆکنەر.. و لە سەروو هەمووشیانەوە کافکایە، کە تانوپۆیەکی لێکترازاویان هەیە. بە دەربڕینێکی دی، جۆرێك لە لێکترازان لەم کارانەدا دەبینین کە نووسەرەکەی بە ئەنقەست ئەنجامی داوە تا دەربڕی ئەو پەرتی و لێکترازانەی ژیانی ڕۆژانە بێت. ئەم کارانە توانایەکی وایان تێدایە کە وا لە هۆشی خوێنەر دەکەن بەرهەمهێنەرو بەپیت بێت، بەو مانایەی کە ئەم جۆرە کارانە ئەو مەزەنەو بۆچوونانە لای خوێنەر دەسرێتەوە کە بە خوێندنەوەیەك لای دروست دەبن، یان پێشتر هەندێ شت لە دەقەکە چاوەڕێ دەکات و لەو ڕوانگەیەوە حوکمی بەسەردا دەدات. بێگومان ئەم جۆرە کارانە پێویستیان بە خوێنەری تایبەتی خۆیان هەیە، خوێنەرێك ڕواڵەتبین نەبێت و خوێندنەوە بە لایەوە بە تەنها بۆ ئەتەکیەت و کات بەسەربردن نەبێت، بەڵکو لە میانی پرۆسەی خوێندنەوەوە بتوانێ نەخوێندراوەکان پڕ بکاتەوەو پەیوەندییەکان بدۆزێتەوە، لەبەرئەوەی ئەم کارە لێکترازاوانە لە ڕواڵەتدا هیچ جۆرە پەیوەندییەکی مەنتیقیی ڕوون پیشانی خوێنەر نادەن، لە کاتێکدا کە لە ناوەوەیاندا ئەو پەیوەندییە هەیەو بە تەنها هۆشێکی کارا نەك ڕواڵەتبین دەتوانێ بیدۆزێتەوەو مانای پێ ببەخشێت، ئەمەش نەك بەو مانایەی کە بە خوێندنەوە زانیارییەکانی زیاد دەبێت؛ لەبەرئەوەی ئەدەبی ڕاستەقینە بەیانکەر نیە، بەڵکو ڕۆشنکەرەوەیە، بە ئاگا هێنەرەوەی ڕۆح و بەکاربەری جەستەیە لە پێناوی ڕۆحدا، نەك ڕۆح لە پێناوی جەستەدا. هەر لەبەر ئەمەشە کە دونیای هونەر سەروکاری لەگەڵ ڕۆحدا هەیە؛ نەك لەگەڵ جەستەدا. ئەم جۆرە دەقانە هێزێکی خەیاڵی وایان تێدایە کە پێویستیان بە دووبارەو چەند بارە خوێندنەوەیە، لەبەرئەوەی هێزی خەیاڵ و دەرکی ڕاستەوخۆ یارمەتی پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانە دەدات کە لە زنجیرەی ڕووداوەکاندا


کافکا

هەن و، ئەنجامی یەكەمی خوێندنەوەی ئەم كارانە ئەوەیە كە دەبێ هەوڵ بدرێ دووبارەو چەندبارە بخوێنرێنەوە، چونكە یەكەم شت كە خوێنەر لە یەكەم خوێندنەوەیدا بۆ ئەم كارانە بە دەستی دەهێنێت "تێنەگەیشتن"ە.

## كۆتایی كراوە

**ف/ پایان آزاد** *Open- Endedness*

**ع/ النهایة المفتوحة**

دەهەكانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم كۆمەڵێك گۆڕانكاریی قووڵ و بنەڕەتییان لە بواری چەمك و بابەتەكانی ڕەخنەی ئەدەبیدا بە خۆوە بینی. لەو ساڵانەدا ژمارەیەكی زۆری تیۆرە–سازو خاوەن بیرو بۆچوونەكان لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا گرنگییان بە پێگەی خوێنەر داو، بە هۆی ئەو گۆڕانە سایكۆلۆژی و فەلسەفییانەشەوە كە لەو ماوەیەدا لە تێڕوانینە باوەكاندا ڕوویان دا، ماهیەتی ڕەوتی هۆشی خوێنەر دوو هێندە بایەخی پەیداكرد. سەروەختێك ئەو بۆچوونە باو بوو كە كارێكی ئەدەبی بایەخ بە بابەتێكی تایبەتی دەدات و لە چوارچێوەیەكی دیاریكراودا یەك مەبەست بە دەستەوە دەدات. بەڵام ئێستا ڕوانگەی نوێ هاتۆتە ئاراوە كە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نیە بۆ هونەر.

لە ڕابردووی دوورو نزیكدا وا چاوەڕوان دەكرا لە ئەدەب كە پەیامێكی دیاریكراوی هەبێت و وەكو هۆراس دەڵێت: "ئامانجی ئەدەبی فێركردن و چێژە"، بەڵام لە ڕێبازە تازەكانی ئەدەبدا، ڕۆڵی خوێنەر بە سەرەكیترین ڕۆڵ دەزانرێ لە دیاریكردنی پەیامی هونەریدا.

ڕەخنە نووسانێكی تازەی وەكو وڵفگانگ ئایزەر لەو بڕوایەدان كە بە تەنها خوێنەری كارێكی هونەری دەتوانێ مانا بەو كارە بدات و پەیامێكی تایبەتی لێ هەڵبهێنجێت. ڕەخنەنووسانی نوێ لەو باوەڕەدان كە نووسەر پاش خولقاندنی كارەكەی و بڵاوكردنەوەی لەناو خەڵكدا، ئیدی ناتوانێ بۆچوونەكانی خۆی بەسەر خوێنەرەكانیدا بسەپێنێت و لە ڕاستیدا نووسەر پاش خولقاندنی كارەكەی، وەكو دەڵێن "دەمرێت". بە دەربڕینێكی دی؛ نووسەر تا ئەوكاتە خاوەنی كارەكەیەتی و دەتوانێ پەیامەكەی دیاری بكات كە هێشتا نەكەوتۆتە دەست خەڵك و خوێنەران، بەڵام هەر ئەوەندەی كارەكە كەوتە دەست خەڵك؛ ئیدی خاوەنی ئەو كارە ناتوانێ سەبارەت بە بەیانكردنی ماناو پەیامی ئەو كارە قسە بكات، لەبەرئەوەی هەر

خوێنەرێك بە جۆرێكی جیاواز لە خوێنەرێكی دی ئەو كارە لێكدەداتەوەو مانای دەداتێ. لەم ڕوانگەیەوە زۆربەی نووسەران لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەیەم و سەدەی بیستەمدا گەیشتنە ئەو بڕوایەی كە پێویستە پەیام و مانای كارەكانیان بە خوێنەر بسپێرن. هەر بۆیە ئێستا وەكو سەردەمی كلاسیك و نیو كلاسیك ئەدەب و كاری ئەدەبی پەیامی بنجبڕانەی خۆی ناخاتە بەرچاوی خوێنەر، بەڵكو لە كاری ئەدەبیدا، كۆتایی چیرۆكەكە یان حیكایەتەكە بە شێوەیەكی ئاڵۆز دەخرێتە ڕوو و جێ دەهێڵرێ؛ تا هەریەك لە خوێنەران لە ڕێی دەرك و تێگەیشتنی خۆیەوە لێكیبداتەوەو پەی پێ بەرێت..

بەم پێیە، لەم دەهانەی دواییدا زاراوەی "كۆتایی كراوە" لە نێوەندە ئەدەبیەكاندا برەوی پەیداكرد. مەبەست لەم زاراوەیەش ئەوەیە كە هەر كارێكی ئەدەبی كۆتاییەكی تەمومژاوی پەیدا دەكات تا خوێنەر ناچاربێت لە بونیادی مانایی چیرۆكەكەدا بەشدارییەكی چالاكانەی هەبێت، نەك هەر بە تەنها ببێتە وەرگری پەیام و مانایەكی تایبەتی. هەڵبەت لێرەشدا نابێ ڕوانگەی سایكۆلۆژیانەی ڕەخنەنووسانێكی وەكو *Norman Holland* و *Daniel Bleich* یش، سەبارەت بە ئەدەب فەرامۆش بكرێ. ئەمانە بڕوایان وایە كە مرۆڤەكان لە میانی خوێندنەوەی كارێكی هونەریدا خۆیان دەرك دەكەن و خودی خۆیان دەناسن.

# ڕانانی کتێب

ناوی کتێب: بیرکردنەوە لەوەی بیری لێناکرێتەوە:
خستنەڕووی ئەفسانەی کۆچ
ناوی نووسەر: نایغل هاریس
قەوارە: 183
چاپی یەکەم: 2001

و: هەورامان وریا قانع

لێرەدا ئەو شتەی بیری لێناکرێتەوە بریتییە لە لابردن و نەهێشتنی هەموو بەربەست و سنورەکان، لەبەردەم کۆچی مرۆڤەکاندا و یارمەتیدان و کۆمەککردنی کۆچبەرانی ولاتە هەژارەکانی جیهان، بۆ گەیشتن و چوونە ناوەوەی ولاتە دەوڵەمەندەکانی جیهان، بەبێ ڕەزامەندی وەرگرتن و بەبێ دانانی کۆت وتەگەرە و ئاستەنگ یان دانانی کۆمەڵێ مەرج.

ئەو تێزەی سەرەوە لە ڕاستیدا نەك تەنها دەکەوێتە ناو بازنەی بیرلێنەکردنەوەوە، بەڵکو لە لایەن حکومەتەکان و کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکانەوە بە شێوەیەکی تەواو ڕەها ڕەتدەکرێتەوە و پێشی لێدەگیرێ.

لە کاتێکدا لە ولاتانی ئەوروپا و ئەمریکا مشتومڕێك لە ئارەدایە دەربارەی ئەو سیاسەتەی لە بەرامبەر شەپۆلی کۆچکردوان بگیرێتە بەر کە لە ولاتانی تازەپێگەیشتووەوە بەرەو گەیشتن بە بەهەشتی ئەوروپاو ئەمریکا گڕوتینێکی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە، ئا لەوکاتەدا (نایغل هاریس) پرۆفیسۆری ئابوری و پسپۆڕ لە کاروباری کۆچ و شارە گەورەکاندا، هەوڵدەدات و تێدەکۆشێت بۆ ئەوەی ڕۆژئاواییەکان قەناعەت پێبکات ئەو کۆسپ و تەگەرانەی لە دەرەوە بەسەر کۆچدا دەیسەپێنن لە لایەنی ئابورییەوە زەرەرمەندو خراپە، هۆکەشی لە لایەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ پیری و کەنەفتی کۆمەڵگە ئەوروپییەکان، لە لایەکی دیکەوە دەگەڕێتەوە بۆ فراوانی و قوڵی ئاستی خوێندەواری بە شێوەیەك کە پێگە و شوێنی هێزی کاری بە جۆرێك بەرزکردوەتەوە تا خۆی بە زل و لوتبەرز بزانێ، لە بەرامبەر جێبەجێکردنی زۆربەی ئەو ئیشانەی پێویستیان بە خوێندن و شارەزاییەکی تایبەتی ئەوتۆ نییە. لێرەوە کەمی کرێکار و ئیشکەری نازیرەك ڕوو لە زیادبوون دەکات، بەمپێیەش ئابوری ڕۆژئاوا لە ئاستی خوارەوەیدا بە هۆی فراوانی و گەورەبوونی ئەو بۆشاییەی دەکەوێتە ناو کرێکارەکانیەوە تووشی تێکچوون و ناڕێکی دەبێت.

ئـەم بۆشـاییانەش پڕناكرێنـەوە تەنـها لـەو دەروازەیـەوە نـەبێت كە ڕێگا بەو ژمارە بێشومارەی كرێكارانی وڵاتانی تازەپێگەیشتوو بدرێت، ئەوانەی حەزدەكەن و ئارەزویان لێیە ئەو ئیشـانە جێبـەجێ بكەن و خۆیان ئامادە كردوە هەركاتێ دەرگاكانیان لێكرایەوە و مۆڵەتی ئیشكردن و مانەوەیان لە وڵاتە دەوڵەمەندەكاندا پێدرا، كۆچ بكەن.

## بانگهێشتێكی ئەخلاقیو ئابووری

هاریس هەوڵ دەدات جەخت لەسەر ئەوە بكات ئەو بانگهێشتەی كە تەبەنی دەكات و كتێبەكەی بۆ تـەرخان كـردوە، تەنـها لەسـەر هـەندێ بۆچوونـی ئەخلاقی كە هاوسۆزی و هاوخەمی خۆیەتی بۆ ئەو كارەساتانەی بەسـەر سـەدان هـەزار لـە كۆچبـەرە نایاسـاییەكاندا دێـت ڕانەوەسـتاوە (كـە دواجـار سەركەشی و هەڵەشەیی كۆچ یا دەبێتە هۆی مردن یاخود گرتن یان گەڕاندنەوەیان بۆ ئەو شوێنەی كە لێیەوە هاتوون)، بەڵكو هاریس بانگهێشتەكەی بە جۆرێك دەخاتە ڕوو كە بە پلەی یەكەم تێزێكی ئابوورییـە و، ئـەو سیاسـەتی كرانـەوەو واڵاكردنـی تخوبانەی بانگهێشتی بۆ دەكات وەك چۆن لە قازانج و سودی جیهانی دەوڵەمەندایە، بە هەمان ئەندازەش لە قازانج و سودی جیهانی تازەپێگەیشتودایە.

لەگـەڵ ئـەوەی ئەمـە بـە ڕاسـتی دەبێتـە هـۆی چارەسـەركردنی گرفتێكـی گـەورە كـە لـەناو خـودی وڵاتـانی ڕۆژئـاوادا پێنـاچێت چارەسـەری هـەبێت، گرفتەكەش لە ئایندەیەكی نزیكدا بریتییە لە نەبون و دەستنەكەوتنی كرێكار لە بوارەكانی تەندروستی و خوێنـدن و كۆمپیوتـەر و پەیدانـەبوونی ئیشـكەرە نازیرەكەكان. لەگەڵ هـەموو ئەوانـەدا پێویسـتە دان بەو ڕاستیەدا بنێن كە هەموو ئـەو كـۆت و مـەرج و ئاستەنگانەی لەسەر كـۆچ دادەنرێـت- گـەرچی زۆر تونـد و نامرۆڤانەیـە و زۆریـش ڕەگەزپەرسـتانەیە- وەك هـاریس نـاوی لێدەنـێ- نـە دەتوانـێ و نـە لـە تواناشیدایە ئەو كەسانەی كە حەزو ئارەزوی كـۆچ كردنیان هەیە پەشیمان و پاشگەز بكاتەوە.

بەڵكو بە پێچەوانەوە هاریس قسە لەسەر ئـەوە دەكات كردنەوەی دەروازەكانی كۆچكردن وردە وردە دەبێتـە هـۆی نـزم بوونـەوە و كەمبوونـەوەی ڕادەی كۆچبەران، ئەمەش لەبەر بوونی ئەو هۆیـەی نـاوی لێدەنێت "جوڵانەوەی بازنەیی كۆچبەران".

ئەوانـە تەنـها بـۆ چـەند سـاڵێك لـە دەرەوە دەمێننـەوە و دواتـر دەگەڕێنـەوە بـۆ وڵاتـەكانیان. ڕەنگە دوای ئەوە جارێكی دیكەش سەفەر بكەنەوە و لە دواجاردا بە یەكجاری بگەڕێنـەوە بـۆ وڵاتـەكانی خۆیان. بەم شێوەیە هەموو ئەمانە ئابوری وڵاتـانی تازە پێگەیشتو چالاك و گەشەدار دەكەن.

بـەڵام ئـەوەی لـە ئێسـتادا ڕوودەدات ئەوەیـە كۆچكردوەكـان لـەو شـوێنانەدا مـۆڵ دەخـۆن و كۆدەبنەوە كە دەتوانن "دزە بكەن" و بچنە ناویەوە، ئیدی لێیەوە نـاجوڵێن و نایەنـە دەرەوە، لـە ترسـی ئەوەی نەبادا نەتوانن جارێكی دیكە بگەڕێنەوە بۆی.

## بەڵگە مێژووییەكان

هاریس لـەم تـێزەیدا پشـت بـە هـەندێ بەڵگـەی مێـژووی دەبەسـتێت و دەڵـێ: لـە سـێ سـەدەی ڕابردوودا جیهان چەندین شەپۆلی گەورەو فراوانـی كۆچكردنـی بـە خۆیەوە بینیـوە، ژمارەكـانیش ئـەوە

نیشـــان دەدەن زۆربـــەی زۆری کۆچکـــردوان لـــە حاڵـەتێکدا گـەر سـنورەکان کـراوە بـن و کـۆت و تەگەرەو و ئاستەنگ لەسەر کـۆچ و سـەفەرکردن لـە نزمترین ئاستیدا بووبێت، گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیـان. بـۆ نمونـە لـە نێـوان سـاڵانی *1840–1930* نزیکـەی *50* ملیـۆن کـەس لـە هنـدو چینـەوە بـەرەو ئـەمریکای خـوارو و ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا و دەریـای کاریبی و ئەفریقیا کۆچیان کردوە، بۆ یارمەتیدانی دروسـتکردن و بینـاکردنی هێڵـی شـەمەندەفەر و شارەکان و ئیشکردن لە کانەکانی زێڕو کێڵگەکاندا، بەڵام زۆربەیان گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتەکانیان. هیندیە کۆچ کردوەکان بـە تەنـها خۆیـان لـە سـاڵی *1930*دا ژمارەیـان گەیشـتە *30* ملیـۆن کەسی کۆچکردو، لـەو *30* ملیۆن کەسە *24* ملیۆنیان گەڕانەوە بۆ هند.

تێزی سەرەکی و بنچینەیی لای هاریس ئەوەیە، خەڵك وای بە باش دەزانن لە وڵاتـانی خۆیـاندا ژیـان بەسەر ببەن نەك لە دەرەوەی وڵاتەکانیان بژین.

کۆچکـردن لـە ڕێگـای سـنورەکانەوە هەرچـەندە فـراوان و زۆریـش بێـت، تەنـها ڕێژەیـەکی کـەم دەگرێتەوە لەچاو دانیشتوانی جیهاندا. بۆ نموونە لە نـەوەدەکاندا لەگـەڵ ئـەو هـەموو پـەیوەندیی بـە یـەك گەیشـتن و کـۆچ و ئاسـانکارییانەی سـەفەرکردن، ژمارەی ئەوانەی لە دەرەوەی وڵاتانی خۆیاندا دەژین ناگاتە *200* ملیۆن کەس لە کۆی ژمارەی دانیشتوانی جیهان کە نزیکەی حەوت ملیار کەسە.

## قەڵاچۆکردنی بازرگانی ڕەش

لـە ڕووی ئەخلاقییـەوە لابـردن و نەهێشـتنی کۆت و بەند لەسەر کۆچ، دەبێتە هۆی قەڵاچۆکردن و بنـبڕکردنی بازرگـانی ڕەش کـە لـە هـەموو سـوچ و کەلەبـەرێکی جیهاندا بڵاوبوەتـەوە. ئەم بازرگانیـەش پشتی بە کۆچی نایاسایی بەستوە: چینییەکان بۆ وڵاتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا، ئەفریقییـەکان بـۆ ئـەوروپا، ئاسـیاییەکان بـۆ یابـان و سـەنغافورە، ئەوروپای ڕۆژهەڵات بۆ یەکێتی ئەوروپا (ئەوروپای ڕۆژئـاوا) و بـەم شـێوەیە. ئـەو ژمارانـەش کـە لـەم سیاقەدا دەردەکەون ترسێنەرە، بۆ نموونە لە کۆتایی نەوەدەکاندا بە پێی ژمارەکـانی ئیـدارەی ئـەمریکی قەبارەی ئەو بازرگانیـەی کـە پەیوەسـتە بـە لایـەنی بازرگانیکردن بە ئافرەت و منداڵەوە گەیشتە زیاتر لە *700* هـەزار کـەس. ئەم بازرگانییـەش تێکەڵەیەکـە لـە ئیشکەرو کرێکـاری هـەرزان، کۆیلـەی سپیو ناردنـە دەرەوەی لەشفرۆشی. لەم ناوەشدا خـەڵکانێکی زۆر کـە لـە ژمـاردن نایـەن، لـەکاتی پرۆسـەی ناردنـە دەرەوەیاندا کە بە شێوەیەکی زۆر نامرۆڤانە ئەنجام دەدرێـت، گیانیـان لـە دەسـت دەدەن. بـەبێ ئـەوەی پێیان بزانرێت یاخود چاودێری بکرێن.

## لە دەستدانی شارەزاییو بەدەستهێنانی

لێرەدا ناکرێ ئەو ترسە پشتگوێ بخەین کە ئەم بانگهێشتە بۆ وڵاتانی هەژار لە خۆیدا هەڵی گرتوە، ئـەو ترسـەش بریتییـە لـە دەسـتدان و ڕۆیشـتنی خەڵکانی پسپۆڕو شارەزاو خاوەن عەقڵەکان، کە ئەم وڵاتانە لە پرۆسەی بوژاندنەوە و هەڵسەنگاندنەوە و گەشـەکردنی ئـابوری و زانسـتی خۆیـاندا زۆر پێویستیان پێیان دەبێت. ئا لێرەدا هاریس بەرگری لە تێزەکەی دەکات و دەڵی ئەمە واتە ئەو حاڵەتەی سەرەوە– بۆ وڵاتانی تازەپێگەیشتوش سودبەخشە.

بگـرە بوژاندنـەوە لـەو وڵاتانـەدا دەکـرێ خـێراتر و بـەگورتر بکرێـت، ئـەویش لـە ڕێگـەی ناردنـەوەو حەواڵـەکردنی ئـەو پارانـەی کـە ئیشـکەران دەینێرنەوە، هەروەها بە شێوەیەکی گشتی لە ڕێگەی ئەو شارەزاییو خیبرانەی کۆچکردوان، ئەوانەی لە ڕۆژئـاواو جیـهانی پێشـکەوتودا بـە هـۆی ئیشـکردنیانەوە بـە دەسـتی دەهێنـن و پێیـەوە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان.

لـێرەدا (بوژانـەوەی کـۆچ کـردوان بـۆ وڵاتـەکانیان) پەیوەستە بە دوو فاکتەری دەرەکیەوە:

یەکەمیان/ ئەو پارەو حەواڵانەی دەینێرنەوە بۆ خێزانەکانیان.

دوەمیان/ ئەو شارەزاییەی ڕەنگە لەگەڵ خۆیاندا بیهێننـەوە بـۆ وڵاتـەکانیان، هـەردوو فاکتەرەکـەش لەسـەر پێگەیـەکی پتـەو بەهێز ڕانەوەسـتاوە، بـەڵکو زیاتر لەسەر پێگەیەکی فشەڵ و لەرزۆك وەستاوە.

## خستنەگەڕی هێزی کار

هاریس وای دەبینێت لابردنی کۆت و تەگـەرە و بەربەستەکانی کۆچکردن دەبێتە هۆی خستنە گەڕی هێزی کار، چونکە زۆربەی ئیشکەران و کرێکارەکان بۆ مـاوەی سـێ یـان پێنـج سـاڵ کـۆچ دەکـەن، لـەو ماوەیـەدا کۆمـەڵی شـارەزایی فـێردەبن، لـە دوایـدا دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتـەکانیان و هـەندێ ئیشی تایبـەت بـە خۆیـان دادەمـەزرێنن و ئـەو شـارەزاییو لێهاتووییەی بە دەستیان هێناوە دەخەنە گەڕ. ئەم حاڵەتە لە ئێستادا ڕوویداوەو پیادە دەکرێ، گەرچی جۆرێك لە نارەحەتی بە خۆیەوە دەبینێ.

بـۆ نموونـە ژمارەیـەکی بـەرچاو لـە پزیشـك و بەرمەجـەکارانی کۆمپیوتـەری تـایوانی لـە کالیفۆرنیاوە دەگەڕێنەوە بۆ تایوان.

بـەڵام لـێرەدا ئـەو پرسـیارە گەورەیـە هـەر دەمێنێتـەوە، ئـەویش ئەوەیـە ئـاخۆ قوڵایـی و بـەردەوامی پرۆسـەی بوژاندنـەوە و گەشـەکردنی خۆماڵی تا چەند بە شێوەیەکی ئۆرگانی بەستراوە بە فاکتەری دەرەکییەوە کە ڕووبەڕووی بەرزی و نزمی دەبێتـەوە و نـاتوانرێت دەسـتی بەسـەرا بیگرێـت.

## ئازادی و کۆت و بەند:

ئـەو ناکۆکیـەی هـاریس لـە کتێبەکـەیدا پـەی پێبردوە و سەرنجی داوە، لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە کۆت و ئاستەنگ خستنە بەردەم کۆچ و جووڵەی خەڵك لـەم سـاڵانەی دواییـدا گەیشـتوەتە بـەرزترین ئاسـتی خـۆی. ئەمـە لـە کاتێکدایـە مێژوونووسـان پێیـان وایـە ئـەم سـەردەمەی لـە نـاویدا دەژیـن، سـەردەمی ئازادییـەکان و ڕزگـاربوونی مرۆڤـە لە کۆت و پێوەندەکان. کەچی گەر بەراوردێك بکەین لە نێوان ئەو تەگەرە و بەربەست و سنوورکێشانەی لـە ئێسـتادا بەسـەر هـاتوچۆ و کۆچکردنـی ئادەمیزادەکـاندا سـەپێنراوە، لەگـەڵ ئـەو حاڵـەت و بارو دۆخەی لە ڕابردوودا لە ئارادا بوە، ئەوا تووشی ڕاچڵەکین و حەپەسان دەبین. کاتێك دەبینین جیهان لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـت و دواکـەوتودا ئازادییەکی گەورە و تا ڕادەیەك ڕەهای بۆ هاتوچۆی خـەڵکی بـە خۆیـەوە بینیـوە، چونکـە لەودەمـەدا پەسـاپۆرت و ڕەزامـەندی وەرگرتـن و سـنوورەکان بوونیـان نـەبوە، تـا نـەهێڵن ئادەمیزادەکـان هاتوچۆو سەفەر بکەن.

هاریس دەڵی گەر بمانەوێ ڕازی بین بە وتەزای ئێمە لە سەردەمی جیهانگیری ئابوریدا دەژین، ئابورییەك بەوە جیاکراوەتەوە کەوا بازاڕی جیهانی بەرەو ئەوە دەچێت ببێتە بازاڕێکی یەکگرتو، ئەوا پێویستە بەوەش ڕازی بین کە یەکێك لە پێکهاتە و بنەماکانی بازاڕی یەکگرتوی جیهانی بریتییە لە ئاسانبوونی گواستنەوە و هاتوچۆی ئیشکەران و ئادەمیزادەکان، بە هەمان ئەو ئاسانیەی بۆ گواستنەوەی کەلوپەل و شتوومەك و سەرمایەکان دەستەبەر کراوە. ئەو کۆت و ئاستەنگ و بەربەستانەی لابران بۆ ڕەخساندنی دەرفەت لە بەردەم بازرگانی ئازاددا تا بگاتە دوا ئاستی خۆی کە دواجار پێکهێنانی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی لێکەوتەوە، ئەوا پێویستە بە هەمان ئاست کۆت و پێوەندەکانی سەر هاتوچۆی مرۆڤەکان و هێزی کاریش لابرێن.

## مەیلی ڕەگەزپەرستی

ئەم تێزە پرسیارگەلێکی زۆر سەبارەت بە ڕەگەزپەرستی دەوروژێنێ، گەر بێتو وامان هێنایە پێشچاوی خۆمان کە سەدان هەزار کرێکار لە باشوری هەژارەوە بەرەو باکوری دەوڵەمەند ڕەو بکەن. بێگومان ئەمە دەبێتە هۆی زیادبوون و بەرزبوونەوەی مەیلی ڕەگەزپەرستی بە شێوەیەکی هێجگار گەورەو بەرفراوان. لێرەدا هاریس لەگەڵ ئەو بۆچونەی سەرەوەدا ڕێك ناکەوێت و دەڵێت بە پێچەوانەی ئەوەی سەرەوە کۆت و ئاستەنگ و بەربەستە سەپێنراوەکانی سەر کۆچ لە ئێستادا، گەورەترین سەرچاوەن بۆ ڕەگەزپەرستی. ئەو وای دەبینێت گەر بمانەوێت جیهان بەرەو ئاراستەیەکی یەکسان و تەباو چونیەك هەنگاو بنێت، ئەوا پێویستە خۆمان لەو ڕەگەزپەرستییەی هەیەو وا دەکات دەوڵەمەندەکانی جیهانی ئازادانەو بێ بەربەست هاتوچۆ بکەن لە کاتێکدا هەژارەکان لە هەمان ماف بێبەش دەکات، بە دوور بگرین.

سەبارەت بە کۆچکردنی کرێکارانی باکوری ئەفریقیا، هاریس وای دەبینێت هەمان پرەنسیپی گشتی بەسەر ئەوانیشدا جێبەجێ دەبێت، بە واتای ئازادبن لە هاتوچۆ کردنیاندا وەك چۆن لە ڕابردوودا لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی ئازادبوون لە هاتوچۆ کردندا، ئەمەش مانای وایە خەڵك بتوانن لە باکوری ئەفریقاوە بگەنە فەرەنسا بۆ بە دەستهێنانی ئیشوکار و مانەوە تێیدا.

هاریس وای مەزەندە دەکات وەك چۆن لە ڕابردووشدا هەروا بوە- هەندێ کرێکار بۆ ئەوێ (فەرەنسا) کۆچ دەکەن و هەندێکی دیکەیان کۆچ ناکەن، ئەمەش بەندە بە بارودۆخی وڵاتەکانیانەوە. بۆ نمونە لە ئێستای جەزائیردا بە هۆی ئەو شەڕو دارمانە گەورەو کارەساتبارەی کە دەیبینین جوڵەیەکی گەورەی کۆچ کردن لە ئارادایە، بێگوێدانە ئەوەی کۆت و ئاستەنگ هەیە یاخود نییە. خەڵك لە پێناوی ئەوەی بە زیندوویی بمێننەوە پەلەیانە بۆ هاتنە دەرەوە و جێهێشتنی جەزائیر.

## قەڵاچۆکردنی ستەمکاریی

بێجگە لەو شتانەی باسکران، هاریس هیواخوازە سیاسەتی واڵاکردنی سنوورەکان ببێتە هۆی سوککردن و کەمکردنەوەی بارودۆخی ستەمکاری

لەو وڵاتانەی سەرچاوەی ناردنە دەرەوەی (کۆچ)ن. چونکە ڕژێمە ستەمکارەکان هەست بەوە دەکەن ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەو سیاسەتانەی دەبنە هۆی دەرکردن و ڕۆیشتنی کەسانی شارەزا و خاوەن توانا و پسپۆڕەکان، ئەوا لە ئەنجامدا کرێکارو ئیشکەرە شارەزا و لێهاتوەکانی لەدەست دەردەچن. لێرەوە ترسی لە دەستدانی ئەو کەسە شارەزایانە پاڵ بە ڕژێمەکانەوە دەنێن تا هەندێ هەنگاوی چاکسازی لە بوارەکانی سیاسەت و ئابوری و کۆمەڵایەتیدا بۆ سودو بەرژەوەندی کۆمەڵگەکانیان بنێن، بە ئامانجی ئەوەی ئەو شارەزایانە بمێننەوەو وڵاتەکانیان بەجێ نەهێڵن.

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە تا چ ئاستێ حکومەت و ڕژێمەکانی ئەو وڵاتانەی هەلومەرج و بارودۆخی ژیان تێیدا بوەتە هۆی وەدەرنانی کرێکاران و خاوەن عەقڵەکان، گرنگی بەم مەلەسەیە دەدەن؟ یان بە پەرۆشن و دڵیان بە سامانی مرۆیی وڵاتەکەیان دەسووتێ؟

لەگەڵ ئەوەی چەندین پرسیار بە هەڵپەسێردراوی یان بەبێ بوونی وەڵامێکی گونجاو ماونەتەوە، کەچی مرۆڤ دەتوانێت هەست بەو ترسە گەورەیە بکات کە لە ئەنجامی نەمان و لابردنی کۆت و ئاستەنگەکانی سەر کۆچ بەسەر وڵاتانی تازەپێگەیشتوودا دێت، تا ئەو ترسەی کە وڵاتانی پێشکەوتوو هەستی پێدەکەن.

## سەرچاوە

جەزیرە نێت ، 2002/1/1



Ellsworth kelly,write curve,1996

# هالی بیری
# یەکەم کچە ئەکتەری ڕەش کە خەلاتی ئۆسکار بەدەست دێنێت



ئا. و: سەردەم

لە کۆتاییەکانی مانگی مارتداو لەسەر "شانۆی کۆداک" و لە کەشێکی هۆلیۆدییانەدا خەلاتەکانی ئۆسکاری سینەمایی دابەشکرا. ئەو کتوپڕییەی لەو بۆنەیەشدا ڕووی دا ئەوەبوو کە کچە ئەکتەری ڕەش {هالی بیری} یەکەم ئافرەتی ڕەش بوو کە وەکو باشترین کچە ئەکتەر لە مێژووی سینەمای ئەمریکاییدا خەلاتی ئۆسکار بە دەست بهێنێت. هەروەها دینزل واشنتۆنیش (کە هەر ڕەشە) خەلاتی باشترین ئەکتەری کوڕی بەدەستهێنا، ئەمەش دوەم جارە کە ئەکتەرێکی کوڕی ڕەش خەلاتی ئۆسکاری سینەمایی وەربگرێت. ئەوەبوو یەکەمجار سیدنی بواتییە لە ساڵی 1964دا وەریگرت. هەربۆیە کاتێ هالی خەلاتەکەی وەرگرت چاوانی پڕ بوون لە فرمێسک و هاواری کرد "ئای خوایە".

بیری وتی: *"ئەم خەلاتە پێشکەش ئەکەم بە هەموو ژنە ڕەشەکان بێ جیاوازی"*، سوپاسی خۆیشی ئاراستەی دایك و مێردەکەی و بەرهەمهێنی فیلمەکەو هەموو ئەوانە کرد کە یارمەتییان داوەو توانیویەتی لە تەمەنی 35 ساڵیدا خەلاتی ئۆسکار وەربگرێت.

لە فیلمی "تۆپی مەسخ"دا بیری کە لەگەڵ بیلی بۆب ثورنتوندا دەور دەبینێت، لە دەوری لیتیسیادایە کە ژنی زیندانییەکە کە حوکمی لە سێدارەدانی بەسەردا دراوە، لیتسیا پەیوەندی لەگەڵ ئەو پیاوەدا دەبەستێت کە سەرپەرشتی لە سێدارەدانی مێردەکەی دەکات.

بەلام دینزل واشنتۆن وتی *"دوو چۆلەکە لە شەوێکدا"* و پاشان ڕووی دەمی کردە سیدنی بواتییەو وتی *"تۆ هەمیشە نمونەی بەرزی من بوویت"*. هەروەها باسی ئەوەی کرد کە کاتێ منال بووە هەمیشە خەونی بەوەوە بینیوە کە ببێتە "باشترین ئەکتەری دونیا" و سوپاسی ئەکادیمیای سینەمای کرد بۆ ئەو خەلاتە. ئەمە جاری سێیەمیش بوو کە لە ژینی هونەریدا بۆ ئۆسکار بپالێورێ.

دەتوانین بڵێین کە خەڵاتەکانی ئۆسکار لەم خولەیدا کە خولی حەفتاو چوارەمێتی بە پێچەوانەی ئەوەوە هات کە چاوەڕوان کراوبو. بە تەنها فیلمی "ئەقڵێکی جوان"ی لێ دەربچێت کە چاوەڕوان دەکرا خەڵاتی باشترین فیلم بەدەست بهێنێت، هەروەها خەڵاتی باشترین دەرهێنانیش.

ڕۆن هواردی دەرهێنەری فیلمی "ئەقڵێکی جوان" سوپاسی ئەلیشاو جۆن ناشی کرد کە زانایەکی ماتماتیکی بلیمەتەو دوچاری شیزۆفرینیا بووەو، فیلمەکە باسی بەسەرهاتی ئەوان دەکات. هواردیش کێبەرکێی باشترین دەرهێنەری لەگەڵ ڕیدلی سکۆت دەرهێنەری "کەوتنی هەڵۆ ڕەشەکە" و ڕوبرت ئاڵمان دەرهێنەری "گۆسفۆرد بارك" و پیتەر جاکسۆن (گەورەی ئەنگوستیلەکان) و داڤید لینش (مۆلهۆلاند درایڤ) دەکرد.

**خەڵاتەکانیش بەم جۆرە دابەشکران:**

باشترین ئەکتەری کوڕ: دینزل واشنتۆن لە "ڕۆژی مەشق"دا.

باشترین ئەکتەری کچ: هالی بیری لە "تۆپی مەسخ"دا.

باشترین ئەکتەری کوڕ لە دەوری لاوەکیدا: جیم برۆدبنت لە فیلمی "ئیریس"دا.

باشترین ئەکتەری کچ لە دەوری لاوەکیدا: جنیڤەر کۆنلی لە فیلمی "ئەقڵێکی جوان"دا.

باشترین فیلم: "ئەقڵێکی جوان" کە بەسەرهاتی ژیانی زانای ماتماتیك جۆن ناش کە تووشی شیزۆفرینیا بوە.

باشترین دەرهێنان: ڕۆن هوارد بۆ دەرهێنانی فیلمی "ئەقڵێکی جوان".

باشترین مۆسیقا: هوارد شور بۆ فیلمی "گەورەی ئەنگوستیلەکان"

باشترین فیلمی دۆکیۆمنتیار: فیلمی فەرەنسایی "تاوانی کوشتنێك لە ڕۆژی یەکشەممە"دا لە دەرهێنانی جان کزاڤیە دی لیستراد. پۆلیس کوڕێکی منداڵ ئەگرێ (کە تەمەنی 15 ساڵە) بە تاوانی کوشتنی ژنێك لە ڕۆژی یەکشەممەدا.

باشترین فیلمی بیانی: ***No Man's Land*** (سەبارەت بە بۆسنەو هەرسك)، بەسەرهاتی سێ هاوڕێیە کە دەکەونە خەندەکێکی بۆمبڕێژکراو لە سەنگەری پێشەوە لەگەڵ دوژمندا.

باشترین بەڕێوەبردنی هونەری: "ئاشی سوور".

باشترین جلوبەرگ: "ئاشی سوور".

باشترین وێنەگرتنی سینەمایی: "گەورەی ئەنگوستیلەکان".

باشترین ماکیاژ: "گەورەی ئەنگوستیلەکان".

لە تۆڕی ئینتەرنێتیی (ئیلاف)ەوە

# مارتن هایدگەر و (سرودەکانی هۆڵدەرلین)

هاشم ساڵح

و: شاد

دواجـار دەقـی فەرەنسـی کتێبەکـەی "مـارتن هایدگـەر" لەمـەڕ "هۆڵدەرلـین"ی شـاعیری مـەزنی ئەڵەمانیا، کەوتە بەردەستی خوێنەران. ئەم کتێبەش چـون زۆربـەی کتێبـەکانی "هایدگـەر" بریتیـە لـە کۆکردنـەوەی تێکـڕای ئـەو لێکچەرانـەی لـە نێوانـی ساڵانی *1934– 1935* پێشـکەش بـە خوێندکارەکـانی کردوە. خەڵکی فەرەنسا تەنها لە سەرەتای ئەمساڵدا (*1989*) وەك توێـژەرو ڕەخنـەگرێکی ئـەدەبی ئاشـنای "هایدگەر" بوون، کاتێك خانەی (گالیمار) لـە ڕێـی "فرانسوا فیدییـە" یـەکێك لـە پسـپۆڕە مەزنـەکان لـە وەرگـێڕانی "هایدگـەر" بـۆ سـەر زمـانی فەرەنسـی، هەستا بە لە چاپدان و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە.

تـەواوی کتێبەکە تەرخانـە بۆ شیکردنەوەی دوو چامـــە (یـــاخود دوو ســـرود) لـــە چامـــەکانی "هۆڵدەرلـین"، ئـەوانیش بریتـین لـە: (ئەڵـەمانیاو ڕوبـاری ڕایـن). هـەردوو وشـەکەش بارگـاوین بـە سیمبولە مێژووییە دێرینەکانی گەلی ئەڵمانی.

لـە بەشـی یەکـەمی کتێبەکـەدا "هایدگـەر" کارامـەیی و لێـهاتووی خۆیمـان نیشـان دەدات وەك ڕەخنـەگرێکی ئـەدەبی و شـیکارگەرێکی تێکسـتە ئەدەبیەکان، ئەو جیاوازیـەشمان بـەرچاو دەخات کە لە نێوان خۆیی و ڕەخنەگرە ئەدەبیـە ئاسـاییەکاندا هەیە. "هایدگـەر" هێنـدەی گرنگـی بـە پـەیبردن بـە نـــهێنی نـــاوەڕۆکی شـــیعری شـــاعیرێکی وەك "هۆڵدەرلـین" دەدات، هێنـدە خـۆی بـە دۆزینـەوەی مانـای حـەرفی وشـەکان و بەیتـە شـیعریەکانەوە خەریك ناکات.

لـە دوەم بەشـی کتێبەکەدا "هایدگەر" دەیـەوێت تیۆرییـە شـیعریەکەی بەسـەر هـەردوو چامەکـەی "هۆڵدەرلـین"دا پراکتـیزە بکـات، تـا لـە ڕادەی سەرکەوتوویی پرانسـیپەکانی تیـۆری هیرمنیۆتیکا دڵنیـابێت کـە لـە بەشـی یەکـەمی کتێبەکـەدا باسـی لێکـردوە. ئەمـەش بـۆ خـۆی گرتنـە بـەری شـێوازێکی مەنهەجیە، ئیتر ئەو ئاکامانەمان پێ پەسەند بێت یان نا کە "هایدگـەر" پێـی گەیشـتوە. تەنانـەت دەبێـت هەموو ڕەخنەگرێکی ئەدەبی کە ڕێزی خۆی دەگرێت پەیڕەوی بکات.

پێویستە هەر ڕەخنەگرێك بەرلەوەی دەست بە پرۆسەی لێکدانەوەو شیکاریی و قسە لەسەرکردنی دەقێك بکات، بزانێن لە لێکۆڵینەوە پراکتیکییەکەیدا لە کوێوە دەست پێ دەکات. بە کورتیەکەی پێویستە ڕەخنەگر پرانسیپە تیۆرییەکانی و جیهانبینی گشتی خۆی بۆ بەرهەمێکی ئەدەبی ڕوون بکاتەوە بۆمان، تا بە باشی بە جێ و ڕێی ئەو ئاشنا بین. هەروەها بۆ ئەوەی بزانین بەو پرانسیپە هێرمینۆتیکییە تیۆریانەوە پابەند بوە یاخود لە کاتی پرۆسەی ئیشپێکردنیدا لایداوە لێیان.

تەنها لەم ڕێگایەشەوە توانای ڕەخنەگران و ڕادەی شۆڕبوونەوەیان بە ناو بەرهەمە ئەدەبییە مەزنەکان یان سەوداکردنی لەگەڵ ڕوکەشی ئەو دەقانەدا ئاشکرا دەبێت بۆمان. چونکە دواجار دەق موڵکی خوێنەران و ڕەخنەگرانە، نەك هی نووسەرەکەی بێت. لێرەوە مانای ئەو دەقە (ڕونتر بڵێین مانا جۆراوجۆرەکانی) لە لایەن نووسەرەکەیەوە پێی نادرێت، بە قەد ئەوەی لە لایەن خوێنەران و وەرگرانیەوە دەکرێت بە بەریدا.

ئەم قسانەش زیاتر دەقە مەزنەکان دەگرێتەوە، نەك ئەو دەقە سادانەی هەڵگری تاکا مانایەن و ئاشکراو ڕاستەوخۆن. تێکستە ئەدەبییە مەزنەکان ئاوسن بە ماناو ئاماژەی جۆراوجۆر، وەك چۆن گەردون ئاوس دەبێت بە سیماو ئاماژەو سیمبولی جۆراوجۆر. شاعیرێکی مەزنی وەك "هۆڵدەرلین" پێویستی بە فەیلەسوفێکە لە ئاستی "هایدگەر"دا، بۆ ئەوەی بە قولایی ناخیدا شۆڕبێتەوەو لە گەڵیدا دابەزێتە ناوجەرگەی دۆزەخ، لەو سەریشەوە دەست پڕ لە دوورو مەرجان، سەر سەلامەت بێتە دەرەوە.

بە بۆچوونی من دەبێت لەم ڕوانگەیەوە ئەم کتێبەی "هایدگەر" دەربارەی "هۆڵدەرلین" بخوێنینەوە.. ڕەنگە وەها چاکتر بوایە دوای ئەوەش بمانزانیایە گەورە ڕەخنەگرانی ئەڵمانیا چۆن چۆنی ئەم دو چامەیان لێکداوەتەوە، بۆ ئەوەی بزانین ڕەسەنایەتی (میتۆدی هایدگەریی) لە لێکدانەوەو ڕەخنەدا لە چ ئاستێکدایە. (واتە لە ڕادەی جیاوازی و ڕادەی لە یەکچوونی مەنهەجیەتی هایدگەر لەگەڵ میتۆدە ڕەخنەییە گەورە باوەکاندا شارەزا بووینایە). بەهەرحاڵ، هەر چۆنێك بێت پێویستە مێژووی نووسینی ئەم دەقە ڕەخنەییانە بە هێند وەربگیرێت، تا بەو پێگەیانە ئاشنا بین کە "هایدگەر" لێیانەوە دەست پێدەکلات.

ساڵی *1934*، ماوەیەکی کەم بەر لە دەستپێکردنی جەنگی دوەمی جیهانی و ئان و ساتی هاتنە ئارای تەوژمی نازیزم و هاتنە سەر کاری "ئەدۆلف هتلەر"، ئەم دەقە ڕەخنەییانە نوسراون. دەبێت لێرەدا وریا بین تا نەکەوینە ناو گێژاوی ئەو لێدوان و شاڵاوانەی بە درێژایی ساڵی ڕابردوو، سەبارەت بە "هایدگەر" زۆر لە ڕۆژنامەنووسان و ڕوناکبیرانی فەرەنسا دەیان وتەوە. ئەوان پەیوەندی "هایدگەر" و نازیزمیان کردە مەسەلەیەك، بگرە کێشەیەکی دروستکراویان بۆ نایەوەو هۆکارەکانیشی لای هەموان ئاشکرایە. چونکە ناکرێت فەیلەسوفێکی وەکی "هایدگەر" (ئیتر لە گەڵیدا بین یان نا) کورت کەینەوە بۆ تەنها تێکۆشەرێکی سیاسی یان ئایدیۆلۆژی ئاسایی ناو بزوتنەوەیەکی سیاسی (وەك نازیزم). ئەمە درۆو دەلەسەیەو لە بەردەم بچوکترین پرسیاردا خۆی بۆ ڕاناگیرێت.

"هایدگـەر" نەتـەوە پەرسـتێکی ئەڵـەمانی بـوو، ئەمە شتێکە گومانی تێدا نییە، بەڵام هەموان دەزانن ئەو دوای ساڵێك لە وەرگرتنی پۆستی ڕاگری زانکۆو لە ئەوجی دەسەڵاتداریێتی "هتلەر"دا دەستی لە کار کێشـایەوە. ئەمــەش مانـای ئەوەیــە کــە لەگـــەڵ دەسەڵاتدارانی ڕژێمی نازی و ئایدیۆلۆژیستەکانیدا ناکۆك بوە. ئـەو نەتەوەپەرسـتێکی ئەڵـەمانی بـوو، بەڵام بە شێوەی تایبەتی خۆی وەکی فەیلەسوفێك کە ڕۆ دەچێتــە نــاخی دەروونـــی ئــەڵمانی و نـــاخی مێژوەوەو، لە هونەریشدا بۆ ئەوە دەگەڕێت تا وای لێبکات ببێتە شایەدێك لەسەر ئامادەگی کەینونە.

لەم خاڵـەدا بیریـاری مـەزن لـە ئایدیۆلۆژیســـتی گچکە جیا دەبێتەوە. "هایدگەر" بیریـارێکی مەزنـە (جارێکی تریش دووبارەی دەکەمەوە لە گەڵێدا بین یان نا، دەبێت ئەم ڕاستیە بزانین، من بۆ خۆم لە زۆر شتدا لەگەڵیدا نیم). هێرش کردنە سەر "هایدگەر" وەکی بیریارێك، مانای هێرشکردنە سەر خودی فیکر دەگەیـەنێت. وێرانکردنـی بیریـارێکی وەکـی ئـەو لـە ڕێـی ئـەم شـاڵاوە چـڕو وردەوە کـە بـە هێرشـی کاوبۆییەکان دەچێت، سەرەتایەکی ترسناکە، چونکە ڕەنگە دواتر لە دژی بیرمەندانی تر بەگەڕ بخرێت، گـەر بــەرژەوەندی ئـایدیۆلۆژی و سیاســی چــەند دەستەو تاقمێك ئەوەیان خواست.

"هایدگـەر" ئـەڵمانی نـەژادەو ئـاوێزانی ڕۆحـی گەلێکی دێرینـی وەکـی ئەڵمانیا دەبێـت کـە خـاوەن ژیارێکی تایبـەت و کلتورێکـی دەوڵەمـەندە. لـێرەوە ئاسـاییە وەکـی "هۆڵدەرلـین"، ئـەو شـاعیرەی لــە سەردەمی نەهامەتی و کوێرەوەری و مەترسیدا ژیا، چاوەڕوانی هەستانەوەو خۆ سازدانەوەی گەلەکەی بکات. "هۆڵدەرلین" بێهودە چاوەڕوانی دوا تونێلـی دەکرد، بەڵام دواجار بۆ خـۆی چـوە نـاو تونێلێکـی تاریکـترو زۆر ئەنگوسـتەچاوتر: چـوە نـاو شــەوی دێوانـەیی و تاریکسـتانە دەیجوورەکەیـەوە، لێشـی نەهاتـە دەرێ تـا دنیـای جێهێشـت. ئـەم شـاعیرو نووسـەرانەی خـاوەنی ئـەزمونێکی ترسـناك و بـێ وێنــەن، "هایدگـــەر" دەخەنـــە ســـەر کەڵکەڵـــەی لێکۆڵینەوەو ئاوێتەبوونێکی ڕەخنەیی داهێنەرانە.

بـەڵام جیـاوازی نێـوان "هۆڵدەرلـین و هایدگـەر" ئەوەیـە، "هۆڵدەرلـین" ئـاوێزانی جیرمانایـا (واتــە ئەڵـەمانیای مێژوویی) بوو، خـەونێك کـە هاتنـە دی مەحاڵـە. بەڵام خەونی "هایدگەر" هێندەی نـەمابوو بێتە دی و ببێتە حەقیقەت. لە ڕووی کات و مێژوەوە زیاد لە سەدو سی ساڵ ماوەی نێوانیانە، (هۆڵدەرلین سـاڵی *1801* چامــە بەناوبانگەکـەی -جێرمانیـا-ی نووســـــی و هایدگـــــەر ســــــاڵی *1934-1935* لە بارەیەوە دەنووسێت).

لـێرەدا ئەڵـەمانیا لــە ڕوانگــەی "هۆڵدەرلــین و هایدگـەر"ەوە دەوڵــەت نییــە، بــەڵکو حەقیقـەتێکی میتافیزیکاییە لە هەناوی مێژوەوە دێت تا ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتــە واقعێکــی بــەرچاو، دێــت بــۆ ئـــەوەی ئاوێزانی مێژوو بێت و بە داهاتوەوە ئاوس بێت.

پاش ئـەوەی خـوا کۆنـەکان خـاکی ئەڵــەمانیان بەجێهێشت، هەڵۆ بەرزە فڕەکەی "هۆڵدەرلین" وەکی سەرمەشقێك دێت بۆ ئەوەی ئەو هەرێمە بدۆزێتەوە کە ئاوسە بە داهاتوو، بەسەر ئەڵمانیادا باڵەکانی لە یەك بدات: (ئەو کچی هەموو زەمینـە، ئەو وڵاتـەش- وڵاتی ئەڵمانیایە). لە جێگایەکی تردا دەڵێت: (ئەو لــە توانایدایــە بـاری بەختــەوەری مــەزن لــە کــۆڵ

بگرێت). "هایدگەر" پێی وایە ئەم (بەختەوەریە قورسە)ی "هۆڵدەرلین" باسی دەکات، جگە لە گەلی ئەڵمانیا هیچ میللەتێکی تر ناتوانێت شانی بداتە بەر، چونکە تەنها ئاراستەی ئەو کراوەو شان دانە بەریشی تەنها لە ئەستۆی ئەودایە..

پاشان "هۆڵدەرلین" ئەم دێرە شیعرە جوانە دەڵێت: (نیشتمان پیشوو دەدات -نیشتمان لە چاوەڕوانیدا پشوو دەدات). بەڵام نیشتمان چاوەڕوانی چییە؟ یاخود ئەو ڕوداوە چاوەڕوان نەکراوە چییە کە ڕایدەچڵەکێنێ و گۆڕانێك لە ڕەوتی ئاسایی شتەکاندا دروست دەکات؟ نیشتمان چاوەڕوانی چییە و نیشتمان خۆی لە کوێیە؟

"هایدگەر" لە وەڵامدا دەڵێت: (نیشتمان لە چاوەڕوانی دیداری خواکاندایەو خۆی بۆ گرتنە ئەستۆی ئەو بەرپرسیارێتییە سازو ئامادە کردوە کە نیشتەجێکردنی مرۆڤە لەسەر ئەو زەوییە -واتە دەست پێکردنی مێژوویەکی نوێیە-).

نەوەی "هۆڵدەرلین" -کە لە هەمان کاتدا نەوەی هیگڵیشە- خەونیان بە ژیاندنەوەی ئەڵمانیاو هاتنی ئەو ڕۆژەوە دەبینی کە نیشتمان دڵشاد بێت و لە بزوتن و جوڵەدا بێ و بوونیشی ببێتە بوونێکی حەقیقی و بەرجەستە بوو. بەڵام ڕەوتی مێژوو پڕیەتی لە ڕووداوی خۆش و ناخۆش، هەندێك جار تراژیدیاو نائومێدی دەبنە جەوهەرو ناوەڕۆکی جیهان. لە چاوەڕوانی هاتنی ئەو ڕۆژە بەڵێن پێدراوەدا، ئەوە تەنها شاعیرە مەزنەکانن دەتوانن ڕووبەڕووی ئەو تراژیدیایە ببنەوەو گوزارشت لە دڵەڕاوکێی جیهان بکەن.

### سەرچاوە

گۆڤاری (العرب و الفكر العالمی)، ژمارە (*5*)، زستانی (***1989***)



joseph cornell,space object box

# نامەی ساڵانەی ڕۆژی جیهانیی شانۆ بۆ ساڵی 2002

و. ئازاد بەرزنجی

*لە ساڵی 1961ەوە ڕۆژی جیهانیی شانۆ دیاریکرا، ئیدی لەو مێژووەوە ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی ڕۆژی شانۆوە بوە دابێک کە ساڵانە لە ڕۆژی 27ی مارتدا ئەنجام دەدرێ. لەم ڕۆژانەدا تەواوی دام و دەزگا شانۆییەکان لە جیهاندا چالاکیی شانۆیی وەکو نمایشی شانۆیی و کۆڕو کۆبوونەوەو پێشانگاو دیداری شانۆیی ڕێک دەخەن و لە سەرجەم وڵاتانی دونیادا جەماوەری شانۆیی ڕوویان تێ دەکەن.*

*یەکێک لە چالاکیەکانی ئەم ئاهەنگە بڵاوکردنەوەی نامەی ساڵانەی شانۆیە؛ کە وتەیەکە دەستەی جیهانیی شانۆ هەر ساڵەو شانۆکارێکی باڵا لە جیهاندا ڕادەسپێرێ تا بینووسێت و پاشان بە جیهاندا بڵاوی دەکاتەوە؛ بە مەبەستی ئەوەی داهێنەرانی شانۆ زیاتر بە یەک ئاشنا بکات و بە ئەزموونەکانی گەلانیان بناسێنێ.*

*ئەمساڵ شانۆکاری هیندستانی (جیریش کارناد) نامەی ساڵانەی شانۆی نووسی و ئەمەش دەقی وتەکەیە:*

یەکێک لە کۆنترین دەقەکان لە جیهاندا سەبارەت بە شانۆ دەقی درێژی "ناتیساسترا"یە کە دەگەڕێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ بەر لە زایین و بەشی یەکەمیشی بەسەرهاتی لەدایکبوونی دراما دەگێڕێتەوە.

ئەم ئەفسانەیە دەڵێت جیهان نوقمی سێلاوێك لە دارمانی ئاکاری بوو، خەڵکەکە وایان لێهات بوون بە کۆیلەی ئارەزوە ساتەوەختییە نائەقڵانیەکانیان. بۆیە گەڕان بە دوای ڕێگایەکدا کە (چاوی بینەران گەش بکاتەوەو گوێیان ڕوون بکاتەوەو، لە هەمان کاتیشدا ئاکاریان ڕێنومایی بکات) بوە کارێکی پێویست؛ تا ئاستی خەڵك باڵاتر بکات. هەر بۆیە "براهما"ی خواوەند هەندێ توخمی لە کتێبەکانی "ڤیداس" (چوار دەقە پیرۆزەکە) وەرگرت و ئاوێتەی یەکتری کردن تا کتێبی پێنجەمیان لێ دابنێت کە کتێبی نمایشە، بۆ ڕامکردنی دراماش ئەم کتێبی پێنجەمە گوازرایەوە بۆ "بهارتا"، ئادەمیزاد. ئینجا بهارتا بە کۆمەکی سەد کوڕەکەی و هەندێ سەمازان؛ کە براهما لە ئاسمانەوە ناردبوونی، یەکەم نمایشی شانۆیی سازداو، خواوەندەکانیش بە کەفوکوڵەوە پشتگیریی وزەی دەربڕینی ئەم هونەرە تازەیەیان کرد.

بابەتی ئەو شانۆنامەیەی کە بهارتا نمایشی کرد سەبارەت بە مێژووی ململانێی نێوان خواوەندەکان و شەیتانەکان بوو، هەروەها دەربارەی ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی ئەو سەرکەوتنەوە. کە لەم ململانێیەدا خواوەندەکان بەدەستیان هێنا، ئیدی ئەم نمایشە بوە مایەی شادیی خواوەندەکان و مرۆڤ. بەڵام شەیتانە بینەرەکان نمایشەکەیان زۆر پێ ناخۆش بوو، هەربۆیە هێزە سیحرییەکانی خۆیان بەکارهێنا تا نمایشەکە تێک بدەن، بەوەی کە هەوڵبدەن توخمەکان و دیالۆگ و جووڵەو یادی ئەکتەرەکان دوچاری ئیفلیجی بکەن، بەڵام خواوەندەکان لە ئاست ئەم کارەدا بێدەنگ نەبوون، بۆیە هێرشیان کردە سەر ئەو شەیتانانەو زۆریان لێ کوشتن.

ئەمە بوە هۆی ئاژاوەیەکی گەورە، هەر بۆیە براهمای داهێنەر لە شەیتانەکان نزیک بۆوەو قسەی لەگەڵ کردن. پێی وتن: دراما حاڵەتی هەرسێ جیهانەکە بەرجەستە دەکات و ئامانجە ئەخلاقیەکانی ژیان لەناو خۆیدا کۆدەکاتەوە بە لایەنە ڕوحی و دونیایی و هەستیەکانیانەوە- و خۆشی و ناخۆشیەکانی ژیان دەگرێتە خۆی. هیچ حیکمەت و هونەرو عاتیفەیەکیش نییە لە درامادا نەبێت.

پاشان داوای لە بهارتا کرد نمایشە شانۆییەکە پێشکەش بکاتەوە. ناشزانین ئاخۆ ئەو نمایشە سەرکەوتوو بوە یان شکستی هێناوە، بەڵام ئەو توێژەرەوانەی لەسەر ئەم بەشەی دەقەکە قسەیان کردوە دەڵێن کە ئەو ئەفسانەیە ئیدانەکردنی شەیتانەکانە، چونکە ڕەفتاریان بەڵگەی ئەوە بوە کە لە سروشتی ڕاستەقینەی شانۆ نەگەیشتوون و وتارەکەی براهماش لەسەر شانۆ بوە بە کرۆکی ئەم ئەفسانەیە.

بە لای منەوە ئەوە تێگەیشتنێکی دروست نیە بۆ ئەفسانەکە، لەبەر ئەوەی لە بنەڕەتدا: پەنانەبردنی شەیتانەکان بۆ توندوتیژیی جەستەیی و بە تەنها هێرشیان بۆ سەر "دیالۆگ و جووڵەو یاد" لای ئەکتەرەکان؛ لە نمایشە شانۆییەکەدا، ئەوە دەخاتەڕوو کە ئەو بوونەوەرانە تێگەیشتنێکی وردیان بۆ گرنگترین جومگەکانی نمایشی شانۆیی هەبوە.

سەرباری ئەوەش، ئێمە لە بەردەم دەقێکی پیرۆزداین؛ بۆ ئەوە نووسراوە تا فێری هونەری بەرهەمهێنانی نمایشی شانۆو تەکنیکەکەیمان بکات، هەروەها دەربارەی یەکەم نمایشی شانۆیی بۆمان دەدوێت کە مێژووی مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینیویەتی. براهمای داهێنەر خۆی لەو پرۆژەیەدا شارەزا بوە، بە هاریکاری هەندێ خواوەندی ترو هەندێ پەریی ئاسمان و، چەند ئەکتەرێکی مەشق دیو. کەواتە هەر دەبێ سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنابێت، بەڵام لە بری سەرکەوتن کارەساتی لێ کەوتەوە.

لێرەدا شتێکی پەنهان هەیە کە توێژەرەوەکان خۆیان لە قەرەی نەداوە، بەڵکو لەوانەیە شپرزەشی کردبن، بێگومان ئەو ناوەڕۆکانەش لە ئێستاتیکای نوێی هیندیدا دەرکەوتن کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مەبەستی سەرەکی شانۆ دابڕکردنی جەماوەرەکەیەتی لە دونیای دەرەوەو نوقمکردنی لە حاڵەتێکی شادیی هاوبەشدا.

من پێم وایە کە ئەم ئەفسانەیە ئاماژە بۆ خەسڵەتێکی بنەڕەتیی شانۆ دەکاتەوە، کە دەشێ

ســـــەرنجە هیۆرکـــــەرەوەکانی براهمـــــا جیـــــای نەکردبێتــەوە، ئــەویش ئەوەیــە کــە هــەر نمایشــێکی شانۆیی- چەند تۆکمەو پڕ داهێنانیش بێت- لەناو خۆیــدا مەترســیی شکســتی خۆیشــی هــەڵگرتوە، هــەروەها لێکپچــڕان و توندوتیژیشــی لــەخۆ گرتــوە. لانــی کــەم ئــەوەی کــە نمایشــی شــانۆیی زینــدو پێویســتی پێیــەتی: ئــەدائی مرۆیــی (مەبەســتم لــە چوونــە نــاو کەســێتییەکی ترەوەیــە) و کەســێك کــە تەماشای بکات. ئەمەش حاڵەتێکە پڕە لە نایەقین.

هیچ کاتێ جیهان وەکو ئێستا کاری درامایی بە خۆیەوە نەدیوە، ڕادیۆو تەلەفزیۆن و سینەماو ڤیدیۆ لــە درامــادا نوقممــان دەکــەن. لــە کاتێکیشــدا کــە ئــەم شــێوە دراماییانــە دەتوانــن بینــەران بــەلای خۆیــاندا ڕاکێشــن و بیــان وروژێنــن، بــەڵام نــاتوانن هەڵوێســتی بینــەر بەرامبــەر کــارە هونەرییەکــە خــۆی بگــۆڕن. ئەفسانەی یەکەم نمایش، ئەوە دەردەخات کە شانۆ بریتیە لە بەردەوامی، بەڵکو حاڵەتێك لە بەردەوامی کـــــە هەمیشـــــە نـــــــەگۆڕەو توانــــــــای تەقاندنەوەشی لێرەدایە.

هەر ئەمەش هۆی ئەوەیە کە کاتێ شانۆ ویستی بە دوای سەلامەتیدا بگەڕێ؛ مانای وایە بەڵگەنامەی مــەرگی خــۆی مۆردەکــات: هــەر بۆیــە ئــایندەی شــانۆ گەرچی بە شێوەیەکی گشتی ڕوو لە تاریکیش بێتە بــەرچاو، بــەڵام هــەر بــە زیندوویــی دەمێنێتــەوەو هەمیشە توانای وروژاندنی دەبێت.

## جیریش کارناد- هیندستان

*لە ساڵی *1938* لە ماتیران (هیندستان) لە دایکبوەو لە هیندستان و لە ئۆکسفۆرد خوێندوویەتی.

*حــەوت ســاڵ لــە چاپخانــەی ئۆکســفۆرد لــە هیندستان کاری کردوەو، پاشان خۆی بۆ نووسین و سینەما تەرخان کردوە.

*لــە ســاڵانی *1974* و *1975*دا بــوە بــە بەڕێوەبــەری پــــەیمانگای ســــینەماو تەلــــەفزیۆن و، ئێســــتاش بەڕێوەبەری سەنتەری نەهرۆیە لە لەندەن.

*شــــانۆنامەکانی بــــە زمــــانی "زکانــــاداس" دەنووسێت کە زێدێتی و بۆ ئینگلیزی تەرجەمەیان دەکات. بە دوەم شانۆنامەی "توجلاق" (*1966*)، لە هیندستاندا زۆر بەناوبانگی کرد.

*لە نێوان ساڵانی *1987* و *1988*دا مامۆستا بوە لە زانکۆی شیکاگۆ.

*سەرۆکی هیندستان میدالیای (بادما بۆشان)ی پێ بەخشیوە.

*لــە ســاڵی *1999*دا خــەڵاتی بــهارتا جنــانبیث ی وەرگرتوە، کە بەرزترین خەڵاتی ئەدەبیە لە هیندستان.

*لــە بــواری ســینەمادا، جــیریش هــەندێ فیلمــی ســینەمایی و خــەڵاتی نیشــتمانی و نێودەوڵــەتیی وەرگرتــوەو لەگــەڵ ســینەماکارە بەناوبانگــەکانی وڵاتەکەیدا کاری کردوە.

## سەرچاوە

(البيان الثقافي)- العدد *116*- الأحد *31* مارس *2002*

## سەلمان ڕوشدی

# ڕۆژنامەکانی بەریتانیا ئومێدبڕ بون، چونکە نەکوژرام

نووسەری بەریتانی سەلمان ڕوشدی زمانی هێرشبردنی لە ڕۆژنامەکانی بەریتانیا خستە کار. گوایا هەندێك لە ڕەخنەگرانی ئەدەب لەوە ئومێدبڕ بوون کە ئەو فتوایەی بۆ کوشتنی درابوو، تا ئێستا جێبەجێ نەکراوە. سەلمان ڕوشدیی ئەدیب، دوای ئەوەی ڕابەری ڕۆحی پێشوی ئێران ئایەتوڵڵا خومەینی لەسەر ڕۆمانی -ئایەتە شەیتانیەکان- فتوای کوشتنی دا، چونکە سوکایەتی بە ئیسلام دەکات تووشی مەترسی تیرۆر هات. ڕوشدی لە دیمانەیەك لەگەڵ هەفتەنامەیەکی ئەڵمانیدا وتی: *چەند ساڵێکە ڕۆژنامەکانی بەریتانیا هەوڵی ئەوە دەدەن وام پیشان بدەن کە کەسێکی نوشوست خواردووم*. هەر لەو دیمانەیەدا ڕوشدی وتی: *"دیدگای ڕۆژنامەی بەریتانی دروستکردنی ئامانج و پاشان لێدانیەتی. گومان لەوەدا نیە کە ئەو نوسەرانە هیوابڕ بوون لە نەکوژرانم، ئەوان ڕقیان لە منە، چونکە لەگەڵ ئەو فتوایەیشدا کە بۆ کوشتنم دەرکرا، من هەر دەژیم، ئەمڕۆ ژیانێکی چاك بەسەر دەبەم"*.

لەگەڵ ئەوەشدا کە لە چەند ساڵێك لەمەوبەرەوە فتواکە ڕەت کراوەتەوە، بەڵام هێشتا چەند گروپێکی



توندڕەوی ئێرانی بە تەمای پاکۆدانی ڕوشدین. شایانی باسە کە پارەیەکی بێشومار بۆ پاراستنی ڕوشدی خەرج دەکرێت، بەڵام بە پێی قسەی خۆی ئەو پارەیە زۆر نیەو بڕەکەی ناگاتە *11* ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی لە ساڵێکدا وەك پێشان باسکراوە. سەلمان ڕوشدی وتی: *"ئەو بڕە پارەیە زۆر لەوە کەمترە، بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە بەریتانیادا خۆم شاردبووەوە باجی دەرامەتم داوە، ئەگەر بەراوردی ئەو پارەیە بکەی کە داومە بەو پارەیەی بۆ پاراستنم لێیان سەندوم ئەوا ئینگلتەرا قازانجیەتی"*.

ناوی سەلمان ڕوشدی لەم دواییەدا کەوتەوە ناو ناوانەوە کاتێك کە کۆمپانیای هەوایی "ئێرکندا" بە بیانووی باری ئەمنیەوە ڕێگای لە ڕوشدی گرت سواری یەکێك لە فڕۆکە سەفەریەکانی ببێت. کۆمپانیاکە پاساوەکەی ئەوە بوو کە ترسی ئەوەی هەیە ئەو بێنەو بەردە ئەمنیەی بۆ ڕوشدی دەکرێت ببێتە هۆی دواکەوتنی هەستانی فڕۆکەکەو سەرنشینەکانی تووشی سەرئێشەو دواخستن بکات. بەڵام لە دواییدا کۆمپانیاکە لەو هەڵوێستەی پەشیمان بوەوە.

لە "یدیعوت احر و نوت"ی چاپی عەرەبییەوە.



repin

# میتۆدە مێژوویەکەی مارکس و چەمکە سۆسیۆلۆژیەکان

تۆم بۆتۆمۆر

وەرگێڕانی: بڕوا عەلادین



لە پێشەکیەکەشیدا بۆ چاپی دوەمی کتێبی (سەرمایە) داوا لە خوێنەر دەکات پێشەکی کتێبەکەی ((بەشداریەك لە ڕەخنەی ئابووری سیاسیدا)) بخوێنێتەوە کە تیایدا بە تەواوەتی مەبەستی خۆی بەرامبەر ماتەریالیزم روون کردۆتەوە. لێکۆڵینەوەش لەو پێشەکیە- کە کارە تیۆریەکەی مارکس کورت دەکاتەوە بۆ چەند گریمانەیەکی کەم، ئەوکارەی بەر لە *15* ساڵ لە دەستنوسەکانی بروکسل‌و پاریسدا ئەنجامی داو تەواوی کرد-ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئەو گوزارشتی "مادی" بەکار هێناوە تاوەکو مەرجە سەرەکی‌و سەرەتاییەکانی بوونی مرۆڤمان نیشان بدات‌و نمایشی بکات. ئەو دەربڕینانەش کە بەکاری هێناون بریتین لە: (ژیانی مادی)، (مەرجە مادیەکانی ژیان)، (هێزە مادیە بەرهەمهێنەرەکان)، (شێوە بەرهەمهێنانی ژیانی مادی)، (گۆڕانی مادیانەی مەرجە ئابوریەکانی بەرهەمهێنان)...تا دوایی. وەکو پێشتریش وتمان مارکس بە پلەی یەکەم زانایەکی تازەی مێژوە، یەکەم بایەخیشی بریتیە لە گۆڕانی مێژوویی. ئەو بیرۆکەی خوڵقاندنی خودگەریانەی

زۆرجار بە میتۆدەکەی مارکس دەگوترێ (ماتەریالیزمی مێژوویی)[1]. ئەم گوزارشتە سەر لێ شێوێنەرە، چونکە مەبەستێکی فەلسەفی دەداتە پاڵ مارکس کە خۆی نەیبوە. مارکس نە بایەخی بە مەسەلە ئەنتۆلۆژیەکانی پەیوەندی نێوان فیکرو بوون داوە، نە بە مەسەلەکانی تیۆری مەعریفە. ئەو زۆر بە توندی ئەو فەلسەفە تێڕامانئامێزانەی (التاملیة) ڕەتکردەوە کە دەیانەوێت زانستێکی میتافیزیکی لە بوارێکی تازەی بوارەکانی مەعریفەدا بونیات بنێن[2]. مارکس زۆر بە سادەیی باسی بنەمای ماتەریاڵی میتۆدەکەی خۆی بۆ لێکۆڵینەوە کردوە.

مرۆڤی لە هیگڵەوە وەرگرت، بەڵام بە پێچەوانەی هیگڵەوە ئەم خولقاندنە خودگەریە وەك پەرەسەندنێکی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنێت کە پشتی بەباڵادەستی مرۆڤ بەسەر سروشتدا بەستوە. ئەو لە راپۆرتەکەیدا دەربارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەر ئاماژەیەك بۆ هێز یا نێوەندی چواردەوری ئەو کەسانە بەدوور دەزانێ کە دەژینو لە کۆمەڵگەدا کار دەکەن. لەبەرئەم هۆیە زۆر هەڵەیە وەکو فەیلەسوفی مێژوو لە مارکس بڕوانین، چونکە ئەو بایەخی بە نوسینی راپۆرتێکی زانستی دەدا سەبارەت بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی، رەخنەشی لە هیگڵو هیگڵیستە لاوەکان ئەوە بوو کە ئەمانە فەیلەسوفی مێژوونو مێژوونوس نین. ئەگەر دەشڵێن مارکس فەیلەسوفی مێژوە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی راستکردنەوەی زانستیو ئاکاری تێکەڵاو کردوە لە زانستەکەیدا، بەڵام ئەمە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنێکی هەڵە لە چەمکە مێژووییەکەی کە بە هۆی حەماسەتی لایەنگرە هەڵەکانیەوە بڵاوبۆوە. مارکس خۆی لە دیکۆمێنتێکدا وەڵامی رەخنەیەك دەداتەوە کە یەکێکە لە رۆشنترین پەرەگرافەکانی بۆ چەمکە تایبەتیەکەی سەبارەت بە چەمکە مێژووییەکەی[3] :

((دەبوایە دەستنووسەکەم سەبارەت بە ئسوڵەکانی کەپیتالیزم لە ئەوروپای خۆرئاوادا بگۆڕێت بۆ تیۆرەیەکی فەلسەفی-مێژوویی سەبارەت بە بزوتنەوەیەکی جیهانی کە بێگومان لە نێو خەڵکیدا هەیە، بێئەوەی گوێ بەو بارودۆخە مێژووییە بدات کە لە رێگەیەوە سیستەمێکی ئابوری دەستنیشان دەکات، کە زۆرینەی زۆری کاری کۆمەڵایەتی جگە لە مەحاڵبوونی پەرەسەندنێکی هاوسەنگی مرۆڤایەتی هیچی دیکە ناگەیەنێت. بەڵام دەبێت من رێگەی لێبگرم. ئەو زۆر شەرەفمەندانە مامەڵەی لەگەڵدا کردم، بەڵام لەهەمانکاتدا رقی لێم بوو. با نمونەیەك بهێنینەوە. لە کتێبی سەرمایەداو لە چەندین بۆنەی دیکەدا ئاماژەم بەو چارەنوسە دا کە زۆرینەی خەڵکی لە رۆمای کۆندا هەیانبوو. ئەوان لە بنەڕەتەوە جوتیاری ئازادبوونو زەوی تایبەتیی خۆیان دەکێڵا، بەڵام لە کۆتایی مێژووی رۆمانیدا بوون بە کەسانێك کە خاوەنی هیچ نەبوونو هیچ موڵکێکیان نەبوو. هەمان ئەو پەرەسەندنەی کە لە ئامرازو ماتەریاڵە بەرهەمهێنەرەکانیانی دابڕین، یارمەتیدەر بوو بۆ گەشەکردنی موڵکیەتی زەویو زارە گەورەکانو سەرمایەی سامانی گەورە. بەو شێوەیەش لەهەمانکاتدا یەکەمجار کۆمەڵێك خەڵکی ئازادمان هەیە کە جگە لە هێزی کاری خۆیان هیچی دیکەیان نیە، دوەم جاریش خاوەن سەروەتو سامانەکانن کە ئامادەن کاری ئەوانە بقۆزنەوەو بیان چەوسێننەوە. بەڵام ئایا چی رووی دا؟ پرۆلیتارە رۆمانیەکان جوتیاری کرێگرتە نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێك ئاژاوەچی پیس، لە سپی پێستە چەوساوەکانی وڵاتەکانی باشوری ئەمریکا چەوساوەتر بوون. وەك چۆن لە پاڵیاندا سیستەمێکی بەرهەمهێنان سەری هەڵدا کە سەرمایەداری نەبو، بەڵکو لەسەر بنەمای کۆیلەێتی راگیر ببوو. بەو شێوەیەش دەبینین کە رووداوی مانگرتنە هاوشێوەکان، بەڵام لە پێکهاتەی مێژوویی جیاجیادا، کۆمەڵێك ئەنجامی جیاوازی داینێ. بۆ تێگەیشتنیش لەم دیاردەیە دەتوانین لە رێی هەریەك لەو پەرەسەندنانەوە کەشفی بکەین، بەڵام ئەگەر

تەواوی متمانەی خۆمان بە تیۆرەیەکی فەلسەفی- مێژوویی بەخشی کە خاسیەتە سەرەکیەکەی بریتیە لەوەی چۆتە سەرووی مێژووەوە، ئەوا لەم کارەدا سەرکەوتوو نابین))[3].

چەمکەکەی مارکس بۆ زانستی مێژوو زۆر تازە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە زۆر ڕەگەزیدا قەرزاری (سان سیمۆن) بوو، بە ڕادەیەکی کەمتریش قەرزاری ئەو نوسەرانە بوو کە لە مێژووی (کۆمەڵگەی مەدەنی)یان کۆڵیبوۆوە. هەروەها مارکس باوەڕی وابوو کە دەبێت بابەتی زانستی مێژوو زۆر فراوانتر بێت لە بابەتە باوەکان. بە تایبەتی لە نێو مێژونوسەکانی ئەڵمانیادا کە دەبێت کەش وهەوای ئایین، سیاسەت، ئەدەب و هونەریش بگرێتەوە. هەروەها بە بڕوای ئەو دەبێت پیشەسازی کە چالاکی کردەگییانەی مرۆڤە لە هەموو لایەنێکەوە ئامانجی سەرەکی لێکۆڵینەوە بێت لە سایکۆلۆژیا[4] و مێژوو، هەردووکیشیان بەشێك بن لە زانستێکی فراوانترو سەراپاگیرتر کە بایەخ بە سروشت و مرۆڤ بدات. بە پێی ئەم تێڕوانینەش دەکرێت بە زانستی مێژووی مارکس بڵێین سۆسیۆلۆژیای مێژوو. بایەخدانی ئەو بە تێپەڕاندنی سنووری تایبەتی هۆکارە مێژووییەکان کەمتر بوو لە بایەخدانی بە ڕستێك وتەزا بۆ شیکارکردنی سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان، بەو پێیەی کە هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بەردەوام لە گۆڕاندایەو دەگۆڕێت. مارکس ئامانجە سەرەکیەکانی ئەم سۆسیۆلۆژیایەی لە پێشەکی *1895* دا پوختکردەوە، کە وەك پێشتر وتمان ئەو ناوەرۆکانەمان بۆ پوخت دەکاتەوە کە مارکس لە دەستنوسەکانی سەرەتایدا پێیان گەیشتوەو هێشتا چاپ نەکراون، ئەو ئامانجانەش بریتین لە:

*1*-بونیادی ئابووری کۆمەڵگە.

*2*-سەرخانی ئایدیۆلۆژی.

*3*-شۆڕشی کۆمەڵایەتی.

*4*-پاشەڕۆژی کۆمەڵگە.

لێرەدا مەبەستمان گفتوگۆکردنێکی گشتی نیە دەربارەی ئەو ئامانجانە یاخود ئەو چەمکە جیاوازانەی مارکس لە چارەسەرکردنیدا بەکاری هێناون، بەڵکو بایەخی سەرەکیمان بریتیە لە کەشفکردنی ئەو ڕەگەزە تایبەتیانەی مارکس بۆ تیۆرەی کۆمەڵایەتی زیاد کردوە. ئەوەی مارکس لە بارەی بونیادی ئابووری کۆمەڵگەوە بەدی هێنا شتێکی تازەو سەیر نیە: چونکە ئەو کەسێك بوو لە نێوان مێژونوس و ئابوریناسەکاندا، وەك لە کاتی گفتوگۆکردن دەربارەی کەسانی پێش مارکسدا بینیمان. بەشداریە تایبەتیەکەی مارکس لەم بوارەدا بوو، لەو ڕەوتەدا کە گفتوگۆی لە بارەی بونیادی ئابوریەوە دەکرد، لە ڕەوتی پەرەسەندنی مێژوویيانەی کاری مرۆڤ وەك یەکەمین پەیوەندی نێوان مرۆڤ و سروشت، هەروەها هەوڵدانی بۆ پۆلێنکردنی مرۆڤایەتی لەبەر ڕۆشنایی سیستەمە ئابوریەکانیدا.

بەشداریە مەزنەکەی مارکس بریتیە لە شیکردنەوەکەی بۆ سەرخانی ئایدیۆلۆژی و پەیوەندی ئەم سەرخانە بەو شتەوە کە ناوی نابوو (بنەما ڕاستەقینەکانی) کۆمەڵگە، کە ئەویش خۆی بریتیە لە سیستەمی بەرهەمهێنان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە بەیەکداچوەکان. پێداگرتنی ئەو لەسەر

ئەوەی کە (ئەوەی بوونی خەڵکی دەستنیشان دەکات هۆشیاریان نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوە بوونی کۆمەڵایەتیانە کە هۆشیارییان دەستنیشان دەکات) گریمانەیەکی فەلسەفی (ئەبستمۆلۆژی) نیە، بەڵکو راپۆرتێکە دەربارەی بنچینەی بونیادە ئایدیۆلۆژی، یاسایی، سیاسی، ئایینی، هونەریو فەلسەفیەکان. بە رای مارکس ئەم (فۆرمە ئایدیۆلۆژیانە) سەرچاوەی هەڵەی توێژینەوەی زانستین، ئەو کاتەی سەیری شتەکان لە خۆیاندا دەکات بێئەوەی هیچ بایەخێك بدات بەو پەیوەندیە بەیەکداچوانەی لە ئاکامی قۆناغێکی دیاریکراو لە پەرەسەندنی ئابوریو بەرهەمهێنانی هەمەڕەنگی کلتوریەوە سەر هەڵدەدەن. بە رای ئەو ئەم جۆرە پەیوەندیە بەیەکداچوانە، لە نێوان سیستەمەکانی بەرهەمهێنان، بونیادی چینایەتیو نێوانی ڕێگەی بیرکردنەوەو داهێنانی ئەدەبیدا، لە زۆر حاڵەتدا بێ هیچ کێشەیەك پێکدێت.

لە ڕاستیدا مارکس یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی سۆسیۆلۆژیای مەعریفە، کە بە ڕای ئەو تیۆرەیەکی رەخنەیی بوەو ئامانجی زەمینەسازکردن بوە بۆ دامەزراندنی سۆسیۆلۆژیایەکی توندو پتەو. ئەوانەشی کە لە هەمان بواردا بە دوای مارکسدا هاتن، زۆر باسی سۆسیۆلۆژیای مەعریفەیان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك ئیشی گرنگیان پێشکەشی مێژووی فیکر کرد بە تایبەتی فیکری سیاسی.

بەڵام ئامانجی سێهەم، واتە ئامانجی شۆڕشی کۆمەڵایەتی، زۆربەی سۆسیۆلۆژیستەکان فەرامۆشیان کرد. لە پاشتریشدا گۆڕانی کۆمەڵایەتی (کە ئەوەش بۆ خۆی مایەی سەرسوڕمانە) بایەخێکی کەمی پێدراوە. سۆسیۆلۆژیستەکان تازە بەتازە خەریکی لێکۆڵینەوەن لە تەنها سیمایەکی تایبەتی ئەم مەسەلەیە، ئەویش بریتیە لە پرۆسەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەو وڵاتە دواکەوتوانەدا کە کەوتونەتە ژێر کاریگەری تەکنیکی خۆرئاواوە. دیارە گرنگە ئەو کاتەی تێبینی ئەو کاریگەریە گەورانە دەکەین کە شۆڕش لە ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیە مرۆییەکاندا دەیکات، دەبینین هەر لە سەردەمی مارکسەوە هەرچی سۆسیۆلۆژیستێك هەیە بە جیدی بیری لە شیکردنەوەی بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکان نەکردۆتەوە یاخود هەوڵی نەداوە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریانەی شۆڕشەکان بکات. پێویستیشە بڵێین سۆسیۆلۆژیای شۆڕش دامەزرێنەرێکی گەورەتری هەیە کە مارکس خۆیەتی.

دواجار چوارهەمین ئامانجی شیکردنەوە سۆسیۆلۆژیەکەی مارکس بریتیە لە پاشەرۆژی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، کە لێرەدا مانای وایە سۆسیۆلۆژیاو فەلسەفەی کۆمەڵایەتی بەشداریان کردوە لە پێشکەشکردنی ڕێبازێکدا کە لەیەك کاتدا جەستەی مەعریفەی سیاسیو گۆچانی کاری سیاسیە.

### سەرچاوە


في سوسيولوجيا ماركس وفلسفته الاجتماعية، توم بوتومور-م.ربل.

ترجمة:محمد حافظ يعقوب. لاپەڕە(*48* بۆ *55*) .


### پەراوێزەکان

*1*- مارکس خۆی هەردوو تەعبیری (ماتەریلیزمی مێژوویی)و (ماتەریالیزمی دیالەکتیکی) بەکار نەهێناوە، بەڵکو

تەعبیری یەکەمیان هی ئێنگڵزەو تەعبیری دووهەمیان هی بلیخانۆفە.

2– ئەمە زۆر ئاشکرایە، بە تایبەتی لە (تێزەکان دەربارەی فیورباخ)دا.

(3)–وەڵامێکی چاپ نەکراوە بۆ نامەیەکی میخائیلۆفسکی، کە جەخت لەوە دەکاتەوە بەپێی ڕێبازە فەلسەفیەکەی مارکس روسیاش وەك هەر نەتەوەیەکی دیکە ناچارە بە قۆناغێك لە پەرەسەندنی سەرمایەداریدا تێبپەڕێت. بۆ بەراوورد کردن بڕوانە نیکۆلای (بە ناوی خوازراوی ن.دانیلسۆن)ەوە، مێژووی پەرەسەندنی ئابوریانەی روسیا لە ئازادکردنی کۆیلەکانەوە. پاریس *1902*

*3*– بۆ بەراوردکردن بڕوانە نامەکەی مارکس بۆ ئەتینکۆف (*28* ی کانونی یەکەمی *1846*) کە تیایدا مارکس رەخنەی لە برۆدۆن گرتوەو پاشتر لە کتێبی (هەژاری فەلسەفە) دا بڵاوبۆتەوە. مارکس هێرشی کردۆتە سەر برۆدۆن چونکە فەیلەسوفی مێژوە: (بە کورتی، ئەوە مۆدێلێکی کۆنە لە هیگڵیزم نەوەکو مێژوو. ئەوە شێوێنەری مێژووی مرۆڤ نیە، بەڵکو مێژوویەکی فیکری نمونەکانە. لە چەمکەکەشیدا "واتە برۆدۆن" مرۆڤ وەسیلەیە، لە کاتێکدا ئەوە بیرۆکە یا هۆی ناوەکیە کار بۆ پێشخستنی دەکات).

*4*– پیشەسازی (کتێبێکی کراوەیە بۆ چالاکیەکانی مرۆڤایەتی). (دەستنوسە ئابووریو فەلسەفیەکان)


Renoir-boating

# بە بۆنەی خولی حەفتاو چوارەمین ساڵەوە: چیرۆکی خەڵاتی ئۆسکار

و: سەردەم

لە ساڵی *1927*ەوە کە ئەکادیمیای هونەری سینەماو زانستەکانی دامەزرا (ئەوە مێژووی دەستپێکردنی فیلمی دەنگداریشە) ئەو لیژنەیەی کە سەرپەرشتی دەکردو لە گەورە بەرهەمهێن و ئەکتەرو دەرهێنەری ئەو سەردەمە پێکهاتبوون، بڕیاری خەڵاتێکی ساڵانەی دا، بۆ شیاوترین فیلم، دەرهێنەر، ئەکتەری ژن و پیاو، خەڵاتەکە بە ناوی "خەڵاتی شایانی ئەکادیمی"یەوە ناونرا، ئەو خەڵاتە ناودارە جیهانیەی کە بە "ئۆسکار" ناوزەد کرا. ساڵی *1928* فیلمی "ئاسمانی حەوتەم" دوو خەڵاتی بەرکەوت یەکێکیان بۆ جانیت غینر وەك چاکترین ئەکتەری ژن و دوەمیان بۆ فرانك بورزا وەك چاکترین دەرهێنەر. ئیمیل جینیز خەڵاتی چاکترین ئەکتەری پێ درا لە "داواداوا"داو چاکترین فیلمی ساڵی *1927*یش "باڵەکان" بوو.

**بۆ ناوی "ئۆسکار" بەم خەڵاتەوە نرا؟**

لەبەرئەوەی بەڵگەنامە یان سەرچاوەیەك لە بەردەستا نیە بە تەواوی و بنەبڕ ئەوەی ساغ کردبێتەوە کە هۆی ئەو ناولێنانە چی بوە، بەڵام ئەوانەی لە بواری سینەمای هۆلیودا کاردەکەن چیرۆکێك دەگێڕنەوە کە بوە بە سەرچاوەی سەرەکی بۆ هۆکاری ئەو ناولێنانە کە ئەمە پوختەکەیەتی:

مارگریت هیریك کە کارمەندی کتێبخانەی ئەکادیمیاکەو پاشان بوە بەڕێوەبەری، کاتێك کە پەیکەرەکەی بینی هاواری لێ هەستا: *"خودایا، ئەم پەیکەرە هەر لە "ئوسکار"ی مامم دەچێت"* ڕۆژنامەنووسێك کە گوێی لە قسەکەی مارگریت بوو ناوەکە سەرنجی ڕاکێشاو کەوتە بانگەشە بۆ کردن و بڵاوکردنەوەی.

خەڵاتی ئوسکار بریتییە لە پەیکەرێکی بچووکی کانزایی ڕووپۆش بە ئاڵتوون، درێژیەکەی سیانزە ئینج و نیوە، کێشی هەشت پاوەندو نیوە. سیدریك گیبون خاوەنی بیرۆکەکەو داهێنەریەتی. پەیکەرەکە بریتییە لە پیاوێکی شمشێر بە دەستی لە خاچ چوو کە بەسەر شریتی فیلمەوە ڕاوەستاوە.

لە سالانی بەراییدا، بەخشینی خەڵاتی ئۆسکار وەك ئێستا لە ئاهەنگی گەورەو گراندا بەڕێوە نەدەچوو، یەکەم ئاهەنگ بۆ بەخشینی ئەو خەڵاتە لە شێوەی خوانێکدا سازکرا لە ئوتیل روزفیلت هولیود لە شانزەی ئایار (مایو)ی ساڵی *1929*دا، ژمارەی ئامادەبوان *250* کەس و بلیتی چوونە ژوورەوە دە دۆلار بوو. لە دە ساڵی بەراییدا ئەنجامەکان پێشەکی دەدرانە ڕۆژنامەکان تا لە هەمان شەوی دابەشکردندا بلاوی بکەنەوە، بەرندەکانی خەڵاتەکە پێش وەرگرتنی دەیانزانی خەڵاتەکەیان پیێ دەدرێت، چونکە لە ساڵی *1941*ەوە ئەوە داهات کە بخرێتە ناو زەرفێکی مۆر کراوەوە. بەڵام شەڕی دوەمی جیهانی دۆخی ئاهەنگەکەی لە خوانی ناو ئوتێلێکەوە گۆڕی بۆ ئاهەنگی نێو هۆڵی سینەمایەك و لە هەوادا بڵاوکردنەوەی، لەکاتی شەڕەکەدا ڕاستەوخۆ هەواڵی ئاهەنگەکە لە ڕادیۆوەو بۆ دەرەوەی ئەمەریکا بڵاو دەکرایەوەو سەربازە ئەمریکیەکان گوێیان لیێ دەگرت، لە ساڵی *1961*دا بۆ یەکەمجار بەرنامەی ئاهەنگەکە لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە بە ڕەنگاوڕەنگی بڵاوکرایەوە. ئاهەنگی دابەشکردنی خەڵاتەکە تا ساڵی *1969* لە هۆلیودا دەکرا، پاشان ڕیێ و ڕەسمی ئاهەنگەکە لەناو هولیودەوە گوێزرایەوە بۆ "مەڵبەندی موسیقا" لە لوس ئەنجلس، لە ساڵی *1986*ەوە شوێنی ئاهەنگی خەڵاتدانەکە لە نێوان "مەڵبەندی موسیقا" و "هۆڵی شراین"دایە. بەڵام خولی حەفتاو چوارەمین، ئێوارەی یەك شەمو (*2002/2/24*) بە ڕووداوێکی گەورە دادەنرێت، چونکە ڕێوڕەسمی دابەشکردنی خەڵاتی ئوسکار لە ناوجەرگەی هولیود لانەی خەونەکاندا، لەسەر "شانۆی کوداك" بەڕێوە دەبرێت، چونکە لە حەفتا ساڵ زیاتری لەوەو بەرەوە هەر لەوێوە دەستی پێکرد. بەم بۆنەیەوە ئەکادیمیا داوای لە ئەلیکس ڕوسی هونەرمەند کرد کە پۆستەرێکی ڕەسمی بۆ خولی *74* ساڵەی خەڵاتی ئۆسکار دروست بکات. گەورە پسپۆڕەکانی بواری دیکۆرو ڕووناکی کەوتنە کار بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی نویێ و دەگمەن هۆڵەکە ڕێك بخەن. ئەو شانۆ تازەیە ساڵی *2001* کرایەوە کە نزیکەی *90* ملیۆن دۆلاری تێچوو. تازەترین ئامێری دەنگ و ڕوناکی و شانۆیی بۆ ئامادە کرا.

ڕەنگە خوێنەرێك بپرسێت کە فیلمێك چۆن دەپاڵێورێت بۆ ئەم خەڵاتە.؟ ئەوە بەسە کە هەر کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنەری فیلم داوای چوونە ناو کێبڕکێکە بکات. نزیکەی *24* بەش لەوێدا هەیە کە هەریەکەیان پسپۆڕی بابەتێکن، هەر بەشێك چەند ئەندامێکی پسپۆڕ سەرپەرشتی دەکات، بۆ نمونە ئەو دەرهێنەرانەی بۆ دەستنیشان کردنی ئەو فیلمانەی کە پێشکەشیان کراوە بۆ بە دەستهێنانی خەڵاتی چاکترین دەرهێنان، تەنیا فیلمی بێگانە، یان فیلمی کورت یانی فیلمی دیکۆمێنتی. ئەوانەی سەرپەرشتی ئەم کارانە دەکەن تێکەڵن لە چەند پسپۆڕیەك، بەڵام دەستنیشانکردنی چاکترین فیلم و ناوی بەرندەکان، بە دەنگدانی هەموو ئەندامانی ئەکادیمیا دەبێت کە دەنگیان داوەو نزیکەی *5700* کەس دەبن. ئەو فیلمانەی کە بەرندەی پێنج خەڵاتە سەرەکیەکە بن: چاکترین فیلم، دەرهێنان، ئەکتەری پیاو، ئەکتەری ژن و سیناریۆ. لە هەموو مێژووی هۆلیودا، تەنیا سیێ فیلم توانیویەتی بە جارێك سیێ خەڵات لەو پێنج خەڵاتە بباتەوە، ئەوانیش: "شەوێك لە شەوان *1934*" "فڕین بەسەر هێلانەی کوکوختیدا *1975*" و "بێدەنگی مەڕەکان *1991*" ئەو کەسایەتیش کە زیاتر لە هەر کەسێکی دی بۆ ئەو خەڵاتە دەستنیشان کراوە "میریل ستریب"ەو *12* جار پاڵێوراوە، والت دیزنیش لە هەموو کەس زیاتر ئەم خەڵاتەی بە دەست هێناوە کە *26* خەڵاتی ئوسکارە.

## سەرچاوە

لە تۆڕی ئینتەرنێتی (ئیلاف)ەوە